# سیاسەت و گەشەسەندن لە جیهانی سێهەمدا

**نووسینی**

**ئادریان لیفت ویك**

**وەرگێڕانی**

**مێهدی مێهرپەروەر**




**هەولێر - ٢٠٠٩**




دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **سیاسەت و گەشەسەندن لە جیهانی سێهەمدا**
- بابەت: سیاسەت
- نووسینی: ئادریان لیفت ویك
- وەرگێڕانی: مێهدی مێهرپەروەر
- نەخشەسازی ناوەوە: تەها حسین
- پیتچنین: کاوە حسین
- بەرگ: هۆگر سدیق
- ژمارەی سپاردن: ( ٥١٢)
- نرخ: (٣٠٠٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠٠٩
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی کتێب (٣٥٩)



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com



# پێڕست

## پێشەکی:

ئایا ئێمە دەتوانین بەشێك بین لە وڵاتانی پەرەگرتوو؟ ڕێگاکانی گەیشتن بە گەشەسەندن کامانەن؟ ئایا ئەو ڕەوت و شێوازانەی کە وڵاتانی گەشەکردووی ئەمڕۆ توانیویانە دەستیان بە گەشەسەندن ڕابگا، نموونەیەکی تەواو و لەبارە بۆ وڵاتانی جیهانی سێهەم لە پێناو گەیشتن بە گەشەسەندن؟ ئایا پێکهاتەکان و فەرهەنگەکانی کۆمەڵگای جیهانی سێهەم، توانایی بەکارهێنانی نموونەی گەشەی ڕۆژئاواییان بۆ گەیشتن بە گەشەسەندن هەیە؟

پرسیارگەلی لەم چەشنە گرینگترین پرسیارێکن کە لە سەردەمی دابەشکردنی جیهان بە دوو بەشی گەشەکردوو و گەشەنەکردوو، لە زەینی زۆربەی خەڵك بەتایبەت بیرمەندان و زانایانی سیاسی و لێکۆڵینەوەی گەشەسەندن لە جیهانی سێهەمدا شکڵی گرتووە و هەر کامەیان چەندین گەڵاڵە و تیۆری جۆراوجۆر کە زۆربەیان لە دەستکەوتەکانی ڕۆژئاوا وەرگیراون، بۆ دەستڕاگەیشتن بە گەشەسەندن و گەیشتن بە ڕۆژئاوا، پێشکەش کردووە. ئەم مەسەلەیە گرینگیی تایبەت بەخۆی هەیە، چونکە لەلایەك، بەداخەوە لێکۆڵینەوەی ئاکادیمیك لە بواری گەشەسەندن لە ئاستی نوخبە زانستییەکانی وڵاتانی جیهانی سێهەم لە چوارچێوەی کۆلێژەکان یان لێکۆڵینەوەی زانستی- بێجگە لە چەند لێکۆڵینەوەیەك نەبێ- بەڕێوە نەچووە، لەلایەکی دیکەوە خوێندنەوەی بەربڵاو لە بواری دەستڕاگەیشتن بە گەشەسەندن لە وڵاتانی جیهانی سێهەم لەلایەن بیرمەندانی ڕۆژئاوایی لەبەر ئەوەی بەبێ ناسینی تەواوی تایبەتمەندییەکانی پێکهاتەی سیاسی، فەرهەنگی و کۆمەڵناسی ئەم کۆمەڵگایە بەڕێوە چووە نە تەنیا نەبووەتە هۆی گەشەسەندن، بەڵکو لەبەر بەفیڕۆدانی دەرەتانەکان، بووەتە هۆی چوونە سەری نارەزایەتییە کۆمەڵایەتییەکان، بڵاوبوونەوەی هەژاری و دواکەوتوویی ئابووری و ناسەقامگیریی سیاسی و لە ئاکامدا نفووزی بێگانەکان.

سەرەڕای ئەو بابەتانەی باسکران، ئەوەی کە ئەم کتێبە لە زۆربەی لێکۆڵینەوە و تیۆرییە ڕۆژئاواییەکان بە مەبەستی دەستڕاگەیشتنی وڵاتانی جیهانی سێهەم بە گەشەسەندن جیا دەکاتەوە، ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ڕوانگەی باو لە ڕۆژئاوایە کە پێیان وایە تەنیا ڕێگا بۆ



گەشەی وڵاتانی جیهانی سێهەم، پێکهێنانی حکوومەتی دڵخوازی دیموکراتیك و سەقامگیرکردنی دیموکراسییە.

بەهەرەسهێنانی جەمسەری ڕۆژهەڵات، ئەم بابەتە کە دیموکراسی نە تەنیا یەکێك لە پێش مەرجەکانی گەشەسەندنە، بەڵکو پێویستی دەستڕاگەیشتن بە ئەویشە، لە ناوەندی بیرۆکەی ڕۆژئاوادا جێی گرت. بەدرێژایی ئەم ساڵانەی دوایی یەکێك لە بابەتە سەرەکی و ئاساییەکان لە داڕشتنی سیاسەتی وڵاتانی ڕۆژئاوایی و ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان لەوانە بانکی جیهانی لە پێوەندی لەگەڵ وڵاتانی گەشەنەکردوو، پەرەپێدانی دیموکراسی بووە. ئەم مەسەلەیە دەتوانێ وەك پێشمەرجێك بۆ بەخشینی قەرز لەلایەن ئەم دامەزراوانە و وڵاتانی ڕۆژئاوایی بە وڵاتانی داواکاری قەرز بە بەڕێوەبردنی چاکسازی سیاسی، بایەخدانی زیاتر بە ڕەوشی مافی مرۆڤ و هەنگاونان بەرەو دیموکراتیزەکردن کە بە گشتی وەك پێش مەرجی دروست بوونی حکوومەتی دڵخواز پێناسە دەکرێ، سەیر بکەین.

هەر لەم پێوەندییەدا زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێهەم بەبێ لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی تایبەتی زاڵ بەسەر کۆمەڵگای خۆیان، بەهۆی زۆر کێشە کە لەگەڵی بەرەو ڕوون، ناچار بە قەبووڵکردن و گرتنە پێشی سیاسەتی دڵخوازی ڕۆژئاوا دەبن و بەداخەوە زۆربەیان نە تەنیا لەم بوارەدا سەرکەوتنیان بەدەست نەهێناوە، بەڵکو بوونەتە هۆی دواکەوتوویی لەڕادەبەدەری ئابووری و قەیرانی ماڵی.

لفت ویك مامۆستای زانکۆی یورکی بەریتانی بە ڕوانینێکی پۆزیتیویستی و بە خوێندنەوەیەکی هەمەلایەنە لە پێوەندی لەگەڵ وڵاتانی جیهانی سێهەم، ئاماژەی بە زۆر نموونە لەم وڵاتانە کردووە کە پێیان وایە ڕێگای گەیشتن بە گەشەسەندن کەڵك وەرگرتن لە نموونە ڕۆژئاواییەکانە، بەڵام بەزۆر هۆ ئاکامەکەی پێچەوانە بووە. ناوبراو لەلایەکی دیکەوە سەرەڕای ڕێزلێنان لە تیۆرییە ڕۆژئاواییەکان و بایەخە دیموکراتیکەکان و تایبەتمەندییەکانی حکوومەتی دڵخواز، تێکۆشانی دەوڵەتەکان و ڕێکخراوە گەورەکانی ڕۆژئاوایی لە سەپاندنی ئەم تیۆرییانە بەسەر وڵاتانی جیهانی سێهەم بۆ دەستڕاگەیشتن بە گەشەسەندن دەداتە بەر ڕەخنە. لەم پێوەندییەدا لفت ویك بە ئاماژە کردن بە دوو گرووپ لە وڵاتانی گەشەکردوو و دواکەوتوو ئەم پرسیارە دێنێتە بەر باس کە بۆچی هەندێك لە وڵاتان بە دیموکراتیك و نادیموکراتیکەوە دەکەونە گرووپی یەکەم و گرووپی دووەم هەروا لە هەژاری و دواکەوتوویدا دەمێنێتەوە. ناوبراو تەواوی هەوڵی خۆی لە دۆزینەوەی وەڵام و ڕێگاچارەیەکی گشتی بۆ پرسیاری سەرەکی خۆی خستۆتەگەڕ.





بەگشتی لفت ویك، چاوەڕوانی و هیوا بە دروست بوونی حکوومەتی دڵخوازی دیموکراتیك لە وڵاتانی جیهانی سێهەم وەك دوایین ڕێگاچارە، بە شتێکی کاڵ و بێ بنەما دەزانێ. چونکە ناوبراو پێی وایە چۆن بۆ سەرهەڵدانی دیموکراسی پێویستی بە پێکهاتەیەك لە هۆکارەکان و پێش مەرجەکان هەیە، سەقامگیری دیموکراتیش پێویستی بە تایبەتمەندی و بارودۆخی تایبەتی هەیە کە زۆربەی وڵاتانی جیهان سێهەم لێی بێبەرین. ناوبراو بەو ئاکامە دەگا کە ئەگەر گەشەسەندنێك لەم وڵاتانە ڕووبدا ڕەنگە لەژێر سیستەمێکی تایبەتی سیاسی گونجاو لەگەڵ ئەم وڵاتانە پێك هاتبێ کە لەگەڵ حکوومەتی دڵخوازی دیموکراتیك بە مۆدێلی ڕۆژئاوایی جیاوازی بەرچاوی هەیە. کەوابوو ئەگەر ئەم سیستەمە سیاسییە تایبەتییە پێك بێ و بتوانێ بوار بۆ گەشەی هەندێك لە تایبەتمەندییەکانی گەشەسەندن بڕەخسێنێ، بەرەبەرە دەتوانین چاوەڕوان بین هەتا هەندێك لە تایبەتمەندییە پێویستەکانی دروست بوونی دیموکراسیش پێك بێن. لفت ویك ئەم سیستەمە سیاسییە تایبەتییەی بە چەمکی ((دەوڵەتی گەشەکردوو))[1] باس کردووە کە بەپێی پێناسەکەی جۆرێك سیستەمی سیاسی تاییبەتییە کە مەبەستەکەی گەیشتن بە پەرەپێدان و باشکردنی ڕەوشی ژیانی خەڵکە.

لەڕووی وشەوە ((دەوڵەتی گەشەکردوو)) خاوەنی دوو بەشی ئایدۆلۆژیا و پێکهاتەیە و ئەم پێوەندییە ئایدۆلۆژیایی-پێکهاتەییەیە کە ئەم دەوڵەتە لە دەوڵەتەکانی دیکە جیا دەکاتەوە.

گرینگترین تایبەتمەندیی ئایدۆلۆژیایی ئەم دەوڵەتە گەشەخواز بوونیەتی. بەم مانایە کە ئەم دەوڵەتە پێ لەسەر گەشەی ئابووری کە زۆرجار چوونە سەر ڕێژەی کەڵکە بوونی سەرمایە و بە پیشەسازی بوونە، دادەگرێ.

دەوڵەتێکی ئەوتۆ توانایی پێویستی بۆ بەرەوپێشبردنی گەشەسەندن کە لەو وەك ئاستی بەرز و سەقامگیر لە هەڵدانی ئابووری و گۆڕینی پێکهاتە باسی لێدەکرێ، چ لە ئاستی نێوخۆیی و چ لە پێوەندیی وڵات لەگەڵ ئابووری نێونەتەوەیی، پێك دێنێ.

بۆ دەستڕاگەیشتن بەم دۆخە ئارمانییە، نوخبە دەوڵەتییەکان دەبێ بتوانن جۆرێك دەسەڵاتخوازیی ئایدۆلۆژیا لە کۆمەڵگادا پێك بێنن، هەتا بە وتەی گرامیشی، پرۆسەی گەشەسەندنی جێگای دڵخوازی ئەوان ببێتە پرۆسەی دەسەڵاتخوازی لە کۆمەڵگا و تەواوی یاریزانە گرینگەکان لە کۆمەڵگا پشتیوانی لێ بکەن.

(1) Developmentalist.



لایەنی پێکهاتەیی دەوڵەتی گەشەکردوویش پێ لەسەر توانایی دەوڵەت لە بەڕێوەبردنی کاریگەری سیاسەتە ئابوورییەکان دادەگرێ. ئەم تواناییە لە بەشە جۆراوجۆرە دەوڵەتییەکان لەوانە بەڕێوبەرایەتی، دامەزراوەیی، تەکنیکی و سیاسی خۆ دەنوێنێ.

تەواوی ئەم تواناییانە، بە واتایەکی دیکە، سەربەخۆیی دەوڵەتە لە هێزەکانی دیکەی کۆمەڵایەتی کە ئەو دەسەڵاتە بە دەوڵەت دەبەخشی لە تواناییەکانی خۆی لە بەشە جۆراوجۆرەکان بۆ گەڵاڵەکردن و بەڕێوەبردنی سیاسەتە درێژخایەنەکانی کەڵك وەربگرێ. هەموو نووسەران و لێکۆڵەرانی گەشەسەندن لەسەر ئەو بڕوایەن کە دەوڵەتێکی ئەوتۆ دەبێ بەهێز و خاوەنی سەربەخۆیی ڕێژەیی لە پێوەندی لەگەڵ هێزەکانی دیکەی کۆمەڵایەتی بێ. پێویستی بە دەوڵەتێکی بەهێز لە پرۆسەی گەشەسەندن بەردەوام یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەدەبیانی مۆدێرنیزاسیۆن لەم ساڵانەی دواییدا بووە. دەوڵەتی بەهێز[1] ڕاست دژی ڕوانگەی میرداڵ لە دەوڵەتی نەرم[2] وەك دەوڵەتێك کە نەتوانایی بەڕێوەبەری و نەتوانایی سیاسیی پێویستی بۆ بەرەوپێشبردنی پرۆسەی گەشەسەندن هەیە، هەڵکەوتووە. هەروەها دەبێ جۆرێك کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتیش بۆ پێشگیری لە کەڵکی خراپ وەرگرتنی دەوڵەت لە سەربەخۆییەکەی هەبێ.

بەپێی ئەو پێناسەیەی لەسەرەوە ئاماژەی پێکرا، تەنیا کاتێك کە ئابووری ڕوو لە هەڵدان بێ دەتوانین بە دەوڵەت بڵێین گەشەکردوو. ئەمە لە حاڵێکدایە کە هەندێك جار سەرەڕای هەوڵ و تەقەلای نوخبە دەوڵەتییەکان بۆ بەرەوپێشبردنی گەشەسەندن، لەبەر هۆکاری پێکهاتەی دەرەوەیی و نەناسراو و پێشبینی نەکراو، ئەم هەوڵانە لەگەڵ شکست بەرەو ڕوو دەبن.

لە باردۆخێکی ئەوتۆدا نابێ ئەو دەوڵەتە وەك دەوڵەتی دژی گەشەسەندن پێناسە بکەین.

کەوابوو پێویستە بە لەبەرچاوگرتنی ئەگەری شکستی سیاسەتەکانی گەشەسەندن بە پێناسەی خۆمان لە دەوڵەتی پەرگرتوو بچینەوە. بەمجۆرە دەوڵەتی گەشەکردوو، دەوڵەتێکە کە گرینگترین تایبەتمەندیی ئایدۆلۆژیایی ئەو هەوڵدان بۆ گەشەسەندنە و تەواوی هەوڵەکانی بۆ کۆکردنەوەی دەرەتان و سەرچاوەکانی خۆی بە مەبەستی دەستڕاگەیشتن بە گەشەی ئابووری وەگەڕ دەخا.

زۆرجار گرینگترین هێزی پاڵپێوەنەری ئایدۆلۆژیای گەشەخواز ناسیۆنالیزم بووە. ناسیۆنالیزم بە هاندانی خەڵك بۆ گەیشتن و جێهێشتنی نەتەوە گەشەکردووەکان، سەرچاوەکانی لە پێناوەی سیاسەتەکانی گەشەسەندن دەخاتەگەڕ.

(1) Strong State.
(2) Soft State.





شایانی باسە، ئەوەی کە سیاسەتی نادڵخوازی گەشەسەندن دەکاتە عەقڵانی و ڕەوا، نێوەڕۆکی ئایدۆلۆژیایی ئەم سیاسەتانەیە.

هەربۆیە لفت ویك لە پێوەندی لەگەڵ پێکهێنانی حکوومەتی دڵخوازی دیموکراتیك کە جێگای پەسەندی ڕۆژئاواییەکان بێ، پێی وایە کە ئەم جۆرە لە حکوومەت لە ڕێگای فشار و ناچارکردنی حکوومەتە گەشە نەکردووەکان و سەپاندنی بایەخە دیموکراتیکەکان و بەستنەوەی یارمەتییە ماڵی و پیشتوانییە سیاسییەکان بە گرتنە پێشی سیاسەتی جێگای پەسەندی ڕۆژئاوا، نایەتەدی، بەڵکو پێویستییەکەی پشتیوانی بە دەوڵەتە گەشەکردووەکانە و ئەم ڕێکارە تەنیا ڕێگاچارەیە و وەك ڕێکارێکی مامناوەندییە و پێی وایە کە دروست بوونی ئەم جۆرە لە سیستەمی سیاسی و هێنانەدی تایبەتمەندییەکانی گەشەسەندن، دەبێتە هۆی دروست بوونی حکوومەتە دیموکراتیکەکانیش.

لێرەدا دەبێ جارێکی دیکە پێ لەسەر ئەم خاڵە سەرەکییە دابگیرێ کە دەوڵەتی گەشەخواز بۆخۆی خاوەنی چەندین تایبەتمەندییە کە لە تەنیشت یەکتر دەوڵەتێکی ئەوتۆ پێك دێنن. هەر بۆیە ئەگەرچی زۆر دەوڵەت لە کۆمەڵگای جیهانی سێهەم هەن کە پێیان وایە دەوڵەتی گەشەکردوون و پڕۆگرام و کارکردنی خۆیان بۆ دەستڕاگەیشتن بە گەشەسەندن خستۆتەڕوو، بەڵام لە کردەوەدا تەنیا چەند دەوڵەتێك کە لە قامکەکانی دەست تێناپەڕن توانیویانە بەڵێنەکانی خۆیان جێبەجێ بکەن. یەك لەو دەوڵەتە گەشەخوازانە دەتوانین ئاماژە بە دەوڵەتی گەشەخوازی ماهاتیر موحەممەد لە مالیزیا و هەندێك لە دەوڵەتەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بکەین؛ کە تایبەتمەندییە گرینگەکانی ئەم دەوڵەتانە، سەرنجی تایبەتی بە زیادکردنی بەرهەم و بردنە سەری ڕێژەی هەناردە، وەگەرخستنی سەرمایە لە پیشەسازییە سەرەکییەکان کە دەتوانێ کێبەرکێ لەگەڵ دەرەوە بکا، پەرەپێدانی سەرچاوەی ئینسانی، بایەخدان بە بەرهەمی زانست و هاوکات کەڵك وەرگرتن لە زانستی تەکنیکی وڵاتانی پێشکەوتوو، ئایینی کونفوسیوس کە پێی وایە فەرهەنگ دەبێ لە خزمەتی بەرهەم و لەبەرچاوگرتنی دیسیپلین و ویژدانی کاری و کۆششی بەردەوام بێ، ڕاکێشانی بە بەرنامەی سەرمایە دەرەکییەکان و لە هەموو گرینگتر دەسەڵاتی بوروکراتیك و ناگەندەڵە.

کەوابوو دەوڵەتێك کە بە ڕواڵەت دروشمی دەوڵەتی گەشەخوازی هەڵگرتوو و بەڵام لە کردەوەدا لەبەر چەند هۆکارێك لەوانە:

١- پێشخستنی تێبینی خزمایەتی و حیزبی بەسەر لێهاتوویی و پسپۆڕی، بۆ وێنە ڕەنگە دەوڵەتێك لە هەوڵی ڕاکێشانی سەرمایەی دەرەکی بێ، بەڵام بە بێ داڕشتنی بەرنامەیەکی ورد و



بەبێ سەرنجدان بە پسپۆڕی، دەیسپێرێ بە خزمان و لایەنگرانی خۆی کە ئاکامەکەی بەفیڕۆدانی دەرفەتەکان و بەهێزکردنی بورژوازی تیجاری لە بەرامبەر بورژوازی پیشەسازیدایە.

٢- نەبوونی دەسەڵاتێکی ڕاستەقینە لە بەرەوپێشبردنی پڕۆگرامەکانی پێوەندیدار بە گەشەسەندن بەهۆی بوونی جەمسەرەکانی دەسەڵات کە یان خاوەنی سەرچاوەی ئابووری و ماڵی نادەوڵەتین و ڕاستەوخۆ لە کۆمەڵگا وەردەگرن و یان خاوەنی هێز و پرێستیژی تایبەتین کە بەپێی لێکدانەوەکانی ڤیبەر سەرچاوەی هێز لە کۆمەڵگاوە وەردەگرن. بەواتایەکی دیکە ستراتیژی مانەوەی ئەوان لەسەر بنەمای نادەوڵەتی ڕاوەستاوە. کەوابوو دەوڵەت ناتوانێ پڕۆگرامێك بە پێچەوانەی خواست و بەرژوەندیی جەمسەرەکانی دەسەڵات پێشکەش بکا.

٣- نەبوونی هاوسەنگی لە نێوان ئامرازەکانی دەسەڵاتگەرایانە و سەرکوت. هیچ سەرکەوتنێکی بەرچاوی لە هێنانەدی گەشەسەندن بەدەست نەهێناوە، پێی ناگوترێ دەوڵەتی گەشەخواز.

لەکۆتاییدا پێویستە بڵێین، هەرچەند کە کتێبی زۆر لە پێوەندی لەگەڵ گەشەسەندنی جیهانی سێهەم، چاپ و بڵاوکراوەتەوە بەڵام لەبەر ئەو هۆکارانەی لە سەرەتای ئەم پێشەکییەدا باسکران، ڕێوشوێنێك کە بە کردەوە بە ئاکام بگا بەدی نەهاتووە، کەوابوو ئەوەی لفت ویك لە لێکۆڵینەوەی گەشەخوازی خۆی لە پێوەندی لەگەڵ جیهانی سێهەم لەم کتێبەدا ئاماژەی پێکردووە، تاڕادەیەکی یەکجار زۆر لەگەڵ تایبەتمەندیی وڵاتانی ڕوو لە گەشە یەك دەگرێتەوە. لەبەر ئەم هۆیە کاربەدەستان و لێکۆڵەرانی بواری گەشەسەندن ڕادەسپێرین کە بە وردبوونەوە لە بابەتەکانی ئەم کتێبە ئاسۆیەکی نوێ لە پێوەندی لەگەڵ داڕشتنی سیاسەتی خۆجێتی گەشەخواز لە وڵاتدا بکەنەوە.

لەبەر ئەوەی نووسەر ڕەخنەی لە ڕوانگەی باوی ڕۆژئاوا لە پێوەندی لەگەڵ جیهانی سێهەم گرتووە و ڕێکارێکی جیاوازی پێشنیارکردووە، خوێندنەوەی ئەم بەرهەمە دەتوانێ بۆ بردنە سەری زانیاری زانستیی گەشەخوازی لە ئاستی خێرخوازان بە کەڵك بێ.

**دامەزراوەی فەرهەنگی لێکۆڵینەوەی**
**نێونەتەوەیی ئەبراری هاوچەرخ لە تاران**





# فەسڵی یەکەم

## ئەولەوییەتی سیاسەت لە گەشەسەندندا

### پێشەکی

زۆربەی وڵاتانی روو لە گەشە لە سێ دەیەی دوایی سەدەی بیستەم لە رەوشێکی نالەباردا بوون و بەگشتی ئاستی هەڵدانی ئابوورییان زۆر نزم بووە. تەنانەت بەدرێژایی ساڵەکانی نێوان ١٩٦٥ هەتا ١٩٩٥ زۆربەی وڵاتەکان (بەتایبەتی وڵاتانی خوارەوەی بیابانی ئەفریقا) خاوەنی هەڵدانی ئابووری نیگەتیڤ بوون. (بڕوانن خشتەی ١-١) لەڕاستیدا، لە کۆتایی سەدەی بیستەم، زۆربەی حەشیمەتی ئەم وڵاتانە لەلایەنە جیاوازەکانەوە، هەژارتر لە بیست ساڵی رابردوو بوون

خشتەی (١-١): نرخی هەڵدانی نێونجی ساڵانەی بەرهەمی ناپاڵفتەی سەرانەی نەتەوەیی لە وڵاتانی ئاماژەپێکراو لە ساڵی ١٩٧٠ هەتا ١٩٩٧.

| وڵات | نرخی گەشەی نیونجی ساڵانەی بەرهەمی ناپاڵفتەی نەتەوەیی |
|---|---|
| ئەنگۆلا | -٦,٨ |
| بەرازیل | -٠,٤ |
| کامیرۆن | ١,٥ |
| هائیتی | -١,٣ |
| ئەلجەزایر | -٠,٦ |
| پیرۆ | -١,١ |
| ڤەنزویلا | -١,١ |
| تانزانیا | ٠,٨ |
| مەکزیک | ٠,٩ |

سەرچاوە: راپۆرتی بانکی جیهانی ١٩٩٢، ١٩٩٦، ١٩٩٧



لە زۆربەی ئەم کۆمەڵگایانەدا، سەرەڕای هاتنە بەرباسی دروشمی گەشەخواز بەشێکی بەرچاو لە حەشیمەت لە هەژاری تەواو و هەندێکی دیکەشیان لانیکەم هەژار ماونەتەوە. ئەمە لە حاڵێکدایە کە نابەرامبەری پێکهاتوو لە دابەشکردنی داهات یان (لە هەندێك لە وڵاتەکان) زەویش، پەرەئەستاندووە.

سەرەڕای ئەمەش، هەژاری و نابەرامبەری لەم وڵاتانە خۆی لە هەندێك پرس لەوانە رێژەی بەرزی مردنی منداڵان و دایکان لەکاتی منداڵبوون، لەدایك بوونی پێش وەخت و خراپی خۆراکی منداڵان، نیشان دەدا. هەروەها تا ئەم دواییانە و چەندین ساڵ دوای سەقامگیربوونی شەپۆلی سێهەم دیموکراتیزاسیون لە وڵاتانی روو لە گەشە (Huntington, 1991) سیستەمە سیاسییەکانی ئەم وڵاتانە زۆر ناسەقامگیر و سیاسەتە دیموکراتیکەکان چەواشەکراون یان هەرەسیان هێناوە و مافی مەدەنی و مافی مرۆڤیش بەردەوام پێشێل کراون. هاوکات چەندین جۆری جیاوازی گەندەڵی، بەشێوەی بەرچاو، لەو وڵاتانە دەبینرێن. دەتوانین بەم کێشانە هەندێك رەوشی دیکەی پێ زیاد بکەین لەوانە شەڕە نێوخۆیی و نەتەوەییەکان (لە ئەنگۆلا، موزامبیك، رواندا، بۆرما و سریلانکا لە دەیەی ٨٠ و ٩٠)، روودانی کودەتا سەربازییەکان (بەناو پێی دەڵێین نەخۆشی ئەمریکای لاتین، بەڵام لە وڵاتێك وەك پاکستان و پاراگوایش ئاساییە) و هەروەها روودانی کارەساتی سروشتی وەك سێڵاو، وشکە ساڵی و بڵاوبوونەوەی نەخۆشییە درمەکان کە بەشێکی گەورە لە ئەفریقیا و باشووری ئاسیا دەگرێتەوە.

هەرچەند کە سیاسەتی گەشەسەندن لە وڵاتە جۆراوجۆرەکان لەرووی شێواز، تایبەتمەندی، توندی و هەمەلایەنە بوونی ئەوان لە وڵاتێك بۆ وڵاتێکی دیکە جیاوازە، بەڵام چوارچێوەی گشتیی ئەم سیاسەتانە وەك یەکن. هەر لێکۆڵەرێك کە بەدوای رووداوەکانی وڵاتانی روو لە گەشەدا دەگەڕێ لەگەڵ چەندین سیناریۆی وەك یەك بەرەو روو دەبێ. بێ گومان وێنەیەکی ئەوتۆ لە بەڕێوەبردنی سیاسەتەکانی گەشەخواز زۆر لێڵە، بەڵام دەبێ ئاگاداربین کە ئەم حاڵەتە، تەنیا وێنەیەك لە بەڕێوەبردنی ئەم سیاسەتانە نییە. بەجۆرێك کە هەندێك لە کۆمەڵگای روو لە گەشە، بە بەڕێوەبردنی سیاسەتەکانی گەشەخواز دەیەی ٧٠ی زایینیدا توانیویانە دەستیان بە نرخی هەڵدانی بەرچاو رابگا و هەندێکی دیکەش لانیکەم بە بەڕێوەبردنی ئەم گەلاڵانە، هاووڵاتییانی خۆیان لە هەژاری کە داوێنگیریان بووە، رزگار بکەن (بڕوانن خشتەی ٢-١)





خشتەی (٢-١): نرخی هەڵدانی نێونجی ساڵانەی بەرهەمی ناپاڵفتەی سەرانەی نەتەوەیی لە وڵاتانی خوارەوە لە ١٩٧٠ هەتا ١٩٩٥.

| وڵات | نرخی گەشەی نیونجی ساڵانەی بەرهەمی ناپاڵفتەی نەتەوەیی |
|---|---|
| چین | ٧,٨ |
| ئەندونزیا | ٤,٧ |
| تایلەند | ٥,٢ |
| بوستوانا | ٧,٣ |
| موریتس | ٥,٨ |
| مالیزیا | ٤ |
| کۆریا | ١٠ |
| سەنگاپوور | ٥,٧ |
| شیلی | ٦,٥ |

سەرچاوە: راپۆرتی بانکی جیهانی لە ساڵەکانی ١٩٩٦، ١٩٩٧.

هەرچەند ژمارەی ئەم وڵاتانە یەکجار کەمە، بەڵام دەستکەوتەکانی ئەم کۆمەڵگایانە بەهۆی سەرکەوتنی گەشەخوازی و لەبەر ئەو وانە و ئەزموونانەی کە بۆ وڵاتانی دیکە بە دیاری دێنن، زۆر بەرچاو و جێگای سەرنجە.

لە نێو ئەو وڵاتانەی کە ئەم جۆرە سەرکەتنانەیان بەدەست هێناوە، سەرەڕای وڵاتە بەناوبانگەکانی رۆژهەڵاتی ئاسیا و باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا وەك کۆریا، تایوان، سەنگاپوور دەتوانین ئاماژە بە هەندێك وڵاتی دیکە لەوانە بوتسوانا، موریتس، مالیزیا، تایلەند و رەنگە ئەندونزیا کە توانیویانە لە ماوەی ٢٥ ساڵ لە (١٩٦٥ هەتا ١٩٩٠) دەستیان بە نرخی هەڵدانی ٤ لە سەدی و لە ساڵەکانی نێوان ١٩٨٤ هەتا ١٩٩٥ بە نرخی هەڵدانی زیاتر لە ٥ لە سەد رابگا (ئەوەش لە قۆناغی وەستانی جیهانی کە لە ئاکامی ساڵەکانی دوای جەنگ پێکهات). هەرچەند دەبێ بە راشکاوی ئاماژە بەم خاڵە بکەین کە زۆربەی وڵاتان بەدرێژایی ئەم ساڵانە لەڕووی پێوانەکانی مافی مرۆڤەوە لە رەوشی نالەباردا بوون، بەڵام دەستڕاگەیشتن بەم ئاستە لە هەڵدانی ئەم کۆمەڵگایانە کە دەتوانێ سیاسەتە کۆمەڵایەتییەکان باش بکا و



هێندێك لە پێوەرە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکان وەك ئاستی ((هیوا بە ژیان))، رێژەی خوێندەواری و تەندروستی منداڵان، لەوانەدا بەرزبکاتەوە. لەم گرووپە دەتوانین ئاماژە بە هەندێك وڵات لەوانە شیلی دوای ساڵی ١٩٨٠، کوبا و چین لە ساڵەکانی ١٩٥٠ هەتا ١٩٨٠ بکەین. هەندێك لەم کۆمەڵگایانە (بوتسوانا، موریتس، سەنگاپوور و مالیزیا) لە بارودۆخێکی دیموکراتیك لەم قۆناغەی گەشەسەندن تێپەڕبوون و هەندێکی دیکەش وەك (کۆریای باشوور، تایوان، ئەندۆنزیا، شیلی و چین) لە بارودۆخێکی دیکەدا ئەم قۆناغەیان تێپەڕکردووە، هەرچەند جگە لە چین، هەر یەك لەم وڵاتانە (گرووپی دووەم)، بەخێرایی جۆراوجۆر و بە ئاکامی جیاواز بەرەو دیموکراسی هەنگاویان ناوە.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەم راستییە کە وڵاتانی ئاماژەپێکراو بە بوونی سیاسەتی جیاوازی دیموکراتیك و نادیموکراتیك، توانیویانە لە بواری گەشەخوازیدا تارادەیەك سەرکەوتن بەدەست بێنن، خاڵی سەرەتای باسی ئەم کتێبەیە. ئەگەر ئەم گرووپە سەرەڕای سیاسەتی جیاواز توانیویانە سەرکەوتووبن، دەبێ بەدوای هۆکاری سەرکەوتنەکاندا بگەرێین (بەو جۆرەی کە بەردەوام بەدوای هۆکاری شکستەکانی گەشەخوازی لە وڵاتانی دیکەدا بووین).

هەرچەند لە کۆتایی دەیەی ١٩٩٠ هەندێك لەم وڵاتانە وەك کۆریا، مالیزیا، تایلەند بەتایبەتی ئەندۆنزیا لەگەڵ قەیرانی ماڵیی گرینگ بۆ وێنە دابەزینی بەهای پارەی نەتەوەیی و ئاشکرابوونی رێژەی قەرزەکان بەرەو رووبوون، بەڵام هەڵەیەکی گەورەیە ئەگەر پێمان وابێ ئەم قەیرانانە دەستکەوتەکانی ٣٠ ساڵی رابردوو لەنێو دەبا، شتێکی ئەوتۆ قەت روونادا، چونکە ئەو گۆڕانکارییە پێکهاتەییە کە لە ئابووری و کۆمەڵگای ئەم وڵاتانە پێك هاتووە، دەمێنێتەوە و بۆ دواوە ناگەڕێتەوە.

بە دڵنیاییەوە ئەم وڵاتانە بۆ ماوەی چەندین ساڵ لەگەڵ زۆر کێشە و گیروگرفت بەرەو رووەبن و هەزینەیەکی زۆر بۆ قەرەبووکردنەوەی بێکاری و کەمکردنەوەی ستانداردەکانی ژیان و هەژاری دەدەن. (بەپێی راپۆرتی Oxfam لە ١٩٩٨). ئەم ئابوورییانە نە تەنیا ئەم قەیرانانە تێپەڕ دەکا، بەڵکو بەرەو باشی هەنگاو دەنێ. دیارە رەنگە خێرایی هەڵدانی ئابووریی ئەوان لە بەراورد لەگەڵ خێرایی سەرسووڕهێنەری رابردوو کەمتر بێ. بەڵام سەرەڕای ئەمەش، ئەم وڵاتانە لە ئاسیا و تەنانەت ئابووری جیهانی، وەك هێزێکی بەرچاو دەمێننەوە.

ئامانجی سەرەکی ئەم کتێبە وەڵامی ئەم پرسیارەیە کە بۆچی کۆمەڵگایەك لەم چەشنە توانیویانە دەستیان بە گەشەسەندن رابگا لە حاڵێکدا وڵاتانی دیکە هەروا لە هەژاری و





دواکەوتوویيدا ماونەتەوە، هەتا بەجۆرە نيشانی بدا کە چۆن، ئەزموونەکانی ئەم وڵاتانە کاريگەرييان بووە لەسەر تيۆرييەکان و سياسەتەکانی گەشەخوازانە.

ئەم کتێبە لە سێ بابەتی گرينگ کە لە فەسڵەکانی دواتر ئاماژەی پێ دەکرێ، پێك هاتووە.

### ئەولەوييەتی سياسەت[1]

يەکەمين بابەتی گرينگ کە لەم کتێبەدا پێی لەسەر داگيراوە رۆڵ و ئەولەوييەتی سياسەتە لە دەستراگەيشتن بە گەشەسەندن. لەم باسەدا، گرينگترين و سەرەکيترين گۆڕاو کە رۆڵی دياريکراوی لە دروست بوونی چەمکی گەشەسەندن و شکست يان سەرکەوتنی گەڵاڵەکانی گەشەخوازانەدا هەيە، سياسەتی کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکانە. چونکە ئەگەر بمانەوێ بە دروستی لە دەستکەوتی کۆمەڵگاکانی روو لە گەشە تێبگەين دەبێ خوێندنەوەيەکی دروستمان لە سياسەتەکانی ئەوان، بەتايبەتی چونيەتی کۆجێيی بوونی سياسەتەکان لە دەوڵەت و رێژەی رۆڵی دەوڵەت لە سياسەتەکانيان هەبێ.

بە کورتی دەبێ بڵێين سياسەت نە تەنيا رۆڵی گرينگ لە گەشەسەندن دەگێڕێ بەڵکو رۆڵی سەرەکی لە تێگەيشتن و بەرزکردنەوەی ئاستی گەشەسەندن هەيە.

لەلايەك سياسەت شێوازی دەوڵەت دياری دەکا و لەلايەکی ديکەوە بەهۆی تايبەتمەندی، پێکهاتە و توانايیەکانی، کاريگەری وەردەگرێ. بەڵام بۆچی گەشەسەندن، سياسييە و بۆچی دەوڵەت رۆڵی سەرەکی لەودا هەيە؟ لەوەی کە چەمکی سياسەت رۆڵی گرينگی لە باسەکانی ئەم کتێبەدا هەيە، پێويستە بەکورتی ئاماژە بە پێناسەی ئەم چەمکە بکەين.

### سياسەت

من بەم گريمانەيە دەست پێدەکەم کە کۆمەڵگاکان بەهۆی بەرژەوەندی، ئەولەوييەتەکان، بەهاکان و تيۆرييە جياوازەکان لێك جيا دەکرێنەوە و هەر چەند ئەم کۆمەڵگايانە ئاڵۆزتر و گەورەتر بن، جياوازييەکانيان زياتر و ئاڵۆزتر و قووڵتر دەبن. ئەم راستييە بۆ ئەوە دەبێ لە ئاستی جيهانيدا پەرەی پێبدرێ. ئەم بانگەشەيە جيهانييە دەتوانين بە باشی لە جياوازييەکانی نێوان ئەو راوچيانەی کە لە دارستانەکانی ئيتۆری دەچن بۆ راوی Bumbuti[2] (بەپێی

(1) Primacy of politics.

(٢) جۆرێك بوونەوەرە لە ئەفريقا.



لێکۆڵينەوەکانی تۆرن بۆڵ، ١٩٦٨)[1] و جياوازی چينايەتی لە ئەورووپای دەيەی ١٩٣٠ يان جياوازی قەومی-مەزهەبی لە ئەندۆنزيا و يوگسلاڤيای پێشوو، بسەلمێنين.

هەرچەند هۆکاری ئەم جياوازييانە زۆرجار لە پشت جياوازی ديکەوە بە شاراوەيی دەمێنێتەوە، بەڵام دەتوانين بڵێين کە سەرچاوەی تەواوی ئەم جياوازييانە دەبێ، راستەوخۆ يان ناڕاستەوخۆ لە سوودوەرگرتن لە سەرچاوەکان يان شێوەکانی کەڵك وەرگرتن لەوانە لەلايەن گرووپ و تاکە جۆراوجۆرەکان، دەستنيشان بکەين. هەرچەند کە هەموو بەدوای قازانجی خۆيانن، بەڵام بۆ گەيشتن بە ئاسايش و بەختەوەری ناچار بە هاوکاری کردنی يەکترن، کەوابوو پەنابردن بۆ هێز و توندوتيژی بۆ چارەسەری کێشەی جياوازی و جۆراوجۆری بەرژوەندييەکانی نێوان تاکە جياوازەکان، رێکارێکی لەبار و درێژخايەن نييە، هەرچەند کە بەداخەوە زۆرجار روو دەدا. جگە لەوەی کە دی واڵ[2] (١٩٨٢) ئاماژەی پێکردووە، مرۆڤ تەنيا بوونەوەرێکە کە بۆ چارەسەری کێشەکان و جياوازييەکانی نێوان خۆی لە رێکاری گونجاو و زانايانە کەڵك وەردەگرێ. ئەم رەوتە، ئەو شتەيە کە من پێی دەڵێم سياسەت کە رەنگە هەموو هەڵسوکەوتی توندوتيژانە، هاوکاری و دانوستان، بەرهەم و دابەشکردنی سەرچاوەکان (چ ماددی و چ هزری) لە ئاستی خۆجێيی، نەتەوەيی و نێونەتەوەيی و يا لە چوارچێوەی تايبەتی يان گشتی لەخۆبگرێ. (Leftwich, 1983). ديارە دەستڕاگەيشتن بە هاوکاری و دانوستان لەنێوان مرۆڤەکان، بەهۆی جياوازی بەرژوەندی و بيروبۆچوون و ئەولەوييەتەکان لەنێوانيان‌دا، زۆر دژوار بووە.

### سياسەتەکانی گەشەسەندن

هەرچەند من لە دوو فەسڵی دوايی ئاماژە بە پێناسە جۆراوجۆرەکانی گەشەسەندن دەکەم، بەڵام بەو جۆرەی کە پێشتر گوتبووم، رەوتی گەشەسەندن لە کۆمەڵگای مرۆيی بەردەوام رێکخستەکان، هاريکاری، سوود وەرگرتن و دابەشکردنی سەرچاوەکان بەشێوازی نوێ (کە بريتييە لە سەرچاوەی سەرمايەيی، زەوينی، هێزی مرۆيی و يان پێکهاتەيەك لەوانە) لەخۆ دەگرێ.

لەوەی کە رەوتی گەشەسەندن پێويستی بە شێوازی نوێی سوود وەرگرتن و دابەشکردنی سەرچاوەکان هەيە و شێوازە جۆراوجۆرەکانيش دەبنە هۆی سەرکەوتن يان دۆڕانی گرووپەکان و

(1) Turnbull.
(2) Dewaall.





تاکە جۆراوجۆرەکان، هەربۆیە جیاوازی نێوان تاکەکان و گرووپە جۆراوجۆرەکان حاشا هەڵنەگرە. بەپێی پێناسەی سەرەوە دەردەکەوێ کە بۆچی گەشەسەندن بەشێوەیەکی حاشا هەڵنەگر، سیاسییە، نەك بەڕێوەبەری. بەو جۆرەی کە ستراتۆن[1] لە پێوەندی لەگەڵ بابەتێکی دیکەدا بەم ئاکامە گەیشتبوو، ((خەڵك ناتوانن بەبێ ئەوەی پێوەندی نێوان خۆیان بگۆڕن، دەست بە گۆڕینی شێوازەکانی سوود وەرگرتن لە سەرچاوەکان بکەن (Stretton 1970) و ئەمەش هەمان سیاسەتە. ئەم بابەتە بەو جۆرەی لە ئاستی خۆجێی یان نەتەوەیی، لە قوتابخانە و زانکۆ، بازرگانی، هاوکارییە بان نەتەوەییەکان یان بوروکراسی دەوڵەتی خۆجێی بوونی هەیە، لە سیاسەتە بەربڵاوەکانی گەشەخوازی لە هەر کۆمەڵگایەدا دەبینرێ، چ ئەم کۆمەڵگایە روو لە گەشە بێ یان نەبێ. دیارە جیاوازییەکی سەرەکی (هەروەك لە فەسڵی ٦ دا ئاماژەی پێ دەکەم) لەنێوان کۆمەڵگادا هەیە و ئەوەش ئەمەیە کە کۆمەڵگای دیموکراتیکی گەشەکردوو، گۆڕانکارییەکان لە رێگای شێوازەکانی بە کۆمەڵی سیاسەتە دیموکراتیکەکان، نیهادینە بووە. ئەمە بووەتە هۆی ئەوەی کە ئەم گۆڕانکارییانە لەسەرەخۆتر و پێشکەوتووانەتر و زۆرجار لەگەڵ کێشەی سیاسی کەمتر لە چاو کۆمەڵگای روو لە گەشە رووبدەن. هەرچەند کە هەموو کاتێك بەم جۆرە نەبووە.

ئەم دیاردەیە رەنگە لەبەر ئەم هۆیە بێ کە لە دیموکراسییە سەقامگیر و مۆدێرنەکاندا، سەرکەوتووەکانی (هەڵبژاردن) شتێکی کەم بەدەست دێنن و دۆڕاوەکانیش شتێکی زۆر لەدەست نادەن. چونکە پانتایی گۆڕانی سیاسەتەکان ئەوەندە بەربڵاو و هەمە لایەنە نییە و مەترسییەکانیشی بەرچاو نییە. لەلایەکی دیکەوە لە زۆربەی وڵاتانی روو لە گەشەدا نابەرامبەرییەکان یەکجار زۆر و بەربڵاوە، کەوابوو گۆڕانکاری دەتوانێ بەرژەوەندی هەندێك لەم گرووپانە بخاتە مەترسییەوە، بەتایبەتی کاتێك کە گۆڕانکارییەکی تایبەتی وەك پێویستییەك بۆ رەوتی گەشەسەندن جێگای سەرنج بێ.

چاکسازی لە زەویدا نموونەیەکی گونجاوە. لە زۆربەی بەشەکانی ئەمەریکای لاتین خاوەنداریێتی زەوی بەشێوەیەکی زۆر نابەرامبەر بووە. بەجۆرێك کە رێکخراوی خواردەمەنی و کشتوکاڵی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان (FAO) مەزەندەی کردووە کە ١/٣ لە سەدی خاوەن زەوییەکان، نزیکەی ٧١,٦ لە سەد لە زەوییە بە پیت و بەرەکەتەکانیان لەبەردەست دایە. (Todaro, 1997) نابەرامبەریی خاوەنداریێتی زەوی، لە ئەمەریکای باشوور پاش

(1) Hugh Stetton.



ئاپارتایدیش، هەر ماوە، چونکە هەروا سپی پێستەکان خاوەنی زۆربەی زەوییەکانن. وەك چەند نموونەی وێکچوو دەتوانین ئاماژە بە هیند و پاکستان، ئەو وڵاتانەی کە نەبوونی زەوی بووەتە کێشەیەکی سەرەکی، بکەین. لە هیند ٢٧ لە سەدی گوندنشینەکان بێ زەوین و ئەم رێژەیە روو لە گەشەیە. لە بەنگلادیشیش ئامار ٢٩ لە سەد نیشان دەدا و لە بەڕازیلیش ئاماری گوندنشینە بێ زەوییەکان لە ١٩,٢ لە سەد لە ١٩٥٠ گەیشتووەتە ٣٦ لە سەد لە ١٩٧٥. کە ئەمە بووەتە هۆی چوونە سەری رێژەی کۆچی گوندنشینەکان بەرەو شارەکان. تەنانەت لە دەیەی ١٩٨٠ش نزیکەی ١٢ ملیۆن گوندنشین (لەنێو حەشیمەتی ١٤٠ میلۆن کەسی بەڕازیل لەو سەردەمەدا) بێ زەوی ماونەتەوە. (Hewitt, 1992).

ئەمڕۆکە ئەم راستییە کە چاکسازی زەوییە کشتووکاڵییەکان یەکێك لە رەوشە گرینگەکانی گەشەسەندنی گوندنشینەکان و چوونە سەری بەرهەمی کشتوکاڵی ئەوانە، تەنانەت لەلایەن بانکی جیهانیش بایەخی پێدراوە، چونکە لەو بڕوایەدان کە خاوەن زەوییە بچووکەکان لەچاو خاوەن زەوییە گەورەکان رێژەی بەرهەمەکانیان زیاترە. (Todaro, 1997) لەلایەکی دیکە ئەم کارە دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی هەڵدانی ئابووری و لە ئاکامدا چوونە سەری سەقامگیریی سیاسی.

ئەم خاڵە، هەمان ئەو شتەیە کە دوای چاکسازی زەوییە کشتوکاڵییەکان لە کۆریای باشوور لە دەیەی ١٩٥٠ روویداوە، بەجۆرێك کە ژمارەیەکی زۆر لە کرێنشینە هەژار و بێ هیواکان بوونە خاوەن زەوی کە بە زوویی رۆڵی خۆیان لە گەشەسەندنی نەتەوەیی نیشاندا. (Lee, 1979)

بەڵام دەوڵەتەکانی بەڕازیل، هیند، ئەفریقیای باشوور کە لە حاڵی حازردا هەمووی ئەوانە دیموکراتیکن نەیانوێراوە کە چارەسەری کێشەی زەوی بخەنە بەرنامەی کاریانەوە، ئەم کارە دەگەڕێتەوە بۆ هەندێك لە رێککەوتننامەکانی پێشوو تاڕادەیەك بەهۆی دژایەتی ئەم هەڵوێستە لەگەڵ بەرژەوەندی خاوەن زەوییە دەسەڵاتدارەکان کە هەندێکیان پێوەندی نزیکیان لەگەڵ سوپادا هەیە. کەوابوو ئەم روانگەیە کە دەوڵەتە دیموکراتیکەکان لەم وڵاتانە بتوانن بەشێوەیەکی بنەڕەتی رەوشی زەوی چارەسەر بکەن، لە ئارادا نییە، هەرچەند کە ئەم رەوشە رەنگە لە درێژخایەندا زیان بە گەشەسەندنی گوندەکان و هەڵدانی کشتوکاڵی بگەیەنێ و خەڵکێکی زۆر ناڕازی بن.

پرسی چاکسازی زەوییە کشتوکاڵییەکان دوو خاڵی سەرەکی لە باسەکانی ئەم کتێبە نیشان دەدا.





سەرتا ئەوەی کە نیشانی دەدا چۆن بابەتەکانی پێوەندیدار بە گەشەخوازی، دەتوانن ببنە سیاسی و هەڵڵاخولڤێن، چونکە هەروەك لە وێنەکانی پێشوودا بینرا، لەگەڵ نایەکسانیی زۆر و مەترسی لە رادەبەدەر بەرەو روویە.

دووەم: ئەم پرسە ئاماژە بە خاڵێك دەکا کە لە فەسڵی ٦ی ئەم کتێبەدا خستوومەتە بەرباس و لێکۆڵینەوە. چون دیموکراسییە نوێیەکان لە جیهانی روو لە گەشەدا بەبێ ئەوەی یەك دەنگی پێویست بۆ دیموکراسی لەگەڵ مەترسی بەرەو روو بکا، لەگەڵ چەندین شێوازی جۆراوجۆری نابەرامبەری بەرەو رووبووە و هەڵوێستیان لەگەڵ دەگرێ. هەردوو خاڵ بەش بە حاڵی خۆیان پێ لەسەر گریمانەی سەرەکی ئەم کتێبە کە ((ئەولەوییەتی سیاسەت لە گەشەسەندندایە)) دادەگرێ.

## دەوڵەت و گەشەسەندن

ئێستا ئەم پرسیارە دێتە پێش کە بۆچی دەوڵەت رۆڵی گرینگی لە گەشەسەندندا هەیە؟ بەشێوەی ئاسایی گەشەسەندن و پێوەندی نزیکی لەگەڵ هەڵدانی ئابووری وەك رەوتگەلی ئابووری چاویان لێدەکرێ. بەڵام ئەگەر —بەو جۆرە کە ئاماژەم پێکردووە- پێمان وابێ گەشەسەندن رەوتێکی سیاسییە، لەم حاڵەتەدا دەبێ بڵێین کە بەڕێوەبەری و هەماهەنگی رەوتی گەشەسەندن کارێکی زۆر ئاڵۆز و دژوارە. بەڵام خاڵێك زۆر ئاشکرایە و ئەویش ئەمەیە کە ئەگەر ئێمە بە دوای پێشکەوتنی راستەقینە و بەردەوامی خۆشگوزەرانی مرۆیین، دەستەبەرکردنی بە پشتبەستن بە یەکێك لە لایەنەکانی گەشەسەندن (ئابووری و سیاسی) مەحاڵە و یان لانیکەم زۆر لەسەرەخۆ و دوور لە راستی دەبێ. هەروەك لەم دوواییانەدا لە ((راڤەی بەراوردی مێژوویی)) ئاماژەی پێکراوە، بۆ پێکهێنانی هەماهەنگی لەنێوان لایەنە سیاسی و ئابوورییەکانی گەشەسەندن، پێویستی بە ناوەندێکی ((رێکخستنی زانیاری)) و یان ((ناوەندی رێکخستنی تواناییەکان)) دەبێ کە بتوانێ رێنوێنی، هەماهەنگی و هاندانی بەشە جیاوازەکانی ئابووری بگرێتە ئەستۆ و لە هەندێك حاڵەتدا بە پێشکەشکردنی بەرنامەی تایبەت بە ئابووری بەم بەشانە و یان لەو بوارانەی کە کەرتی تایبەتی ئابووری توانای چالاکیی نییە، راستەوخۆ دەست بەکار دەبێ. (Weiss and Hobson, 1995) تەنیا رێکخراوێك کە دەتوانێ ئەم ئەرکە گرینگە لە ئاستی نەتەوەیی بگرێتە ئەستۆ دەوڵەتە.



بەو جۆرەی کە وایز و هاسبون ئاماژەیان پێکردووە، بەڕێوەبردنی رۆڵێکی ئەوتۆ لەلایەن دەوڵەتەوە، تەنیا تایبەت نییە بە وێنە سەرکەوتووەکانی گەشەسەندن لە وڵاتانی جیهانی سێهەم لە سەدەی بیستەمدا بەڵکو دەتوانین چەند نموونە لەو چەشنە لە مێژووی دروست بوونی دەوڵەت و گەشەسەندنی ئابووری لە سەدەی ١٧ بەدواوە و بەتایبەتی سەدەی ١٨ و دوای ئەویش ببینین.

شایانی باسە، جۆری ئەو دەوڵەتەی کە لێرەدا جێگای باسە لەگەڵ ئەوەی کە چالمرز جانسۆن[1] لە لێکۆڵینەوەی کلاسیکی خۆی ئاماژەی بە ژاپۆن وەك دەوڵەتێك ((بە رێبازی ئایدۆلۆژیا))[2] کردووە و نموونەگەلێك کە لە ئابوورییە دەستوورییەکانی[3] سۆڤییەت، چین و کوبا دەبینرێ، جیاوازە. لە بەراورد لەگەڵ دەوڵەتانی ((ئایدۆلۆژیا)) کە بە تەواوی دەستیان بەسەر ئابووریدا گرتووە، دەوڵەتەکانی جێگای باسی ئێمە، لە هەوڵی دەست بەسەرداگرتن و بەڕێوەبەریی تەواوی ئابووریدا نین، بەڵکو بەدوای کۆنترۆڵ و چاودێری هەر جۆرە جموجۆڵێکی ئابوورین. (دەوڵەتە دەستێوەردەرەکان، دەوڵەتە چاودێرەکان).

ئەزموونەکان دەریانخستووە کە ئابووریی دەوڵەتی (وەك سۆڤییەت) لە درێژخایەندا، بەشێوەیەکی حاشا هەڵنەگر لەگەڵ دابەزینی ئابووری و شکست بەرەو روو دەبن. (Lane, 1996).

هەرچەندە لەم سەردەمەدا ئاماژەکردن بەم دەوڵەتانە بەتایبەت لە بواری هەڵوێستی دژی مرۆڤانە و ئاسەوارە زیانبارەکانیان لەسەر ژینگە، زۆر باو نییە، بەڵام دەبێ بڵێین کە تەنانەت بە چاوپۆشی کردن لە دەستکەوتەکانی ئەم دەوڵەتانە لە بوارەکانی بارهێنان و تەندروستی کە نزیکە لە ئامارە رۆژئاواییەکان، رژێمەکانی سۆڤییەت و چین و (هەروەها کوبا) رۆڵی مێژوویی کاریگەریان لە هاوسانکردنی لایەنە جۆراوجۆرەکانی گەشەسەندن و مۆدێرنیزاسیۆن گێڕاوە.

بەکورتی دەبێ بڵێین کە ئەم دەوڵەتانە تیۆری مارکسیان پێچەوانە کردووە، چونکە بەپێی تیۆری مارکس کاپیتالیزم قۆناغێك پێش سۆسیالیزمە. (Warren, 1980) بەڵام مێژووی هەڵوێستی ئەم رژێمانە رەوتێکی پێچەوانە نیشان دەدا کە لەودا ((سۆسیالیزم)) وەك بناغەی کاپیتالیزم دیاری کراوە. کەوابوو، ئەو دەوڵەتەی کە ئێستا دەیخەینە بەرباس، جیاواز لە جۆری دەوڵەت لە سۆڤییەتە. ئەم دەوڵەتە، دەوڵەتێکە کە هێز و دەسەڵاتی پێویستی بۆ هەڵسوکەوت لە بازاڕی ئابووریدا هەیە و بە واتایەکی دیکە دەوڵەتێکە کە توانایی بەڕێوەبەریی بازاڕ بەو

(1) Chalmers Johnson.
(2) Plan – Ideological.
(3) Command Economics.





تایبەتمەندییانە کە پێشتر ئاماژەی پێکراوە هەیە و یان دەوڵەتێکە کە بە وتەی رابێرت وید ((چاودێری بازاڕ دەکا)). (Wade, 1990).

بەو دەوڵەتانەی کە خاوەنی ئەم تواناییانەن پێیان دەڵێن ((دەوڵەتی گەشەخواز))[1]. کەڵك وەرگرتن لەم چەمکە سەرەڕای ئەوەی نیشاندەری جیاوازی ئەوان لەگەڵ دەوڵەتە ئایدۆلۆژیاکان وەك سۆڤیەتی پێشوو و دەوڵەتە لیبراڵییە رۆژئاوایی و سۆسیال دیموکراتەکانە، نیشاندەری جیاوازی زۆری ئەم دەوڵەتە لەگەڵ لاوازترین دەوڵەتەکانی جیهانی سێهەمە کە ئێمە پێیان دەڵێین ((دەوڵەتە گەشەنەکردووەکان))[2]. لە نموونەکانی دەوڵەتە گەشە نەخوازەکان دەتوانین ئاماژە بە هائیتی لە سەردەمی دووالیر، زئیر لە سەردەمی مۆبۆتۆ و فلیپینی ژێر دەسەڵاتی حکوومەتی مارکوس بکەین کە تایبەتمەندییەکانیان بریتییە لە گەندەڵی، کارلێنەهاتوویی و هتد...، کە لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی گەشەنەکردوویی یان لە باشترین حاڵەتەدا ((گەشەسەندنی ناتەواو))[3].

بەڵام دەبێ بڵێین کە ((دەوڵەتە پەرەگرتووەکان)) ناتوانین موهەندیسی بکەین. ناتوانین ئەم دەوڵەتانە لە دەرەوەی چوارچێوەی بیرۆکە رۆژئاواییەکان پێك بێنین. مێژووی سیاسی ژمارەیەکی بەرچاو لە دەوڵەتە نوێیەکانی روو لە گەشەی دوای قۆناغی کۆلۆنیالیزم، ئەم باسە دەسەلمێنن. چونکە زۆربەی وڵاتە کۆلۆنیال کراوەکانی پێشوو کە ملیان بۆ رێوشوێنی دامەزراوەیی و یاسای پێشنیارکراوی داگیرکەران رانەکێشا، لە هەمان ساڵە سەرەتاییەکانی سەربەخۆیی، هەرەسیان هێنا. دیارە ئەم باسە بە مانای بێ بایەخ بوونی رۆڵی یاسا و دامەزراوەکان نییە. بەڵکو بەم مانایەیە کە ناتوانین دامەزراوەگەلێك جیا لە سیاسەت کە پێکهێنەرییەکی، کامڵبوونەکەی رێك بخرێ و ئەو گۆڕانکارییانەی کە سەرپەرشتی دەکرێ، راڤە بکەین.

بۆ پێداگری سەرلەنوێی گریمانەی سەرەکی ئەم کتێبە، دەبێ بڵێین کە دەوڵەتی گەشەخواز، وەك دەوڵەتەکانی دیکە، کارکردی سیاسەتەکانی پێوەندیدار بە سەرچاوەکانی گەشەسەندن و یان بەرهەمی گۆڕانی نیوەڕۆکی دەوڵەت لە شێوازێك بۆ شێوازێکی دیکە هەیە. ئەم بیرۆکەیە کە ((گەشەسەندنی بنەڕەتی)) دەتوانرێ جیا لە سیاسەت پێك بێ و بەردەوام بمێنێتەوە، بە تەواوی رەتدەکاتەوە. چونکە تا ئێستا هیچ جۆرە رێوشوێنێکی بنەڕەتی هەرچەند بە باشیش

(1) Devel opmental-State.
(2) Non-developmental State.
(3) Mal-developed.



گەلاڵەکرابێ لەوانە هەڵبژاردن، یاسایی، بەڕێوەبەریی و دادوەریی، لە ئارادا نەبووە کە بتوانێ لە بەرامبەر کاریگەریی لاوازکەری گەندەڵیی بەربڵاو، توندوتیژی، میلتاریزم و هێزە سیاسییە نەیارەکان کە بە ئاسانی دەتوانن ئەم رێوشوێنانە هەڵوەشێننەوە، خۆ رابگرێ.

بەکورتی دەبێ بڵێین، بەو جۆرەی کە زۆر بەڵگە وەك رووداوی کودەتا بێ ئەژمارەکان لە ٣٠ ساڵی دوایی سەدەی بیستەم نیشانی دەدا، هیچ گرووپێك لە دامەزراوەکان و یان هیچ شێوازێك لە بەڕێوەبەری بە ئەندازەی پێکهاتەی سیاسەت —کە پێکهێنەر و مایەی سەقامگیریی دەوڵەتی گەشەکردووە— لەم پێوەندییەدا کاریگەر نەبووە.

## گەشەسەندنی دیموکراتیك[1]

دووەمین گریمانە کە لەم کتێبەدا ئاماژەی پێدەکەین، لە پێوەندی لەگەڵ ئەم رەوشەیە کە گەشەسەندنی دیموکراتیك هەتا چەند بۆ کۆمەڵگا هەژارەکانی ئێستا دوورە دیمەنێکی لۆژیکیانە دەرەخسێنێ. بەمجۆرە من دەمهەوێ ئەم پرسیارە بێنمە گۆڕێ کە تا چەند دەرەتانی ئەوە هەیە کە پرۆسە سیاسییە دیموکراتیکەکان لەگەڵ پێویستییە گۆڕدراوەکان و ئاسەوارەکانی گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی و ئابووری تێکەڵ بکرێ؟ هەرچەند پێم باش بوو سەبارەت بەو رەوشە باس نەکەم، بەڵام پێم وایە خۆبواردن لەو پرسە ئیمکانی نییە.

بە درێژایی دەیەی ١٩٩٠ —پاش رووخانی جەمسەری کۆمۆنیزم— ئەم بابەتە کە دیموکراسی نە تەنیا یەکێکە لە تایبەتمەندییە دڵخوازەکانی گەشەسەندن، بەڵکو ئامرازێکە بۆ هێنانەدیشی، لە ناوەندی بیرۆکەی رۆژئاوا جێی کردەوە.

دەوڵەتە رۆژئاواییەکان و دامەزراوە نێونەتەوەییەکان وەك بانکی جیهانی، لەو وڵاتانەی کە ناچار بە دانی هەزینەی زۆری سیاسی و ئابووری نەبوون، یارمەتییە ماڵییەکانی خۆیان بەستبووە بە قەبووڵکردنی رەوشی سیاسی دڵخوازی خۆیان، بە مەبەستی هاندانی دەوڵەتی روو لە گەشە بۆ پێرەوی کردنی دیموکراسی و چاککردنی مافی مرۆڤ. ئەم بارودۆخە تایبەتمەندی جیانەکراوەی چەمکێکە کە ئەمڕۆ پێیدەڵێین ((حکوومەتی دڵخواز))[2]. (لە فەسڵی ٥ بە درێژی باسی دەکەین).

لێرەدا دوو پرسیاری پێوەندیدار بەڵام جیاواز هەن کە بە دوای وەرگرتنی وەڵامی ئەواندام. یەکەمین پرسیار پێوەندی بە دوورە دیمەنی دیموکراسی و یان بە دیموکراسی سەقامگرتوو و

(1) Democratic Development.
(2) Good Governance.





گونجاو له وڵاتانی روو له گەشەدا هەیە و ئەوەش ئەمەیە کە ئایا دیموکراسییەکانی ئەم دواییانە کە وەك بەشێك لە ((شەپۆلی سێهەم))ی دیموکراتیزاسیۆن پێك هاتوون، لە وڵاتانی روو لە گەشەدا بەردەوام دەمێننەوە؟ یان ئەوەی کە دەبێ چاوەڕوانی رەوتی گەڕانەوە لە دیموکراسی[1] —بەو جۆرەی کە لە دوو شەپۆلی پێشووی دیموکراتیزاسیۆن بە درێژایی ساڵەکانی شەڕ لە ئەوروپا و لە جیهان پاش قۆناغی کۆلۆنیالیزم دوای دەیەی ٦٠ روویدا، بین.

دووەمین پرسیار ئاماژە بەم بابەتە دەکا کە تا چەند دەوڵەتە گەشەکردووەکان دەتوانن دیموکراتیك بن و یان بە پێچەوانەوە، تا چەند دەوڵەتە دیموکراتیکەکان دەتوانن وەك دەوڵەتی گەشەکردوو هەڵسوکەوت بکەن؟

### دووره دیمەنەکانی دیموکراتیك

پێم وایە کە دوورە دیمەنی دیموکراتیك لە زۆربەی کۆمەڵگاکانی روو لە گەشە روون نییە، هەرچەند کە ئەم دوورە دیمەنە لە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکان جیاواز دەبن. من بە پێچەوانەی هیواکانم، پێم وایە کە بارودۆخی پێویست بۆ بەردەوامی دیموکراسی لە کۆمەڵگاکانی روو لە گەشە لە ئارادا نییە، چونکە تایبەتمەندیی دیموکراتیك لەواندا زۆر رواڵەتییە.

دیارە ئەم رەوشە هەموو دیموکراسییە نوێییەکان ناگرێتەوە و ئەم بابەتە ئامانجی باسەکانی دوایی منە هەتا نیشانی بدەم کە لە چ وڵاتێکدا دوورە دیمەنی دیموکراتیك باشتر و پۆزێتیڤترە.

### دیموکراسی و گەشەسەندن

دووەمین پرسیار کە لە فەسڵەکانی دوایی ئاماژەی پێ دەکەین، تایبەتە بە ئاستی سەرکەوتنی دەوڵەتە دیموکراتیکەکان لە پەرەپێدان و سەقامگیرکردنی گەشەسەندن. بە واتایەکی دیکە، دوورە دیمەنی دەوڵەتە گەشەکردووەکانی دێموکراتیك چۆنە؟ ئایا دێموکراسی و گەشەسەندن پێوەندییان پێوە هەیە؟ لە پێوەندی لەگەڵ ئەم پرسیارانە لێکۆڵینەوەیەکی باش بەرێوەچووە و بابەتێکی زۆر لەم بارەیەوە هەیە. لە پێوەندی لەگەڵ بابەتی ئاماژەکراو لە روانگەی ئەم کتێبەوە، لەسەر ئەو بڕوایەم دیموکراسی ((مۆنۆسیستمێك))[2] نییە کە کۆمەڵێکی تاك و یەك دەست لە ریزبەندی دامەزراوەیی و یاسایی بێ. پێشنیار دەکەم کە دەبێ

---

(1) Reversals of Democracy.

(2) Mono-System.



ئێمە چەمکی دیموکراسی شی بکەینەوە و شێوازە جۆراوجۆرەکانی دامەزراوەیی و سیاسی ئەو بناسین و پاشان کاریگەریی ئەوانە لەسەر تواناییەکانی گەشەسەندن لە جیهاندا راڤە بکەین. ئەم شێوازانە بریتین لە:

١- دیموکراسییە فرەحیزبی یا دوو حیزبییەکان.
٢- سیستەمە سیاسییە دیموکراتیکەکان کە دەوڵەت لەواندا لە رێگای هاوپەیمانییەوە پێکدێ.
٣- ئەو دیموکراسییانەی کە بە درێژایی ٢٠ یان ٣٠ ساڵی دوایی حیزبێکی دەسەڵاتدار بەردەوام لە هەڵبژاردنەکاندا سەرکەوتووە.

پێم وایە کە ((شێوازی تایبەتی دیموکراسی)) لە دیاریکردنی رێژەی دەستکەوتەکانی گەشەسەندن لەلایەن دەوڵەتەوە رۆڵی بنەڕەتی دەگێڕێ. بە لەبەرچاوگرتنی بابەتەکانی ئاماژەپێکراو من بەو ئاکامە گەیشتم کە هێزی گەشەسەندنی دەوڵەت لە دیموکراسییەکدا کە حیزبێك دەسەڵاتداربێ (وەك سەنگاپوور و بوتسوانا) لە چاو دیموکراسی هاوپەیمانی (وەك موریتس و هیند) و تەنانەت لەچاو ئەو دیموکراسییانەی کە حیزبە سیاسییەکان لە دەسەڵات دەستاودەست دەکرێن (وەك جامائیکا و کاستاریکا) زیاترە.

دیارە سەرەڕای بابەتی سەرەوە هۆکاری دیکەش دەستیان لە گەشەسەندندا هەیە. بۆ وێنە دەتوانین ئاماژە بە هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان وەك چین، قەومییەت، مەزهەب و پێکهاتەیەك لەوانە بکەین کە پێکهێنەری هێزە سیاسییە تایبەتییەکانن کە زۆرتر کاریگەرییان هەیە لەسەر شێوازەکانی دامەزراوەیی و سیاسی کە دیموکراسی رەنگە بەخۆیەوە بگرێ و لەم رێگایەوە کاریگەریش دادەنێ لەسەر توانایی گەشەخوازیی دەوڵەت.

هیوادارم کە لەم بەشەدا بتوانم بەپێداگرتن لەسەر گریمانەی سەرەکی ئەم کتێبە ((ئەولەوییەتی سیاسەت لە گەشەسەندن)) پرسە پێوەندیدارەکان بە گەشەسەندنی دیموکراتیك شی بکەمەوە.

### خوێندنەوەیەك لەسەر گەشەسەندن و زانستی سیاسی

سێهەمین بابەتی تەواوکەر بەڵام گرینگ کە لەم کتێبەدا ئاماژەی پێکراوە، پێوەندییەکی کەمی لەگەڵ سیاسەتەکان و رەوتە بنەڕەتییەکانی گەشەسەندن هەیە و زۆرتر پێوەندی بە چۆنیەتی خوێندنەوە و شیکردنەوەی ئەم رەوتانە و سیاسەتانە هەیە.

کەوابوو وادێتە بەرچاو بیرۆکەگەلی ئەوتۆ پێش ئەوەی جێگای پەسەندی دارێژەرانی سیاسەت بێ زۆرتر بووەتە جێگای سەرنجی زانکۆیەکان و فێرخوازانی بەشەکانی گەشەسەندن و سیاسەت.





هەروەك پێشتر ئاماژەم پێکردووە، ناتوانین پێ لەسەر بەناوەندی بوونی سیاسەت لە گەشەسەندندا دابگرین. چونکە لە ماوەیەکی زۆر دوور و درێژدا، لێکۆڵینەوەی تایبەت بە گەشەسەندن جیا لە پرس و بابەتەکانی زانستی سیاسی بەتایبەتی و لە ئاستێکی بەربلاوتردا جیا لە زانستی کۆمەڵایەتی بەرێوەچووە. بەپێی روانگەی هەندێك لە زانایان (Apter, 1980, Seers, 1979) لێکۆڵینەوەی تایبەت بە گەشەسەندن بەگشتی لە دەرەوەی بەشە سەرەکییەکانی زانستی کۆمەڵایەتی بەرێوەچووە.

کەسانێك کە لە بواری لێکۆڵینەوەی پێوەندیدار بە گەشەسەندن چالاکن، زۆرتر بەشێوەی سەمبۆلێك لە بینا و مەکتەبە جیاوازەکاندان و هەندێك جار پێوەندی هزریشیان لەگەڵ بەشە سەرەکییەکانی خۆیان لەدەست دەدەن.

زۆرتر ئەم لێکۆڵینەوانە لە لێکۆڵینەوە ناوچەییەکان وەرگیراوە (ئەم بەشەش لە دەیەی ٦٠ و ٧٠ گەشەیەکی باشی کردبوو) ئۆگری بە لێکۆڵینەوە و راوێژکردن هەیە لە پێوەندی لەگەڵ ناوچە دوورکەوتووەکان کە خاوەنی زمانی زۆر دژوار و فەرهەنگی سەیر و سەمەرە و نائاسایی و تایبەت بە خۆیان هەیە.

بەمجۆرە، چەندین جۆری جیاوازی لە پێکهاتەکان، میتۆدۆلۆجیاکان و تیۆرییەکان بۆ روونکردنەوەی بارودۆخی تایبەتی وڵاتانی روو لە گەشە پێك هاتووە (Sklar, 1995) و بڵاوکراوەکان، کۆنفرانسەکان، قوتابخانەکان، دامەزراوەکان و بوارەکانی خوێندنی باڵا لە پێوەندی لەگەڵ لێکۆڵینەوەی گەشەسەندن و لێکۆڵینەوەی ناوچەیی رێژەیان چووە سەرەوە و پەرەیان ئەستاندووە. هەندێك لەم هەڵوێستانە لە ئاکامی رێوشوێنی زانکۆکان بوو و بەڵام هەندێکی دیکەیان بە زۆری لەسەر توێژینەوە سیاسییەکان جێگیرکرابوون و هەندێکی دیکەشیان پێیان لەسەر راهێنان یان راهێنانی پێشکەوتوو بۆ ئەو کەسانەی لەو بوارەدا چالاکن، دادەگرتەوە. خاڵێکی دیکە ئەمەیە، گەرچی ئابووریناسان لەم دامەزراوانەدا بەشداربوون، بەڵام کۆمەڵناسان، جوگرافیناسان، ئانترۆپۆلۆجییەکان، ژمارەیەکی کەم لە زانایانی زانستی سیاسی و دارێژەری سیاسەتی گشتی و چەندین جۆری جیاواز لە پسپۆڕان لە بوارە جۆراوجۆرەکان لە کشتوکاڵی و گەشەسەندنی گوندەکانەوە بگرە هەتا دەگاتە چاودێری تەندروستی و بارهێنان و حەشیمەتناسی تێیدا دەبینرێ.

دیارە هیچ کەس نابێ دەستکەوتی ئەم کردەوانە بە کەم بگرێ. ژمارەی یەکجار زۆری کتێبەکان، وتارەکان و راپۆرتەکانی پێوەندیدار بە وڵاتە جۆراوجۆرەکان، بابەت و تیۆرییە



جیاوازەکان، لە تایبەتمەندی ئەم دەستکەوتانەیە. لەم قۆناغەدا تیۆرییەکان و لایەنی راڤەیی سەرنجراکێش لەوانە مۆدێرنیزاسیۆن، تیۆری بەستراوەیی و چەندین جۆری جیاواز لە تیۆرییەکانی نێو مارکسیستەکان دروست بوون و پەرەیان ئەستاندووە.

لە بواری سیاسەتیشدا، چەندین لایەن لە چوارچێوەی ستراتیژیك لە پێوەندی لەگەڵ زۆر بەشی گەشەسەندندا پێکهاتوون لەوانە: دابەشکردنی سەرلەنوێی سەرچاوەکان هاورێ لەگەڵ هەڵدان، گەشەسەندنی گوندەکان، هاوسانکردنی پێکهاتەیی و لەم داوییانەش حکوومەتی دڵخواز.

ئەم ئۆرتۆدۆکسانە سەرەتا زۆر بە گەرمی پێشوازییان لێکرا بەڵام دواتر بەرە بەرە، وەلانران. چونکە وەك خاڵی لاوازی خوێندنەوەی گەشەسەندن چاویان لێدەکرا کە نیشاندەری کامڵ نەبوون و کەموکوڕی تیۆری ئەم خوێندنەوەیە بووە. دەتوانین بڵێین کە خوێندنەوەی گەشەسەندن تاڕادەیەك هەمان زانستی کۆمەڵایەتییە و زانستی کۆمەڵایەتیش هەمان خوێندنەوەی پەرەسەندنە. کەوابوو گرینگترین پرسیارگەلێك کە گەورەترین بیرمەندانی زانستی کۆمەڵایەتی ئاماژەیان پێکردووە، هەمان پرسیاراتێك بووە کە تیۆرییە پێوەندیدارەکان بە خوێندنەوەی گەشەسەندن، تاوتوێی دەکەن.

لە سەردەمی دوتوکویل و ئادام سمیت هەتا ئیسپێنسر، ماین، مارکس، دورکهایم، تونیش، ڤیبەر، شومپیتر و کیتر، ئەم پرسە کە کۆمەڵگاکان چۆن پەرەدەستێنن و چۆن ئەم رەوتانە تەشەنە دەکەن، بەردەوام لە لایەن ئەم زانایانەوە تاوتوێ کراوە.

بەڵام ئەم بابەتەش راستە کە خوێندنەوەی پێوەندیدار بە سیاسەتەکانی گەشەسەندن تاڕادەیەك جیا لە رەوتی سەرەکی بواری سیاسەت یان زانستی سیاسی، پەرەی ئەستاندووە.

هاوتەریب لەگەڵ ئەو، بەشی سیاسەتیش بەبێ سەرنجدان بەو هەڵوێستانەی لە پێوەندی لەگەڵ سیاسەتەکانی گەشەسەندن گیراون، بەرەو پێش چووە. هەروەك پێشتریش لە شوێنەکانی دیکە ئاماژەم پێکرد ((زۆریش بێ جێ نییە ئەگەر بڵێین کە زانایانی گەورەی سیاسی، سیاسەتەکانی گەشەسەندنیان نە تەنیا وەك پسپۆڕییەك بەڵکو تەنانەت وەك بەشێکی جیاواز و سەرتر لە زانستی سیاسی چاولێکردووە)). (Leftwich, 1990) بۆ سەلماندنی ئەم بابەتە دەتوانین ئاماژە بەم راستییە بکەین کە لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٧ هەتا ١٩٩٠، تەنیا کەمتر لە ٥ لە سەد لە بابەتە بڵاوەکان لە گرینگترین بڵاوکراوەی سیاسی بەریتانیا وەك ((خوێندنەوەی سیاسی)) پێوەندی بە بابەتەکانی پێوەندیدار بە سیاسەتەکانی گەشەسەندنەوە بووە.

ئەم ئاماره له ((گۆڤاری سیاسی بەریتانیا))[1] که له ساڵی ١٩٧١ دامەزراوه، تەنانەت کەمتره. نورمان چیستێر[2] له وتارێکدا که له ساڵی ١٩٧٥ به بۆنەی بیست و پێنجەمین ساڵی بڵاوبوونەوەی گۆڤاری ((خوێندنەوەی سیاسی)) نووسیبووی، بەشێوەیەکی گاڵتەجارانه ئاماژەی بەوه کردبوو که لێکۆڵینەوەکانی تایبەت به خوێندنەوەی ناوچەیی و پێوەندی نێونەتەوەیی دەتوانێ بەهۆی کەسانێك که خولی بنەڕەتی لەپێوەندی لەگەڵ سیاسەت و حکوومەتیان نەدیتووه، بەڕێوەبچێ و له هەر حاڵەتێکدا ئەم بەشانه هەوڵ دەدەن که کەسانێکی ئەوتۆ له باسی سەرەکی بابەتی ئێمه دوور رابگرن (Chester, 1995) تەنانەت ئەگەر پێموابێ ئەم راوبۆچوونه لەڕادەبەدەر گەوره کراوەتەوه، ئاشکرایه که رەوتی سەرەکی خوێندنەوەی سیاسی و خوێندنەوەی تایبەت به سیاسەتەکانی گەشەسندن به تەواوی لێك جیاوازن و لەبەر ئەم هۆیەش دەستکەوتەکانیان پێوەندییەکی ماناداری لەگەڵ یەکتردا نییه.

دیاره لەم دواییانەدا ئەم رەوشه گۆڕانی بەسەردا هاتووه و هێماگەلی باش له پێکهێنانی پێوەندی و تێکەڵاوی ئەم سیاسەته و خوێندنەوەی تایبەت به گەشەسەندن دەبینرێ.

بەکورتی دەبێ بڵێین که رەوتی مێژووی هاوکاتی ئابووری جیهانی و مێژووی سیاسی مرۆڤ و تیۆرییه جۆراوجۆرەکان که له هەوڵی راڤەکردنی دان دووکاردانەوەی سەرەکی بەدواوه بووه. یەکەم، به کەمبوونەوەی جیاوازی خوێندنەوەی سیاسی و خوێندنەوەی تایبەت به گەشەسەندن له جیهانی سێهەم یارمەتییەکی بەرچاوی کردووه. دووەم لەگەڵ هەموو کەموکوڕییەکانی بووەته هۆی ئەوەی که خوێندنەوەی تایبەت به گەشەسەندن له رەوتی سەرەکی زانستی سیاسی جێی خۆی بکاتەوه.

له کۆتاییدا دەبێ ئاماژه بەوه بکەین که له هەموو فەسڵەکانی ئەم کتێبەدا بابەتی پێوەندیدار به گەشەسەندن و بەتایبەتی رۆڵی دەوڵەت لەودا، وەك بەشێکی جیانەکراوه له زانستی سیاسی لەبەرچاو گیراوه.

### پێکهاتەی کتێب

بابەت و تیۆری جۆراوجۆر له فەسڵەکانی ئەم کتێبەدا هاتووەته بەرباس. لەوەی که ناسینی چەمکەکان بۆ تێگەیشتنی بابەتەکانی ئەم کتێبه گرینگییەکی تایبەتی هەیه له فەسڵەکانی ٢ و ٣دا لایەنه جیاوازەکان له پێوەندی لەگەڵ ((ماناکانی گەشەسەندن))[3]م تاوتوێ کردووه. له

(1) British Journal of Political Science.
(2) Norman Chester.
(3) Meaning of Development.



فەسڵی ٤یشدا به سەرنجدان به ناکامییەکانی گەشەسەندن[1] له وڵاته جۆراوجۆرەکان، تیۆرییەکانی پێوەندیدار به رۆڵی دەوڵەت له جیهانی سێهەم راڤه دەکەم.

پاش ئەوەی که له کۆتایی دەیەی ٨٠، دامەزراوه نێونەتەوەییەکانی گەشەسەندن بەو ئاکامه گەیشتن که دەوڵەت و بوروکراسییه ئیدارییەکەی رۆڵی گرینگی له سەرکەوتنی گەشەسەندندا هەیه، پاش ئەوه سیاسەتەکانی خۆی لەسەر ئەم بنەمایه دارِشت که وڵاتانی روو له گەشه، به بوونی حکوومەتێکی دڵخواز دەتوانن دەستیان به گەشەسەندن رابگا.

له فەسڵی ٥ دا، به ئاماژەکردن بەم ئەنجامەی رێکخراوه نێونەتەوەییەکان له دەیەی ٨٠، ئەم پرسه تاوتوێ دەکەم که حکوومەتی دڵخواز له کردەوەدا چ مانایەکه و شێوازەکانی دامەزراوەیی، سیاسی و بەڕێوەبەرییەکەی چۆنه.

رەوتێکی هزریی دیکەش پێیان وایه که حکوومەتی دڵخواز به تەنیایی ناتوانێ ببێته هۆی پێکهێنان و بڵاوبوونەوەی گەشەسەندن له وڵاتانی دواکەوتوودا، بەڵکو ((حکوومەتی دڵخوازی دیموکراتیك))[2] بواری پێویست بۆ پێکهێنانی گەشەسەندن دەرەخسێنێ. له فەسڵی ٦ دا، به سەرنجدان بەم رەوته هزرییه، ئاماژەم به رەهەنده جیاوازەکانی گەشەسەندن و دیموکراسی، له وڵاتانی جیهانی سێهەم و حکوومەتی دڵخواز کردووه. لەم فەسڵەدا ئەم بەڵگەیەم خستۆتەڕوو که سەرهەڵدانی دیموکراسی له وڵاته جۆراوجۆرەکان پێویستی به پێکهاتەیەکی تایبەت له بارودۆخ و بوارەکاندا هەیه و رەوشێکی ئەوتۆ له زۆربەی وڵاتانی روو له گەشه بەرچاو ناکەوێ. بەم جۆره بەو ئاکامه گەیشتم که ئەگەر بڕیاربێ، گەشەسەندن[3] یان له ئاستێکی نزمتر هەڵدان[4]، له وڵاتانی جیهانی سێهەم بێتەدی، ئەم کاره پێویستی به سیستەمێکی سیاسی تایبەتی هەیه که من پێی دەڵێم ((دەوڵەتی گەشەخواز)).

فەسڵی ٧ یش تایبەته به راڤه و هەڵسەنگاندنی بارودۆخ و بوارەکانی سەرهەڵدانی دەوڵەتی گەشەخواز و تایبەتمەندییەکانی ئەم دەوڵەته. له فەسڵی ٨یش به سەرنجدان بەوەی که دیموکراسی و گەشەسەندن پێکەوه، بۆ ئاسایشی مرۆڤایەتی گرینگه، ئاستی دیموکراتێك بوونی دەوڵەتەکانی گەشەخوازم هەڵسەنگاندووه، سەرئەنجام له فەسڵی ٩ دا که فەسڵی کۆتایی کتێبەکەیه، به کەڵك وەرگرتن له دۆزراوەی فەسڵەکانی پێشتر بەم ئاکامه گەیشتم که ئەولەوییەتی سیاسەت له گەشەسەندن و رۆڵی دەوڵەت له گەشەسەندن شتێکی پێویسته.

(1) Development Failure.
(2) Democratic Good Governance.
(3) Development.
(4) Growth.





# فەسڵی دووەم

**پێشکەوتن**[(1)]**، هەڵدان و مۆدێرنیزاسیۆن**[(2)]: کورتە مێژووی بیرۆکەی گەشەسەندن لە باسەکانی گەشەسەندندا، نە تەنیا شێوازەکانی دەستڕاگەیشتن بە گەشەسەندن نێوەڕۆکێکی سیاسی هەیە، بەڵکو بیرۆکەی گەشەسەندن و پێناسەی ڕەوتەکەیشی خاوەن نێوەڕۆکێکی سیاسییە.

هەرچەند وادێتە بەرچاو لە باسەکانی ڕۆژانەدا لە پێوەندی لەگەڵ ((گەشەسەندن)) پێناسەیەکی گشتی هەیە، بەڵام لەڕاستیدا چەمکی ڕاستەقینەی ئەم وشەیە زۆر جیاوازە لەو وێنەیە کە سەبارەت بەو هەیە، چونکە ئەم وشەیە بەشێك لەو چەمکانەیە کە بە شێوەیەکی بنەڕەتی باس هەڵگرە و ڕەنگە هیچ کات لە پێوەندی لەگەڵ پێناسەیەکی ورد بۆ ئەو چەمکە کۆدەنگییەك پێکنەیەت.

بەڵام وەك بیرۆکەی ((پێشکەوتن)) شێوازێك کە بەو پێیە ((گەشەسەندن))ی پێ پێناسە دەکرێ، لە دروست بوونی ئامانجە ستراتیژییەکان و ئامانجەکانی سیاسەتی گەشەسەندن و هەڵسەنگاندنی ئاسەوارەکانی، ڕۆڵێکی گرینگی هەیە. هەرچەند باسی تیۆرێك لە پێوەندی لەگەڵ گەشەسەندن ڕەنگە تاڕادەیەك وشك و لە بنەڕەتدا زانکۆیی بێتە بەرچاو، بەڵام پێم وایە کە بیرکردنەوە لەو بارەیەوە یەکەمین هەنگاوی پێویستە بۆ لێکدانەوەی گەشەسەندن و بە دوو هۆی سەرەکی لەم بەشەدا ئاماژەی پێدەکەین. یەکەم لەبەر ئەوەی کە ((گەشەسەندن)) ڕەوتێکی تەکنیکی نییە کە لەودا ژمارەیەك لە بەشەکان کۆبکرێنەوە پاشان بەکاربهێنرێن، بەڵکو هەروەك چۆن لە فەسڵی پێشوودا شیکرایەوە، ڕەوتێکی سیاسییە.

دووەم، ئەم باسانە وەبیرمان دێنێتەوە کە لە سیاسەتەکانی گەشەسەندن (لەڕاستیدا لە هەر جۆرە سیاسەتێکدا) باس لە پێوەندی لەگەڵ ئامرازەکان، ئاکامەکان، ئامانجەکان و سیاسەتەکان، بەشێوەیەکی حاشاهەڵنەگری ڕێگاکان دەکرێ، چونکە بەردەوام ئۆگری و بەها جیاوازەکان بە دوای سەپاندنی ئەولەوییەتەکانی خۆی لە پێناسە، نێوەڕۆك و ئاڕاستەی ستراتیژییەکانی گەشەسەندن دایە.

(1) Progress.
(2) Modernization.



لەڕاستیدا یەکێك لەو ڕەخنانەی کە لە ((گەشەسەندن)) چ وەك چەمك و چ وەك شێوازێك گیراوە ئەمەیە کە پێناسە و سیاسەتەکانی پێوەندیدار بە گەشەسەندن، هەڵقولاوی بیرۆکەی ڕۆژئاوایە و ئەزموونەکانی کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی و (زۆرتر سەرمایەداریی ڕۆژئاوایی) لەخۆ دەگرێ. سەرەڕای ئەمەش، ڕەخنەگران پێیان وایە کە مۆدیلەکانی گەشەسەندن، لەلایەن دامەزراوە ڕۆژئاواییەکان کە خاوەنی دەسەڵات و سەروەتێکی زۆرن گەڵاڵە دەکرێ و بەڕێوەدەچێ کە بەم جۆرە ستراتیژییەکان و بیروبۆچوونی ڕۆژئاوایی گەشەسەندن، بەسەر کۆمەڵگا ناڕۆژئاواییەکان دەسەپێنن.

بەکورتی ڕەخنەگران، بەڵگە دێننەوە کە ((گەشەسەندن)) لە چەمك و شێوازدا، لەگەڵ نوسخەی هاوچەرخی ئابووری، سیاسەت و فەرهەنگی ڕۆژئاوایی و ئایدۆلۆژیای ئیمپریالیستی یەکێکە. (Crush, 1995) من لە فەسڵی ٣ دا ئەم ڕەخنانە تاوتوێ دەکەم.

مەبەستی ئەم فەسڵە، هەڵسەنگاندنی هەندێك لە گرینگترین لایەنەکان لە تێگەیشتنی چەمکی گەشەسەندنە کە وەك پێشەکییەکە بۆ فەسڵی دواتر و لەودا پێناسەی وشەی ((گەشەسەندن)) لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم لێکدەدەینەوە.

دیارە مەبەستی ئەم دوو فەسڵە ڕیشەناسیی مێژووی بیرۆکەکانی گەشەسەندن نییە بەڵکو هیوادارم کە باسەکانی ئەم دوو فەسڵە، بە زەقکردنەوەی ئەوەی کە ((بیرۆکەی سەرەتایی گەشەسەندن)) سیاسییە، یارمەتییەکم بە ڕوونبوونەوەی باسەکانی ئەم کتێبە کردبێ.

دیارە دەبێ ئاماژە بەوە بکەم لەم فەسڵەدا زۆرتر سەرنجم داوەتە سەر چەمك و خاڵی جێگیربوونی ((گەشەسەندن)) و باسی تیۆرییەکانی پێوەندیدار بەو ناکەم. هەرچەند لە هەندێك حاڵەتدا ئەم دوو باسە یەکتر دەگرنەوە.

هەریەك لە ماناکانی گەشەسەندن کە لەم فەسڵە و فەسڵەکانی دوایی تاوتوێ دەکرێ، شێواز[(1)] و کاریگەری[(2)] هەمەچەشنی هەیە. دیارە لە زۆر بواردا مانا جیاوازەکان خاوەنی خاڵی هاوبەشن یان لەگەڵ یەك تێکەڵ دەبن و یان کاریگەری لەسەر یەکتر دادەنێن. بەڵام لە حاڵی حازردا، مەبەستی من، پێداگرتنە لەسەر تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی هەریەك لە ماناکان، بەمەبەستی جیاکردنەوەیان لە یەکتر و دەستنیشانکردنی جیاوازییەکانی نێوانیان.

(1) Forms.
(2) Expressions.





دەتوانین گرینگترین چەمکەکانی گەشەسەندن لەنێو لایەنەکانی خوارەوە ببینینەوە:

- گەشەسەندن بە مانای پێشکەوتنی مێژوویی.
- گەشەسەندن بە مانای کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوە سروشتییەکان.
- گەشەسەندن بەمانای پێشکەوتنی ئابووری بەرنامە بۆ دارێژراو و (هەروەها) کۆمەڵایەتی و سیاسی.
- گەشەسەندن بە مانای بارودۆخ[١].
- گەشەسەندن بە مانای پرۆسەیەك[٢].
- گەشەسەندن بە مانای گۆڕانی پێکهاتەیی.
- گەشەسەندن بە مانای مۆدێرنیزاسیۆن.
- مارکسیزم و گەشەسەندن وەك بەرزکردنەوەی هێزە بەرهەمهێنەرەکان گەشەسەندن وەك پێشکەوتنی مێژوویی.

وشەی ((گەشەسەندن)) بەردەوام لەگەڵ وشەی ((پێشکەوتن))[٣] پێوەندی بووە. ئەم پێوەندییە لە بنەڕەتدا خاوەن رابردوویەکی مێژوویی لە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکانە. بەو جۆرەی کە کاون[٤] و شینتۆن[٥] پێیان وایە، گەشەسەندنیش وەك کاپیتالیزم پرۆسەیەکی کامڵبوونی تێپەڕکردووە. بەڵام ((پێشکەوتن)) بە چ مانایەکە؟ سەرەڕای چەندین مانای کەم تا زۆر روون، روانینی مۆدێرن بە ((پێشکەوتن)) لە بنەڕەتیدا، بیرۆکەیەکی فەلسەفییە کە ریشەی لە ئەورووپای پێش رێنێسانسی سەدەی ١٧ و ١٨دا هەیە.

بیرۆکەی پێشکەوتن وەك رەوتێکی بەردەوام، دڵنیاکەر و نەوەستاو، بەهۆی بەکارهێنانی وزە و زانایی مرۆڤ لە تێگەیشتنی گۆڕانکارییەکانی جیهانە. ئەم روانگەیە رەنگە لەگەڵ روانگەکانی دیکە سەبارەت بە پێشکەوتن لەوانە بیرۆکەکانی گریکو-رومان[٦] لە دژایەتی دابێ. ئەگەرچی ئەم بیرۆکانە بریتییە لە هەندێك لە توخمەکانی پێشکەوتنی زانستی، بەڵام لە بەراورد لەگەڵ بیرۆکەی ((گەشەسەندن بە مانای پێشکەوتنی مێژوویی)) کەمتر خاوەنی بەردەوامی و روانینی پۆزەتیڤانەیە[٧].

---

(1) Development as a Condition.
(2) Development as a Process.
(3) Progress.
(4) Gowen.
(5) Shenton.
(6) Greaco-Roman Nations.
(7) Optimistic.



بیرۆکەی نوێی گەشەسەندن وەك پێشکەوتنی مێژوویی، لە سەدەی ١٨ بە دواوە، لە بوارەکانی کۆمەڵایەتی، ئابووری و دواتریش سیاسی خۆی نیشان داوە. گرینگترین نموونەی ئەم بیرۆکەیە دەتوانین لە نووسراوە کلاسیکەکانی ئادام ئیسمیت سەبارەت بە ئابووری سیاسیدا ببینین. (Pokkard, 1968, p.60-70).

هەروەها ئەم بیرۆکەیەش دەتوانین لە تیۆرییە کۆمەڵایەتییەکانی مۆدێرنیزاسیۆن لە سەرەتای سەدەی ١٩ و بیرۆکەی سەرەڕۆیانەی مارکسیستیدا ببینین. (Harrison, 1988, Hobsbawm, 1964).

لە بیرۆکەی (پێشکەوتنی مێژوویی)، گۆڕانکارییەکانی تایبەت بە گەشەسەندن، لە بنەڕەتدا وەك رەوتێك بەهۆی کردەوەکانی مرۆڤەوە سەیر دەکرێ. هەڵسەنگاندنی جۆراوجۆر لە پێوەندی لەگەڵ ئەم رەوتانە دەکرێ کە بریتییە لە کەڵك وەرگرتن لە رەوتە زانستی و عەقڵانییەکان، ئازادبوونی توانا تیجارییەکانی خەڵك لە سنووری دەوڵەت، رەوتی تەکنیکی و دارشتنی بەرنامەی ئابووری. هەندێك جاریش ئەم رەوتانە بەهۆی گۆڕانکاری پێشکەوتوو لە پێوەندی سیاسی و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لێکدەدرێتەوە.

دیارە هەڵسەنگاندنی ئەوتۆ لە گەشەسەندن وەك پێشکەوتن، تارادەیەکی زۆر لە ئەزموونی ئەورووپییەکان وەرگیراوە. ئەم خوێندنەوەیە لە گەشەسەندن، بەدوای باشبوونی رەوشی ماددی، تێگەیشتنی زانستی، ئازادییەکانی تاکە کەس، بەرامبەری و سەربەخۆیی هاتووە.

ئەم خوێندنەوەیە، کاریگەرییەکی زۆری لەسەر مانا ئەمڕۆییەکانی گەشەسەندن داناوە.

گەشەسەندن بە مانای کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوە سروشتییەکان.

بەو جۆرەی کە ئارنێت[١] ئاماژەی پێ دەکا، دووەمین مانای گەشەسەندن، ریشەی لە ئەزموونی کۆلۆنیالیزمی ئەورووپی لە ئەمەریکای لاتین لە سەدەی ١٦ و دواتریش لە ئاسیا، ئەفریقیا و کارائیب لە سەدەی ١٩ و ٢٠ دا هەیە. پێداگریی سەرەکی ئەم هەڵسەنگاندنە لە گەشەسەندن، لەسەر هەڵێنجان و کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی سروشتی وڵاتە داگیرکراوەکانە.

لە راستیدا، لە سەدەی ١٦ تا ١٩، هێزە کۆلۆنیالییەکانی ئەورووپی، دەستیان بە پەرەپێدانی ناوچە داگیرکراوەکاندا گرت و لە رێگای هەڵێنجان و کەڵك وەرگرتن لە ماددە جۆراوجۆرەکان لەوانە ئاڵتون توانیان پێشکەوتن و گەشەسەندن بە دەست بێنن و لەلایەکی دیکەوە بووە هۆی بڵاوبوونەوەی (گەشە نەکردوویی) لە ناوچە داگیرکراوەکان. (Frank, 1971, Stavrianos, 1981)

---

(1) Arndt.





خاڵێکی سەرنجڕاکێش ئەمەیە، دەسەڵاتە کۆلۆنیالییەکان، رایاندەگەیاند کە لە هەوڵی هەڵدان و پێشکەوتنی خەڵکی ناوچە داگیرکراوەکاندان. بۆ نموونە لیئۆپۆڵدی دووەم[1] پاشای بەلجیکا، هۆی داگیرکردنی کیشوەری ئەفریقیای بۆ ((پەرەپێدانی شارستانییەت لە بەشێك لە جیهان کە هێشتا دواکەوتوون)) گێڕایەوە و سەرنجڕاکێشتر ئەوەی کە، دروست لە سەردەمی کۆلۆنیالیزمی بەلجیکا لە کۆنگۆ بوو کە سەرچاوەکانی ئەم وڵاتە بەتاڵان بران و لەگەڵ خەڵکەکەی بە شێوەیەکی دڕندانە هەڵسوکەوتیان دەکرد. (Hochshild, 1998, p.44)

دیارە هۆکاری دیکەش بۆ کۆلۆنیالیزم هەبوون کە بریتی بوون لە ((چاوچنۆکی داگیرکەران بۆ پاراستن و گەشەپێدانی ئیمپراتۆری)). جیا لە هۆکارە جیاوازەکانی داگیرکەران، گەشەسەندن لە روانگەی داگیرکەران بەمانای کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی سروشتی وڵاتە داگیرکراوەکان لە پێناوی بەرژەوەندی دیاریکراوی ئەواندا بوو. (Arndt, 1987, p.24)

لە بەریتانیاوە، بیرۆکەی گەشەسەندن لەگەڵ ئاسایشی خەڵکی ناوچە داگیرکراوەکان، لە کۆتایی قۆناغی کۆلۆنیالیزمی ئەم وڵاتە، بە شێوەیەکی فەرمی لە یاساکانی ئەم وڵاتە گونجێندرا. لە ساڵی ١٩٤٠ بۆ یەکەم جار ((یاسای گەشەسەندن و ئاسایشی وڵاتە داگیرکراوەکان))[2] بە مەبەستی گەشەسەندن و ئاسایشی خەڵکی ناوچە داگیرکراوەکان لە جێگای یاسای گەشەسەندنی ناوچە داگیرکراوەکانی ساڵی ١٩٢٩ دانرا.

بیرۆکەیەکی ئەوتۆ لە فەرەنساش بوو، بەڵام تیۆری گەشەسەندن لەگەڵ ئاسایش یان پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیی خەڵکی ناوچە داگیرکراوەکان، لە کردەوەدا زۆر لاواز و تەنیا لە ئاستی قسەدا بوو. تەنانەت لە ساڵی ١٩٤٥یش کاتێك کە بانکی جیهانی خەریکی دارشتنی ئامانج و پرۆگرامەکانی خۆی بوو، لەسەر ئەم بڕوایە بوو کە هەڵدان و گەشەسەندن لە وڵاتانی کەمتر گەشەکردوو دەبێ لە رێگای زیادکردن و پەرەپێدانی هەڵێنجان و هەناردەی کەرەسەی خاو و سەرچاوە سروشتییەکانی ئەم وڵاتە بەرێوە بچێ. (IBRD, 1989)

پێداگری بانکی جیهانی لەسەر گەشەسەندنی سەرچاوە سروشتییەکانی ئەم وڵاتانە، بووە هۆی ئەوەی کە تێبینییەکانی پێوەندیدار بە ئامانجەکانی ئاسایش و کۆمەڵایەتی بخرێتە پەراوێزەوە و هیچ بایەخێك بە ئامانجی سیاسی نەدرێ. سێ تایبەتمەندی گرینگی ئەم هەڵسەنگاندنە لەسەر گەشەسەندن، بریتیین لە:

(1) LeoPold (II).
(2) Colonial Development and Welfare Act.



١- گەشەسەندن وەك کاڵایەکە کە لە لایەن وڵاتانی پێشکەوتوو بۆ ناوچە داگیرکراو و دواکەوتووەکان رادەگوێزرێ.

٢- وڵاتانی داگیرکراو و دواکەوتوو بە هۆی نەبوونی زانایی، توانایی و سەرمایە، بە تەنیایی نەیاندەتوانێ گەشەسەندن بێننەدی.

٣- راگواستنی گەشەسەندن لە لایەن وڵاتانی پێشکەوتوو (کۆلۆنیالیزم) بۆ ناوچە دواکەوتووەکان (داگیرکراو) بووە هۆی ئازادبوونی وزەکانی ئەم وڵاتانە، کە هەردوو گرووپی داگیرکەر و داگیرکراو قازانجیان لێکرد.

سەبارەت بە سێهەمین تایبەتمەندی، لۆگارد[1]، پێی وایە کە دەسەڵاتی کۆلۆنیالیزم دوو بەرپرسایەتی سەرەکی لە وڵاتە داگیرکراوەکاندا لەسەر شانە. یەکەم، بەرپرسایەتییەکی ئەخلاقی بۆ هێنانەدی چەندین ئامانج لەوانە پێکهێنانی سیستەمێکی دادوەری، بارهێنان و پەروەردەی لەبار، باجی عادیلانە و پشتیوانی لە وەرزێران. دووەم، بەرپرسایەتییەکی ماددی بۆ پەرەپێدانی سەرچاوە سروشتییەکان، بە مەبەستی سوود وەرگرتنی خەڵکی ناوچە داگیرکراوەکان و وڵاتانی داگیرکەر. (Lugard, 1923, pp.58-62)

٢٠ ساڵ پێش لە لۆگارد، ئابووریناسی لیبراڵ، جۆن هابسۆن، لە کتێبی خۆی لە ژێر ناوی ((ئیمپریالیزم)) بیرۆکەی سوود وەرگرتنی لایەنی بەرامبەری کۆلۆنیالیزمی، رەتکردووەتەوە.

هەڵسەنگاندنێکی ئەوتۆ لە گەشەسەندن، کاریگەرییەکی زۆری لەسەر ئاسەوار و بیرۆکەکانی دوایی لەم پێوەندییەدا، بەجێهێشتووە. بە جۆرێك لە سەرەتای دەیەی ٦٠، ئەم تیۆرییە جارێکی دیکە لە یەکێك لە کتێبە کلاسیکەکاندا، لەژێر ناوی ((داهاتووی وڵاتانی گەشە نەکردوو)) لە لایەن یوگن ئێستیلی[2] تەئکید کراوەتەوە. ناوبراو پێی وابوو کە گەشەسەندنی سەرکەوتوو بە شێوەی هاوکات لە خزمەتی بەرژەوەندی خەڵکی وڵاتانی گەشە نەکردوو، خەڵکی ویلایەتە یەکگرتووەکان و تەنانەت لە خزمەتی بەرژەوەندی تەواوی کۆمەڵگای جیهانییە.

گەشەسەندن بە مانای پێشکەوتنی بەرنامە بۆ دارێژراوی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەگەرچی تێگەیشتنی ئەمڕۆ لە چەمکی گەشەسەندن وەك رەوتێك، زیاتر لە هەموو شتێك بۆ کاری بە کۆمەڵی بەرنامە بۆ دارێژراوی سەرچاوەکان و تەکنۆلۆژیا لە کەرتی گشتی و تایبەتی

(1) Lugard.
(2) Eugene Staley.





یان تێکەڵاوێك لەو دوانە، بە مەبەستی بەرزبوونەوەی ئاستی هەڵدانی ئابووری و تەنانەت پێشکەوتنی سیاسی و کۆمەلایەتی دەگەڕێتەوە. بەڵام بەم دواییانە باسێکی جیددی لە پێوەندی لەگەڵ ئەوەی کە ریشە هزرییەکانی ئەم روانگەیە بۆ ئەندێشەکانی سنت سیمۆنیانز[١] و بە تایبەت ئاگۆست کێنت[٢] دەگەڕێتەوە کە بڕیاردان بۆ گەشەسەندن و پێشکەوتنی وەك ئامرازێك بۆ قەرەبووکردنەوە و نەهێشتنی بێ سەرە و بەرەیی بەهۆی سەرمایەداری لە شێوازی هەژاری، بێکاری و کۆچی گوندنشینەکان یان سەپاندنی دیسیپلین لە رێگای کۆنترۆڵی نوخبەکان و هتد... لێك دەداتەوە-هاتووەتە بەرباس. (Cowen, 1996)

بەڵام ئەم مانایەی گەشەسەندن پاش جەنگی دووەمی جیهانی بایەخی پێدرا. تەنانەت هەندێك لە نووسەران وەك ئێستوا[٣] سەرەتای دروست بوونی ئەم بیرۆکەیە دەگەڕێنێتەوە بۆ وتەکانی ترۆمەن، سەرۆك کۆماری ئەمەریکا لە ٢٠ی تەمووز ١٩٤٩ کە پێی وابوو ئەرکی گرینگ و بەرپرسایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان، پەرەپێدان و راگواستنی ئەزموونە زانستی و پیشەسازییەکانی ئەمەریکایە بۆ جیهانی گەشە نەکردوو. لەگەڵ ئەمەشدا جێگای وەبیرهێنانەوەیە کە ئەم روانگەیە لە گەشەسەندن، بە مانای پێشکەوتنی بەرنامە بۆ دارێژراو بۆ هەڵدانی ئابووری خاوەنی چەندین نموونەی مێژووییە کە لەوانە دەتوانین ئاماژەبە نووسراوەکانی لیست[٤] لە سەدەی نۆزدەهەم لە ئەڵمانیا و هەروەها گۆڕانکاریی بنەڕەتی لە تیۆری و سیاسەتە ئابوورییەکانی ژاپۆنی دوای ١٨٦٨ بکەین. (Gerschen Kron, 1962)

لیست پێی وابوو کە کۆمەڵگای دواکەوتوو دەبێ پێرەوی لە کۆمەڵگای گەشەکردوو بکا هەتا بتوانێ کێبەرکێیان لەگەڵدا بکا. ناوبراو هەروەها لەسەر ئەو بڕوایە بوو کە پیشەسازیی پێشکەوتوو و تیجارەتی دەرەوە لە ئاستی جێگای پەسندی ئەوان، تەنیا لە رێگای بەهێزکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت دێتە دی.

لە نموونەی ئاماژەپێکراوی ژاپۆن لە ساڵی ١٨٦٨، دەبێ بڵێین کە رژێمی میجی بەم ئاکامە گەیشتبوو کە بۆ مانەوەی ژاپۆن وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە بەرامبەر مەترسییەکانی دەرەوە، ناچار بە بیناکردنی دەوڵەتێکی ناوەندی مۆدێرن و ئابوورییەکی پیشەسازیی مۆدێرنە. (Moore, 1966, p.246)

(1) Saint-Simonians.
(2) Auguste Cont.
(3) Estera.
(4) List.



سەرەڕای ئەمەش، ئەم بیرۆکەیە لە گەشەسەندن خاوەنی هەندێك نموونەی مێژوویی کەمتر سەرکەوتوو لە ئەورووپایە. بیرۆکەی گەشەسەندنی سەرمایەداریی بەرنامە بۆدارێژراو، لە سیاسەتی ئابووری فاشیزم لە دەیەکانی ٢٠ و ٣٠ی ئیتالیا بەدی دەکرێ، بەجۆرێك لە رژێمی گەشەخوازی ئەو سەردەمە پێی وابوو کە ئەرکی سەرەکی ئەو جێبەجێ کردنی خێرای مۆدێرنیزاسیۆن و بە پیشەسازی بوونی سیستەمی ئابووری-کۆمەڵایەتی وڵاتە. (Gregor, 1979, pp.304-11)

نموونەی وێکچووی مێژوویی دیکەی ئەم بیرۆکەیە لە گەشەسەندن لە ئەوروپا لە هەوڵەکانی دەوڵەتی پرێمو[١] لە دەیەی ٢٠ لە ئیسپانیا و هەروەها هەوڵەکانی فرانکۆ پاش ساڵی ١٩٣٦ دەبینرێ.

لە روانگەی پرێمو، زیادکردنی بەرهەم و گەشەسەندنی سەرچاوە ئابوورییەکانی وڵات ژێرخانەکانیان بۆ خۆگونجان لەگەڵ دونیای مۆدێرن پێویستە.

پرێمۆ لەم پێوەندییەدا دەڵێ:

((من بەردەوام پێ لەسەر تیۆری دەستێوەردانی دەوڵەت دادەگرم چونکە لەسەر ئەو بڕوایەم، لە هەموو باردۆخێکدا، دەوڵەتەکان و بە تایبەتی دەوڵەتە مۆدێرنەکان لەو کاتانەی لەگەڵ بەرژوەندی زۆر ئاڵۆز بەرەوروون پێویستیان بە گرتنەپێشی ستراتیژی بەڕێوەبەری بەشێوەی لێبراوانە و توندە. دەوڵەتێك سەرەڕای کارکردی گرینگی ئەو لە بەڕێوەبردنی وڵات، گۆڕەپانێکی گەورەیە بۆ بەڕێوبەران...)).

هەروەها دەبێ ئاماژە بەوە بکەین کە ئەم بیرۆکەیە لە گەشەسەندن (ستراتیژییەکانی بەرنامە بۆ دارێژراو بۆ هەڵدان) لە سەرەتادا، تەنیا لە چوارچێوەی سەرمایەداریدا بیری لێ دەکرایەوە، بەڵام دواتر دەرکەوت کە بەم جۆرە نییە.

### گەشەسەندن وەك رەوشێك

هەندێك جار لە گەشەسەندن بە مانای رەوشێك وەك تەمەنی باڵغ بوون یان پیری باسی لێوە دەکرێ. ئەم بیرۆکەیە پێی وایە کە گەشەسەندن قۆناغێك یان ئاستێك لە هاتنەدی هەڵدانی ئابووری-کۆمەڵایەتی و یان رەنگە سیاسییە کە هەندێك لە کۆمەڵگاکان بەدەستیان هێناوە و هەندێکی دیکەش لێی بێ بەشن.

(1) Primo.





هەروەها ئەم مانایە لە گەشەسەندن، بیرۆکەیەکە کە بۆ دەوڵەتی کۆتایی[1] دەگەڕێتەوە، بەم مانایە کە هەندێك لە کۆمەڵگاکان لە ڕێڕەوی گەشەسەندندا بە قۆناغی کۆتایی کە وەك ڕەوشێك باسی لێوە دەکەن گەیشتووە. لە هەڵسەنگاندنێکی کلاسیك لە قۆناغەکانی هەڵدانی ئابووری، روستۆ[2] لەلایەنی ئابووریدا کۆمەڵگاکان لە چوارچێوەی ٥ قۆناغ لە کۆمەڵگای نەریتی هەتا ئەو کۆمەڵگایانەی گەیشتوونەتە ئاستێکی بەرز لە بەکارهێنان، پۆلێن بەندی کردووە. (Rostow, 1960, p.4)

بە واتایەکی دیکە کۆمەڵگای گەشەکردوو ئەو کۆمەڵگایانەن کە لە قۆناغی لایەنی زۆر بەکارهێناندان و هەوراز و نشێو و کێشەکانی گەشەسەندنیان تێپەڕکردووە.

کۆمەڵگای گەشەکردوو، هەندێك جار لەگەڵ چەمکەکانی وەك کۆمەڵگای پێشکەوتوو[3]، کۆمەڵگای مۆدێرن[4]، کۆمەڵگای پیشەسازی[5] و کۆمەڵگای دەوڵەمەند[6]، بە یەك مانا بەکار دەبرێ. لە حاڵێکدا بە کردەوە هەندێك لە وڵاتانی دەوڵەمەند بە داهاتی بەرز وەك کوێت، کۆمەڵگایەکی پیشەسازی نییە.

لەلایەکی دیکەوە پۆلێن بەندی رۆستۆ، هەندێك کۆمەڵگا هەن کە هێشتا بە گەشەسەندن نەگەیشتوون و یان هەروا لە بارودۆخی نەریتیدان. هەندێك جار ئەم کۆمەڵگایانەش بە چەمکگەلێك وەك کۆمەڵگای گەشەنەکردوو[7]، کۆمەڵگای کەمتر گەشەکردوو[8]، کۆمەڵگای روو لە گەشە بەڵام بە لەسەرەخۆیی[9] و بە واتایەکی دیکە کۆمەڵگای دواکەوتوو و هەژار بە یەك مانا بەکار دەبرێن. ئەم کۆمەڵگایانە تا ئێستا دەستیان بە گەشەسەندن رانەگەیشتووە و تێدەکۆشن کە لە ڕێگای بەڕێوبەرییەکی باش و رەنگە شانس لە ریزی کۆمەڵگا گەشەکردووەکان جێ بگرن.

ئەم جۆرە روانینە لە گەشەسەندن، ئەندێشەی کۆمەڵگای گەشەکردوو لە چوارچێوەی کۆمەڵێك لە تایبەتمەندیی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابووریی دیاریکراو جێ دەکاتەوە ئەگەرچی

(1) End State.
(2) Rostow.
(3) Advanced.
(4) Modern.
(5) Industial.
(6) Rich.
(7) Undeveloped.
(8) Less-Developed.
(9) Slowly-Developing.



ڕەنگە لە روانگەی بیرمەندانەوە جیاواز بێ بەڵام بە گشتی ئابوورییەکی پیشەسازی یان بان پیشەسازی لەخۆدەگرێ کە پێکهێنەری ئاستێکی بەرز لە داهات و ئاسایشی ماددییە، پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکەی خاوەنی یەکسانی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی بەرزە و لە سیستەمێکی سیاسی سێکۆلار کە خاوەنی پلەیەکی بەرزی بەشداری گشتی لە سیاسەت و دارشتنی بڕیارە، کەڵك وەردەگرێ.

ئەم بیرۆکەی گەشەسەندنە، چەندین بەربەستی ئاشکرای لە بەردەم دایە: یەکەمین بەربەستی ئەم گریمانەیە کاتێك کۆمەڵگایەك دەگاتە قۆناغی گەشەسەندن رەوتی گەشەسەندن رادەوەستێ. لە مێژووی کۆمەڵگای پیشەسازی رۆژئاوادا ئەم گریمانەیە بە تەواوی ناڕاستە، چونکە لانیکەم ئەم پرسیارە دێتە پێش کە هیچ کەس نازانێ کۆمەڵگایەك کەی دەگاتە قۆناغی گەشەکردوویی. نموونەی خوارەوە ئەم خاڵە باشتر شی دەکاتەوە.

لە کاتی بەڕێوەچوونی پێشانگایەکی گەورە لە ساڵی ١٨٥١، هەندێك لە نوخبەکانی بەریتانیا پێیان وابوو کە بەریتانیا لەرووی پیشەسازییەوە پلەی یەکەمی لە نێو هەموو وڵاتانی گەشەکردوودا هەیە. (Weiner, 1985) لە حاڵێکدا ئەمڕۆکە زۆر کەس لەسەر ئەو بڕوایەن کە لە حاڵی حازردا دەسەڵاتی پیشەسازیی بەریتانیا لە بەراورد لەگەڵ وڵاتانی پیشەسازیی گەشەکردووی وەك ئەمەریکا، ئەڵمانیا و ژاپۆن کەم بووەتەوە. باسکردنی نموونەی ئاماژە پێکراو، راستی ئەم خاڵە دەسەڵمێنێ کە پێناسەی ئێمە لە گەشەسەندن هەرچییەك بێ و بە هەر پێوانەیەك هەڵی سەنگێنین، دەبێ بڵێین کە تێگەیشتنی گەشەسەندن وەك رەوشێك بە تەواوی هەڵەیە. چونکە گەشەسەندن رەوتێکی بەردەوام و نەپساوە لە نێو سیاسەتەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دایە.

### گەشەسەندن وەك رەوتێك

تێگەیشتن لە گەشەسەندن وەك رەوتێك، لەگەڵ ئەم پرسەی کە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکان بە چەند جۆری گەشەکردوو، گەشەنەکردوو و مام ناوەندی دابەش بکەین، دژایەتی نییە.

هەندێك جار لەم هەڵسەنگاندنەدا، گەشەسەندن وەك تایبەتمەندییەکی بەردەوام لە گۆڕان و روو لە گەشە لە کۆمەڵگا سەیر دەکرێ. لەم گۆشە نیگایەوە، گەشەسەندن چەمکێکی رێژەییە و ناتوانین وڵاتەکان بە پێی کۆمەڵێك لە پێوەرە جیهانییەکان بە وڵاتانی گەشەکردوو و گەشەنەکردوو دابەش بکەین. هەندێك جاریش گەشەسەندن وەك رەوتێك چاو لێدەکرێ کە





بريتييە لە بردنە سەر و بە نيهادينەكردنى تواناييەكان بە مەبەستى هاوسەنگى بەردەوام، بەراورد كردن و گۆڕانە كە هەموو ولاّتان بۆ پاراستن و پەرەپێدانى بەرژوەندى و دەستكەوتەكانى خۆيان لە جيهاندا، ناچارن ئەوانە لە بەرنامەى كارى خۆيان دابنێن.

بە سەرنجدان بەم روانگەيە، بەريتانيا لە ساڵى ١٨١٥، هەرچەند پێشكەوتنى باشى بەدەست هێنابوو، بەلاّم نەگەيشتبووە قۆناغى كۆتايى گەشەسەندن. (Hobsbawm, 1969)

لە پێوەندى لەگەڵ بەريتانيا دەتوانين بڵێين كە ئەم ولاّتە هەردوو رەوشى گەشەسەندن و دواكەوتووى تاقيكردووەتەوە. بە جۆرێك كە هەندێك لە ناوچەكانى گەشەكردوو و هەندێكى ديكەش لە دۆخێكى باشى گەشەخوازيدا نەبوو.

رەوشى زۆربەى شارەكان و دەوروبەرى لە زۆربەى ولاّتانى پيشەسازى كە گەلێك نموونە لە هەژارى و بێكارى لەواندا دەبينرێ و نزيكەى ١٠٠ مليۆن كەس داهاتى خوار هێڵى هەژارييان هەيە، نموونەى بەرچاون بۆ سەلماندنى ئەم باسە.

ديارە دەبێ بڵێين كە چەمكى پێشكەوتن و بەرەو پێشچوون لە روانگەى گەشەسەندن وەك رەوتێك، بە قەت خودى چەمكى گەشەسەندن، رەوا نييە و كەڵك وەرگرتن لەوانە بە جێگاى گەشەسەندن، كێشەيەك چارەسەر ناكا لە پێوەندى لەگەڵ چەمكى هەڵدانيشدا وەك گەشەسەندن، خوێندنەوەى جۆراوجۆر لە نێوان هەندێك كەس و بەتايبەتى فەرهەنگە جياوازەكان لە ئارادايە.

هەرچەند كە تێبينى ئەوتۆ نيشاندەرى پێويستى بە وردبينييەكى زياتر لە باسەكانى پێوەنديدار بە هەردوو چەمكى هەڵدان و گەشەسەندن هەيە، بەڵام چەمكى گەشەسەندن وەك رەوتێك، پێويستى بە پێوانەى ئابوورى، سياسى و كۆمەڵايەتى كە پێشتر لە هەڵسەنگاندنى گەشەسەندن وەك رەوشێك كەڵكيان لێ وەرگرتووە، نييە.

ئەم بابەتە بە تايبەت لە كاتێكدا كە مەبەستەكانى گەشەسەندن لە سەردەمێكى دياريكراو و سنووردارردا نايەنەدى، جێگاى سەرنجە. ئەگەر ئەم بابەتە دروست بێ، تێبينى رێگا و شێوازەكانى سياسى، پێگەيەكى بەرچاوى لە دياريكردنى رێژەى گرينگى ئامانجەكان دەبێ.

لەگەڵ هەموو ئەم شيكردنەوانەدا، ئەوەى زۆر گرينگە ئەمەيە كە گەشەسەندن وەك رەوتێكى بەردەوام و نەك رەوشێكى تايبەت، چاوى لێ دەكرێ.



### گەشەسەندن وەك هەڵدانى ئابوورى

لانيكەم لە سەردەمى ئادام ئيسميت، چەمكى گەشەسەندن زۆرجار هاوواتاى هەڵدانى ئابوورى بەكارهێنراوە و لە ڕاستيدا، ئەم دوو چەمكە وەك يەك مانا كەڵكى لێ وەرگيراوە. ديارە ژمارەيەكى زۆر كەم لە ئابووريناسان و زانايانى كۆمەڵايەتى ئەمڕۆ روانگەيەكى ئەوتۆيان بەرامبەر بە گەشەسەندن هەيە و بەو جۆرەى كە دەبيينين رێكخراوە گرينگەكانى ماڵى و گەشەسەندن وەك بانكى جيهانى و سندووقى نێونەتەوەيى دراويش، ئەمڕۆكە هەڵدانى ئابوورى هەرچەند بە گرينگ و بنەڕەتى دەزانن- هاوواتاى چەمكى گەشەسەندن دانانێن.

بەڵام ئەوەى كە ئادام ئيسميت لە هەوڵى دياريكردنى بوو بريتى بوو لە دەستڕاگەيشتن بە هەڵدانى ئابوورى لە رێگاى زيادكردنى سەرمايەى نەتەوەيى. ناوبراو پێى وابوو ئەو سەرمايەيەى كە بە تێپەڕبوونى زەمان لەلايەن خەڵكەوە و بە هۆى هەوڵى بەربلاوى ئەوان لە ئاستى جيهانى، كيشوەرى و هتد... بە مەبەستى باشكردنى رەوشيان كەڵەكە بووە، بووەتە هۆى هەڵدانى بەريتانيا. ئەو رەوتە بووەتە هۆى باشكردنى هێزى بەرهەمهێنانى هێزى كار و لە ئاكامدا خەڵكێكى زۆر بوونەتە خاوەنى خۆشگوزەرانى كە ئيسميت پێى دەڵێ نەتەوەى پێشكەوتوو لە بەرامبەر نەتەوەى دواكەوتوودا.

ئادام ئيسميت لە سەردەمى سەدەى ١٨ى ئەورووپا ژياوە و هەربۆيە ئەدەبياتى ناوبراو تارادەيەكى زۆر سەير و سەمەرە دێتە بەرچاو. بەڵام روانگەى ناوبراو لە پێوەندى لەگەڵ ولاّتانى شارستانى و دواكەوتوو، كەم تا زۆر لەگەڵ دەستەواژەى ئاڵۆزترى بيرۆكەكانى ئەمڕۆكە لە پێوەندى لەگەڵ كۆمەڵگاى مۆدێرن و نەريتيدا دەبينرێ.

بابەتى سەرەكيى جێگاى سەرنجى ئيسميت واتە هەوڵدان بۆ هەڵدانى ئابوورى وەك توخمێك پێويستى گەشەسەندن، ئەمڕۆكەش جێگاى سەرنجى خاوەن رايانى ولاّتە جۆراوجۆرەكانە.

هەڵدانى ئابوورى پێوەندى هەيە بە زيادبوونى بەردەوامى ساڵانەى بەرهەمى ناپاڵفتەى نەتەوەيى[1] و يان داهاتى سەرانە[2]. (Gillis, 1992)

ئەم هەڵدانە رەنگە لە رێگاى دۆزينەوەى چەند كانگايەكى بە نرخ وەك ئەڵماس و چاڵە نەوتييەكان كە لە بازاڕە جيهانييەكاندا دەفرۆشرێ، بێتەدى. بەڵام ولاّتانێكى زۆر كەم ئەم هەلومەرجەيان بۆ رەخساوە. كەوابوو هەڵدان زۆرجار لە ئاكامى هەوڵدان لە پێناوى

(1) GNP.
(2) Income per Capita.





بەرهەمهێنان و گۆڕانکاری لە شێوازە نەریتییەکانی کشتوکاڵی و پیشەسازی یان هەردووی ئەوانە کە لە کۆتاییدا لە بەراورد لەگەڵ رابردوو، دەبێتە هۆی بەرهەمی زۆرتر، دێتە دی. ئەم خوێندنەوەیە لە گەشەسەندن وەك هەڵدانی ئابووری، هیچ ئاماژەیەك بە چۆنیەتی دابەشکردنی بەرژەوەندییەکانی وەدەست هاتوو لە هەڵدان، لە بابەتە کۆمەڵایەتی، سیاسییەکان و یان هەزینەکانی ژینگە ناکرێ. بەرازیل نموونەیەکی گونجاوە بۆ شیکردنەوەی ئەم خاڵە.

لە لوتکەی قۆناغی بەناو سەرسوورهێنەری بەرازیل لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٩ تا ١٩٧٤، ئابووری ئەم وڵاتە هەڵدانێکی ١٠ لە سەدی لە ساڵدا بە خۆوە بینیبوو. هەڵدانی نێونجی ساڵانە لە بەرهەمی ناپاڵفتەی نەتەوەیی سەرانەی[1] بەرازیل لە قۆناغی ٢٠ ساڵە لە نێوان ١٩٦٠ تا ١٩٨١ رەقەمێك بەرامبەر بە ٤,٨ لە سەد بووە. (World Bank, 1984)

ئەم رێژەیە لە هەڵدان لە ژێر هەر ستانداردێکدا بێ، جێگای سەرنجە. بەڵام دابەشکردنی بەرژەوەندی و ئاکامی بەدەست هاتوو لەم هەڵدانە سەرسوورهێنەرە بەسەرهاتێکی دیکەی هەیە. لە فەسڵی دواییدا ئامارێك لە پێوەندی لەگەڵ نابەرامبەری و بێ عەدالەتی لە بەرازیل دەخەمەروو.

ئەگەر کەسێك ئامارێك لە دابەشکردنی داهاتەکانی بەرازیل پێشکەش بکا، بۆی دەردەکەوێ کە لە ساڵی ١٩٧٢، ٢٠ لە سەد لە هەژارترین بنەماڵەکان تەنیا خاوەنی ٢ لە سەدی داهات بوون. ئەم ئامارە رەنگە بەرازیل لە سەرەوەی نابەرامبەرترین کۆمەڵگا لە جیهاندا جێبکاتەوە. بارودۆخی ئاماژەپێکراو لە دەیەی ٨٠ی زایینیدا بە چوونە سەری نابەرامبەرییەکان خراپتر بوو. (Coes, 1995, pp.36-44). ئەم بارودۆخە لە ساڵی ١٩٩٥ هەندێك باشتر بوو. بە جۆرێك کە ٢٠ لە سەدی هەژارترین بنەماڵەکان خاوەنی نزیکەی ٢,٥ لە سەد لە داهات بوون و ١٠ لە سەدی دەوڵەمەندترین بنەماڵەکان نزیکەی ٤٧,٩ لە سەدی داهاتیان لە بەردەستدا بوو. (World bank, 1998b)

تەنانەت دوای قۆناغی بەناو سەرسوورهێنەری بەرازیل، هەرچەند کە بەرهەمی ناپاڵفتەی نەتەوەیی سەرانە لەم وڵاتە لە ٢٢٤٠ دۆلار لە ساڵی ١٩٨٢ بۆ ٤٧٢٠ دۆلار لە ساڵی ١٩٩٧ زیادی کردووە، لەگەڵ ئەمەشدا نابەرامبەری هەروا بەردەوامە و پێوەرە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە، تەنانەت لە بەراورد لەگەڵ ئەو کۆمەڵگایانەی کە بەرهەمی ناپاڵفتەی نەتەوەییان لە بەرازیل خوارترە، خراپتر بووە. (خشتەی ١-٢)

(1) GNP per Capita.



خشتەی ١-٢: بەرهەمی ناپاڵفتەی نەتەوەیی سەرانە و رێژەی مردن لەنێوانی کەسانی خوار ٥ ساڵ لە ساڵەکانی ١٩٩٦ و ١٩٩٧.

| وڵات | نرخی ناپاڵفتەی نەتەوەیی سەرانە (بەپێی دۆلاری ئەمەریکی) | رێژەی مردنی کەسانی خوار ٥ ساڵ (لە هەر ١٠٠٠ کەس) |
|---|---|---|
| بەرازیل | ٤٧٢٠ | ٤٢ |
| ڤینزوئیلا | ٣٤٥٠ | ٢٨ |
| کاستاریکا | ٢٦٤٠ | ١٥ |
| جامائیکا | ١٥٦٠ | ١٤ |
| چین | ٨٦٠ | ٣٩ |
| سریلانکا | ٨٠٠ | ١٩ |

سەرچاوە: راپۆرتی بانکی جیهانی لە ساڵی ١٩٩٨.

ئەوەی کە لە رێژەی مردنی منداڵانی خوار ٥ ساڵ لەم خشتەیەدا نیشان دەدا، بریتییە لە ئاستی هەڵدانی رێژەیی بەرزی بەرهەمی ناپاڵفتەی نەتەوەیی سەرانە وەك پێوەرێکی ستانداردی هەڵدانی ئابووری، کە ئەمە بە مانای باشکردنی رەوشی خۆراك و چاودێری تەندروستی بۆ زۆربەی منداڵان نییە. لە رووی ئامارییەوە، هەڵسەنگاندنی گەشەسەندن لە رێگای زیادبوونی بەرهەمی ناپاڵفتەی نەتەوەیی سەرانە، ئەگەرچی بە سوود و بە کەڵکە بەڵام شتێك سەبارەت بە چۆنیەتی دابەشکردنی داهاتی بەدەست هاتوو و چۆنیەتی کەڵك لێ وەرگرتنی دەوڵەت دەرناخا. ئەوەی کە من دەمهەوێ بە سەرنجدان بەم ئامارە بیخەمەروو بریتییە لەوەی ئەگەرچی هەڵدانی ئابووری پێوەرێکی سەرەکییە بۆ گەشەسەندن، بەڵام ناتوانین وەك هەموو رەهەندەکانی گەشەسەندن چاوی لێ بکەین. کەوابوو پێناسەی گەشەسەندن بە واتای هەڵدانی عەقڵانی نییە، چونکە کاتێك هەموو قازانجی بەدەست هاتوو لە هەڵدان لەبەر دەستی تاقمێکی بچووکی کۆمەڵگادا بێ، باسکردن لە بوونی رەوتێکی سەقامگیر و هەمەلایەنەی گەشەسەندن، لانیکەم لە کورتخایەندا دروست نییە. لەگەڵ ئەمەشدا، من لەم کتێبەدا پێم وایە ئەگەرچی هەڵدان پێوەرێکی پێویستییە بۆ گەشەسەندن بەڵام مەرجی تەواو بۆ گەشەسەندن نییە.

بە واتایەکی دیکە هەر کۆمەڵگایەك کە خوازیاری پاراستن و باشکردنی ژێرخانەکانی کۆمەڵایەتی و فیزیایی، خزمەتگوزاری و ئاسایشی زیاتر و رەخساندنی دەرفەتی زۆرتر بۆ





خەڵکە، ناچارە دەبێ دەستی بە بەهاکانی زۆرتر رابگا و ئەمە سەرمایەیە کە دەتوانێ لەو رێگایەوە، تایبەتمەندییەکانی وەك ئاوی ساڵم، رێگاوبان، قوتابخانە، ناوەندی تەندروستی و داودەرمان، ئاسانکاریی وەرزشی و فەرهەنگی دەستەبەر بکا. بەڵام بەو جۆرەی لە نموونەی بەرازیل دەرکەوت و منیش لە درێژەی ئەم کتێبەدا باسی دەکەم، ئەوەی بە تەنیایی دەبێتە هۆی پاڵپێوەنانی هەڵدانی ئابووری بەرەو گەشەسەندن، سیاسەتە.

لە کۆتاییدا دەبێ بڵێین، هەرچەند لە مانای کاپیتالیستی گەشەسەندن، هەڵدانی ئابووری بابەتێکی سەرەکیی گەشەسەندنە، بەڵام بە دڵنیاییەوە تەنیا پێوەندی بەو روانگەیەوە (چەمکی کاپیتالیستی) نییە. چونکە لە روانگەی ستالینیشەوە، پێ لەسەر پێویستی هەڵدان و گۆڕانی پێکهاتەیی داگیراوە.

### گەشەسەندن وەك گۆڕانی پێکهاتەیی

بیرۆکەی گەشەسەندن وەك گۆڕانی پێکهاتەیی یەکێك لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی زۆربەی چەمکەکانی گەشەسەندنە بەتایبەتی لە تیۆرییەکانی پێوەندیدار بە مارکسیزم و مۆدێرنیزاسیۆن و پێوەندییەکی نزیکی لەگەڵ خوێندنەوەی هەڵدانی ئابووری لە گەشەسەندندا هەیە.

بە واتایەکی ئاسانتر، گۆڕانی پێکهاتەیی بریتییە لە گۆڕان لە پێکهاتەی ئابووری و لە ئاکامدا گۆڕان لە دەرەوەی ئەو و بە واتایەکی دیکە گۆڕان لە ئابووری لە سەر بنەمای کشتوکاڵی بۆ ئابووری پیشەسازی و بە کورتی بە پیشەسازی کردن.

هەرچەند کە گۆڕانی پێکهاتەیی لەگەڵ رەخنەی زۆر بەرەو رووە، بەڵام بە پیشەسازی بوون مانایەکی گرینگ و بنەڕەتییە لە پێناسەی پێوەندیدار بە هەڵدانی ئابووری و گۆڕانی پێکهاتەیی وەك گەشەسەندن، لە سەدەی نۆزدەهەم لەلایەن رێبەرانی هەردوو رەوتی گشتیی راست و چەپ بایەخی پێدەدرا. لە خوارەوە ئاماژە بە چەند نموونە لەم بیرۆکەیە دەکەین.

نموونەی یەکەم پێوەندی بە وتەکانی ستالینەوە هەیە کە بە بەڕێوەبەرانی تیجاری و ئابووری لە ساڵی ١٩٣١ وتبووی. ناوبراو بە هاوحزبییەکانی خۆی وتبوو:

((رەوتی بە پیشەسازی بوون نابێ لە سەرەخۆ بێ. لەڕاستیدا ئێمە دەبێ بە هەموو هێز و توانامانەوە خێرایی پێ بدەین. رەوتی لەسەرەخۆی بە پیشەسازی بوون بە مانای دواکەوتوویە و وڵاتانی دواکەوتوو بەردەوام شکست خواردوون. ئێمە نامانەوێ بەشێك بین لەم وڵاتانە.



مێژووی رابردووی رووسیا سەلمێنەری ئەم راستییەیە کە بەهۆی دواکەوتوویی، بەردەوام ژێردەستەی وڵاتان و حاکمە یەك لە دوای یەکەکان وەك مەغۆلەکان[1]، پاشا فێئودالەکانی سوید، پۆلۆنیا، تورکیا، سەرمایەدارە فەڕەنسی و بەریتانیا و ژاپۆنییەکان و هتد... بووین. بە هۆی دواکەوتوویی لە بوارەکانی سەربازی، فەرهەنگی، سیاسی، پیشەسازی، کشتوکاڵی و هتد... ئێمە نزیکەی ٥٠ تا ١٠٠ ساڵ لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی جیهان، دواکەوتووین. ئێمە دەبێ ئەم دواکەوتووییە بە هەر بەهایەك بووە لە ماوەی ١٠ ساڵدا قەرەبوو بکەینەوە. (Deutscher, 1966, p.327)

نموونەی دیکەی ئەم بیرۆکەیە (گۆڕانی پێکهاتەیی) لە روانگەی سەرۆك کۆماری پارك جونگ هی[2]، کە رێبەرایەتی کودەتایەك لە کۆریای باشوور لە ساڵی ١٩٦١ی لەسەر شان بوو، دەبینرێ. ناوبراو لە دیاریکردنی ئامانجی سەرەکی رژێمەکە وتبووی:

((من دەمەوێ پێ لەسەر ئەوە دابگرم کە مەبەستی سەرەکی لە شۆڕشی سەربازی ١٦ی ئایار، پێکهێنانی شۆڕشی پیشەسازی لە کۆریا بووە. ئەگەرچی مەبەستی سەرەتایی شۆڕش هێنانەدی رێنێسانسی نەتەوەیی بووە کە لە راستیدا چاکسازی سیاسی، فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی لەبەرچاو بووە، بەڵام مەبەستی سەرەکیی من شۆڕشی ئابووری بووە)). (Lim, 1985, p.73)

هەرچەند لە نموونەی ئاماژەپێکراوی ستالین، مەبەستی سەرەکی گۆڕینی پێکهاتەیی بە شێوازی بە پیشەسازی بوون، وەك بناغە و پێویستی پێکهێنانی سوسیالیزم چاوی لێدەکرا، بەڵام پێکهێنانی رووسیایەکی بەهێز بۆ زاڵبوون بەسەر جیهان بە کەڵك وەرگرتن لە ئاکامی بە پیشەسازی بوونیش گرینگییەکی یەکجار زۆری هەبوو.

لە رەوشی خراپی سەدەی بیستەم لەژێر دەسەڵاتی کۆلۆنیالیزمی ژاپۆن رزگار بکا و کۆریا بکاتە هێزێکی گرینگ لە رۆژهەڵاتی ئاسیا. لەم روانگەیە، گۆڕان لە پێکهاتە وەك بنەمایەك بۆ گەشەسەندن، زۆرجار بە کەڵك وەرگرتن لە پێوەرەکانی وەك، بەرهەمی نێوخۆیی لە رێگای کشتوکاڵ، پیشەسازی و خزمەتگوزاری و هەروەها ژمارەی ئەو کەسانەی لە بەشە جۆراوجۆرەکان کار دەکەن، هەڵدەسەنگێندرێ. هەندێك جار، گەشەسەندنی شاریش وەك پێوەرێکی بە سوود بۆ هەڵسەنگاندن کەڵکی لێ وەردەگیرێ، بەڵام لەوەی کە رەنگە ئەم بابەتە بەبێ بە پیشەسازی بوونیش رووبدا، پێوەرێکی جێگای پەسند نییە. بۆ نموونە لە دەیەی ٦٠ی

---

(1) Mongol Kans.
(2) Park Chung-Hee.





زایینی لە شیلی و ڤێنزوئیلا، بەرێز نزیکەی ٤٦ تا ٤٧ لەسەد لە حەشیمەت لەو شارانە دەژیان کە حەشیمەتیان نزیك بە بیست هەزار کەسە. بەڵام تەنیا ١٦،٥ و ٩،٨ لە سەد لەوان لە پیشەسازیدا کاریان دەکرد. (Skidmore, 1974, 214)

بە کورتی، بیرۆکەی گۆڕانی پێکهاتەیی بۆ گەشەسەندن بریتییە لە گۆڕان بە ئابووری و کۆمەڵگایەکی گوندی لەسەر بنەمای کشتوکاڵی بۆ کۆمەڵگای شاری و ئابووریی پیشەسازی.(خشتەی ٢-٢ و ٣-٢)

خشتەی ٢-٢: چۆنیەتی دابەشکردنی بەرهەمی ناپاڵفتەی نێوخۆیی لەنێوان بەشە جۆراوجۆرەکانی وڵاتانی خوارەوە.

| وڵات | کەرتی کشتوکاڵ | | کەرتی پیشەسازی | | کەرتی خزمەتگوزاری | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ١٩٦٥ | ١٩٩٧ | ١٩٦٥ | ١٩٩٧ | ١٩٦٥ | ١٩٩٧ |
| هیند | ٤٤ | ٢٧ | ٢٢ | ٣٠ | ٣٥ | ٤٣ |
| چین | ٣٨ | ٢٠ | ٣٥ | ٥١ | ٢٧ | ٤٩ |
| کۆریای باشوور | ٣٨ | ٦ | ٢٥ | ٤٣ | ٣٧ | ٥١ |
| بوتسوانا | ٣٤ | ٥ | ١٩ | ٤٦ | ٤٧ | ٤٨ |
| کاستاریکا | ٢٤ | ١٥ | ٢٣ | ٢٤ | ٥٣ | ٦١ |
| جامائیکا | ١٠ | ٨ | ٣٧ | ٣٦ | ٥٣ | ٥٥ |
| تایلەند | ٣٢ | ١١ | ٢٣ | ٤٠ | ٤٥ | ٥٠ |
| نیپاڵ | ٦٥ | ٤٣ | ١١ | ٢٢ | ٢٣ | ٣٥ |
| غانا | ٤٤ | ٤٧ | ١٩ | ١٧ | ٣٨ | ٣٦ |

سەرچاوە: ڕاپۆرتی بانکی جیهانی لە ساڵەکانی ١٩٩٢ هەتا ١٩٩٨ و ڕاپۆرتی بەرنامەی ئاوەدانکردنەوەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٩٨.

خشتەی ٢-٢ نیشانی دەدا کە بەشی پیشەسازی لە بەرهەمی ناپاڵفتەی نێوخۆیی لە وڵاتانێك وەك چین، کۆریا، بۆتسوانا و تایلەند بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر لە ٣٠ ساڵی نێوان ١٩٦٥ هەتا ١٩٧٧ زیادی کردووە. لە حاڵێکدا لە هیند، کاستاریکا و نیپاڵ گۆڕانێکی کەم ڕوویداوە.



کەوابوو دەبێ بڵێین هێزی دیکە لە چوونی خەڵك لە ناوچە گوندنشینەکان بۆ شارەکان ڕۆڵی بووە. بە پیشەسازی بوون بەردەوام پەرە بە شارنشینی دەدا و ئەم پرسە بووەتە هۆی گۆڕانێکی دیکە لە پێکهاتەی کۆمەڵگا. ئەم ئاڵوگۆڕە بەردەوام لەگەڵ گۆڕان لە پێکهاتەی هێزی کار هەڵدەسەنگێندرێ. خشتەی (٣-٢)

خشتەی (٣-٢): ڕێژەی هێزی کاری کشتوکاڵی لە وڵاتانی ئاماژەپێکراو لە ساڵی ١٩٦٥ هەتا ١٩٩٠

| وڵات | ١٩٦٥ | ١٩٩٠ |
|---|---|---|
| هیند | ٧٣ | ٦٤ |
| چین | ٨١ | ٧٢ |
| کۆریای باشوور | ٥٥ | ١٨ |
| بوستوانا | ٨٩ | ٤٦ |
| کاستاریکا | ٤٧ | ٢٦ |
| جامائیکا | ٣٧ | ٢٥ |
| تایلەند | ٨٢ | ٦٤ |
| نیپاڵ | ٩٤ | ٩٤ |
| غانا | ٦١ | ٥٩ |

سەرچاوە: ڕاپۆرتی بەرنامەی ئاوەدانکردنەوەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵەکانی ١٩٩٢ و ١٩٩٨.

لە ئاکامدا، گۆڕانکاری پێکهاتەیش وەك هەڵدانی ئابووری، دەتوانێ شێوازێکی گونجاو بۆ پێناسە و پێواندنی گەشەسەندن بێ، بەڵام ئەم ڕوانگەیەش ئاماژە بە خاڵێکی گرینگ لە پێوەندی لەگەڵ تایبەتمەندی و یەکسانی ژیان لە ڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتی یان دابەشکردنی بەرژەوەندی ناکا.

بۆ خۆ پاراستن لە پۆلین بەندیی بەربڵاوی بیرۆکەکانی پێوەندیدار بە گەشەسەندن، پێویستە ئاماژە بە هەندێك پێناسەی تایبەت بە گەشەسەندن لەم پۆلین بەندییانەدا بکەین.





## گەشەسەندن وەك مۆدێرنیزاسیۆن

لە ناوەندی بیرۆکەی مۆدێرنیزاسیۆن، ئەم گریمانەیە لە ئارادایە کە پێکهاتەکان و ڕەوتی کۆمەڵگای مرۆیی لە شێوازی سادەی نەریتی بۆ پێکهاتەی ئالۆزی مۆدێرن پەرە دەستێنێ.

کۆمەڵگای مۆدێرن یان لە حاڵی مۆدێرنیزاسیۆن، لە بوارەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی و لە کۆتاییدا لە ڕەوتە سیاسییەکان لەگەڵ یەکتردا یەکیان گرتووەتەوە (Huntington, 1979)

هەندێك پێیان وایە، پێناسەی ڕەوتی مۆدێرنیزاسیۆن، بریتییە لە بە پیشەسازی بوون. لە ڕوانگەیەی ئەم بەشەوە، گەشەسەندن وەك مۆدێرنیزاسیۆن لە چوارچێوەی هەردوو ڕێگای ڕەوش و ڕەوت جێ دەگرێ بە جۆرێك کە ڕەوشی کۆمەڵگای نەریتی لە قۆناغی دەست پێکردن و کۆمەڵگای مۆدێرن لە کۆتایی ڕێڕەودا هەڵکەوتووە. مۆدێرنیزاسیۆن ڕەوتێکە کە کۆمەڵگا لەم ڕێگایەوە گۆڕانکارییەکی گەورە لە ڕەوشێك بۆ ڕەوشێکی دیکە دەگۆڕێ و کامڵ دەبێ.

بیرۆکەی مۆدێرنیزاسیۆن خاوەنی ڕیشەی قووڵە لە تیۆری کۆمەڵایەتی و ئایدۆلۆژیای ئیمپریالیستی بەدرێژایی سەدەی نۆزدەهەم و بیستەمی زایینی لە ئەورووپا و ئەمەریکای باکوور. (Apter, 1965) دیارە بەهۆی جۆراوجۆری داواکارییەکانی، مانایەکی ڕوون و دیاریکراوی نییە. لە باشترین حاڵەتدا، مۆدێرنیزاسیۆن ڕوانینێکی گشتی لە گەشەسەندن چ وەك ڕەوش و چ وەك ڕەوتێك دادەڕێژێ. مۆدێرنیزاسیۆن پێوەندی بە گۆڕانێکی گشتی لە پێکهاتەی کۆمەڵگا یان گۆڕانکارییەکای قووڵ و بنەڕەتی لە ڕەهەندەکانی ئابووری، کۆمەڵانی، یاسایی، دامەزراوەیی، سیاسی و ئایدۆلۆژیایی و بەتایبەتی لە قۆناغی بڵاوبوونەوەی جیهانی بوون هەیە. مۆدێرنیزاسیۆن ڕەوتێکە کە لە چوارچێوەکەیدا کۆمەڵگای مۆدێرن، چاودێری زیاتر بەسەر شوێنی کۆمەڵایەتی و ماددی خۆی بە بڵاوبوونەوە و کەڵك وەرگرتن لە دەستکەوتەکانی تەکنۆلۆژیا و زانست تاقی دەکاتەوە. (Huntington, 1971, p.286)

لە ڕاستیدا، مۆدێرنیزاسیۆن جۆرێك گۆڕانی پێکهاتەیی ڕێك و پێکە کە خاوەنی چەندین تایبەتمەندی وەك دیسپلینی ئابووریی پیشەسازی یان بان پیشەسازییە کە سەرچاوەی ئاسایشی ماددی خەڵك بە شێوەی بەردەوامە؛ پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی لەسەر بنەمای تاکگەرایی و یەکسانی، سیستەمێکی سیاسی دیموکراتیك لە جۆری نوێنەرایەتی یان لانیکەم سیستەمێك کە لەودا بڕیاردەران لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە دیاری دەکرێن؛ فەرهەنگێکی سیاسی سێکۆلار بە چەندین تایبەتمەندی وەك کەڵك وەرگرتن لە شێوازە عەقڵانییەکان لە بڕیاردان، ڕێزلێنان لە مافی مرۆڤ و گەرەنتی ئازادیی تاکەکەس لە یاسا و ڕوانینێکی جیهانی کە لەودا ڕۆڵی لۆژیك و بەکارهێنانی بنەما زانستییەکان باوبێ.



لە حاڵێکدا کە هەڵدانی ئابووری و گۆڕانی پێکهاتەیی یەکێك لە تایبەتمەندییە گرینگەکانی گەشەسەندن لە کۆمەڵگای لە حاڵی مۆدێرنیزاسیۆنە، زۆربەی بیرمەندانی سەدەی نۆزدەهەمی مۆدێرنیزاسیۆنیش بایەخیان بە گرینگی لایەنە یاسایی، سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی هەڵدانی ئابووری داوەو ژمارەیەکی زۆر کەم ئەم ڕەوتە وەك مۆدێرنیزاسیۆن یان گەشەسەندن پێناسە دەکەن. لەگەڵ ئەمەشدا، دەتوانین بیرۆکەی سەرەکی ئەم گۆڕانکارییە لە بەرهەمی زۆربەی بیرمەندانی سەدەی نۆزدەهەمدا ببینین کە لە خوارەوە ئاماژە بە هێندێکیان دەکەین.

وەك نموونە لە بواری گەشەسەندنی یاسایی[1] کە نیشاندەری تێپەڕین لە نەریتەوە بۆ مۆدێرنیزم بوو، لە ساڵی ١٨٦١ کتێبێك لە ژێر ناوی ((یاسای کۆن))[2] لەلایەن ((سێر هێنری سامنێر ماین))[3] بڵاوکرایەوە. ناوبراو گۆڕانکاریی لە یاساکان و گۆڕانکاری لە ڕەوشی بۆ ڕێککەوتننامە لە بنەما یاساییەکاندا، تایبەت بە ڕەوتەکان و دامەزراوەی ئەو کۆمەڵگایانەی کە ناوبراو وەك کۆمەڵگای پێشکەوتوو باسی دەکا، زانی. (Maine, 1908, p.151)

هێربێرت سپێنسێری[4] یاساناس لە ساڵی ١٨٧٦ ئەم ئالوگۆڕەی بە گۆڕانکاریی لە ساناییەوە بۆ ئالۆزی کە نیشاندەری هەڵدانە لە ڕادە، سەقامگیری و ڕاشکاوی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی، وەسف کردووە. (Spencer, 1969, 155). فێرنیناند تونیس[5] تیورییەنی ئەڵمانی، لە ساڵی ١٨٨٧ نووسیویەتی کە ((ماف))[6] لە چوارچێوەی ڕەوتێکی مۆدێرنیزاسیۆن لە داواکاریی نەریتی و گشتیانە دەبێتە دەستەواژەی فەرمی و یاسایی دیاریکراو. دورکهایم لە نووسراوەکانی خۆی لە ساڵی ١٨٩٣ ئاماژەی بە جیاوازییە گرینگەکانی نێوان کۆمەڵگای نەریتی و مۆدێرن، واتە بوونی هاوپێوەندی ئۆرگانیك لە بەرامبەر هاوپێوەندی میکانیکی کردووە. ناوبراو پێی وابوو کە بە شێوەی نەریتی، کۆمەڵگای سادە و نائالۆز لە گرووپە وێکچووەکان (بنەماڵەکان و گوندەکان) کە بە شێوەی میکانیکی پێوەندییان پێکەوە هەیە، پێك دێ. (Durkheim, 1893/1964)

ماکس ڤیبەر لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم ئاماژە بە بنەماکانی لۆژیکی-عەقڵانیی دەوڵەتی مۆدێرن دەکا و لەسەر ئەو باوەڕەیە کە ئەم جۆرە لە دەوڵەت بەرهەمی ئالوگۆڕی

(1) Legal development.
(2) Ancient Law.
(3) Sir Henry Sumner Maine.
(4) Herbert Spencer.
(5) Ferdinand Tonnis.
(6) The Law.





حکوومەتە نەریتییەکانی پێشووە وەك باوك سالاری، پاتریمونیالیزم و هتد... لە سیستەمە سیاسییە نەریتییەکاندا، دەسەڵات و ئۆتۆریتە لە ئەستۆی تاکە کەس بووە کە لە بەرامبەر خەڵکدا وەڵامدەر نەبوون. لە حاڵێکدا لە دەوڵەتی مۆدێرن وەك ئەوەی لە گەشەسەندنی ئابووریی کاپیتالیستیدا دەبینرێ، بە پێچەوانەکەی حاکمە. (Weber, 1964) بەڵام ڕەنگە لە نێوان تیۆریسییەنەکانی سەدەی بیستەم هیچ کەس بە قەت کارل مارکس ئاماژەی بە جیاوازی بەرچاوی نێوان کۆمەڵگای نەریتی و مۆدێرنی نەکردبێ.

بە سەرنجدان بەوەی کە کارل مارکس بە قووڵی کەوتبووە ژێر کاریگەری تیۆریسییەنە زانستی-کۆمەڵایەتییەکانی ئەو سەردەمەی ئەورووپا، بایەخدانی ناوبراو بە بابەتی مۆدێرنیزاسیۆن زۆر سەیر و سەمەرە نایەتە بەرچاو. هەرچەند کە ناوبراو ڕوانگەیەکی تایبەتی بەرامبەر بە مۆدێرنیزاسیۆن هەبوو.

لە ڕوانگەی مارکسەوە تەنیا ڕێگای دەربازبوون لە ڕەوشی حاکم لەو سەردەمەدا، بە پیشەسازی بوون بوو. دوورە دیمەنی جیهانی بیرۆکەی ناوبراو ئەمە بوو وڵاتێك کە لە ڕووی پیشەسازییەوە گەشە کردووە لە ڕاستیدا وێنەیەکە لە داهاتووی وڵاتانی کەمتر گەشەکردوو. (Marx, 1976, 91) لە ڕوانگەی مارکس و زۆربەی زانایانی زانستی کۆمەڵایەتی سەدەی نۆزدەهەم، بە پیشەسازی بوون، بناغەی سەرەکی مۆدێرنیزم و سۆسیالیزم کە لە ڕوانگەی مارکس تایبەتمەندیی تایبەت بە خۆی هەیە، دادەڕێژێ.

ئیزنستاد[1]- کە یەکێ لە تیۆریسییەنەکانی مۆدێرنیزاسیۆن لە دەیەی ٦٠ی زایینی بوو- بەم جۆرە پێناسەی مۆدێرنیزاسیۆن دەکا: ((ڕەوتەکانی ئاڵوگۆڕ لە سیستەمە سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان وێکچووی ئەو گۆڕانکارییانەیە کە لە سەدەی حەڤدەهەم هەتا نۆزدەهەم لە ئەورووپای ناوەندی و ئەمەریکای باکوور ڕووی دا و پاشان لە سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم بۆ وڵاتانی ئەمەریکای باشوور، ئاسیا و ئەفریقیا پەرەی ئەستاند)). (Eisenstadt, 1966, p.1). ئەم پێناسەیە نیشانی دەدا کە بۆچی هەندێك لە لێکۆڵەران گەشەسەندنیان بە جۆرێك ڕۆژئاوایی بوون و یان بە ڕۆژئاوایی بوونی ئەمەریکی[2] وەسف دەکرد. (O’Brien, 1972)

(1) Eisenstadt.
(2) American Westernization.



لە ڕوانگەی دەیڤید ئاپتێر[1]، یەکێك لە لێکۆڵەرانی هەڵکەوتووی گەشەسەندن وەك مۆدێرنیزاسیۆن، هەنگاونان بەرەو مۆدێرنیزاسیۆن بریتییە لە گۆڕانی کۆمەڵگایەك لەسەر بنەمای نموونەی مەزهەبی بەرەو کۆمەڵگایەك لەسەر بنەمای مۆدێلی لیبراڵی و سێکۆلار. ئەم گۆڕانە لە ڕۆژئاوا، لە ئاکامی بە پیشەسازی بوون، گەشەسەندنی شارنشینی، بڵاوبوونەوەی تیجارەت و گەشەسەندنی سیستەمی ئیداری لەسەر بناغەی بنەما بنەڕەتییەکانی تاکگەرایی[2] ڕوویدا. تیۆری مۆدێرنیزاسیۆنی سەدەی نۆزدەهەم سەرەڕای ڕوانینی گەشەسەندنانە بە کۆمەڵگاکان، بەهۆی ئەورووپا تەوەری و ئیمپریالیستی بوون ڕەخنەی لێدەگیرا. هەروەها زۆربەی بیرۆکەکانی مۆدێرنیزاسیۆن کە دوای جەنگ، لە دەیەکانی ٦٠ و ٧٠ی زایینی پێشکەش کران بەهۆی دوو لایەنی ناڕوونی نێوان نەریت و مۆدێرنیتە، ئەورووپا تەوەری ڕەخنەی توندی لێدەگیرا (Bernstein, 1971)

بەڵام سەرەڕای ئەم ڕەخنانەش، تێگەیشتن لە گەشەسەندن وەك مۆدێرنیزاسیۆن هێشتا جێگای پەسەندی زۆربەی لێکۆڵەرانە و پێناسەی جۆراوجۆری بەخۆوە گرتووە. ڕەنگە نوێترین نموونە لەم بیرۆکەیە لە ئەندێشەی فرانسیس فۆکۆیاما و تیۆری کۆتایی مێژووی ناوبراو خۆی دەرخستبێ.

ناوبراو پێی وابوو کە ڕووخانی کۆمۆنیزم، هەر جۆرە ئاڵتەرناتیڤێك بۆ سیستەمی ئابووری لیبراڵی مۆدێرنی ڕۆژئاوای نەهێشت و لە ئاکامدا گەشەسەندنی ئایدۆلۆژیاکان لەگەڵ بە جیهانی بوونی دیموکراسی لیبراڵی ڕۆژئاوایی وەك باشترین شێواز بۆ حکوومەتی مرۆیی، ڕاگیراوە. (Fukuyamu, 1989, p.4) تا ئێستا، خوێندنەوەیەکی ئەوتۆ لە گەشەسەندن وەك ڕەوشێکی کۆتایی لە ئارادا نەبوو و هیچ خوێندنەوەیەك لە گەشەسەندن بە قەت تیۆرییەکانی مۆدێرنیزاسیۆن لە دەیەکانی ٦٠ و ٧٠ی زایینی بۆ بە ڕۆژئاوایی بوون بە مەبەستی دەستڕاگەیشتن بە گەشەسەندن، پێی دانەگرتووە.

مارکسیزم و گەشەسەندن وەك بەرزکردنەوەی هێزە بەرهەمهێنەرەکان وەك ئادام ئیسمیت، مارکسیش ڕۆژئاواگەرا بوو و وەك ئیسمیت، هیچ کات چەمکی گەشەسەندنی لە چوارچێوەی خوێندنە مۆدێرنەکاندا بەکارنەهێناوە. دیارە مارکس لە باسی قۆناغەکانی گەشەسەندنی هێزە بەرهەمهێنەرەکان یان ((قۆناغی پەرەسەندن لە دابەشکردنی کار)) کەڵکی لێ وەردەگرت. (Marx and Engels, 1845/1965, p.32)

(1) David Apter.
(2) Individualism.





کەوابوو دەرەتانی ئەوە هەیە کە بتوانین بە کەڵك وەرگرتن لە بەرهەمەکانی مارکس لە خوێندنەوەی ناوبراو لە گەشەسەندن تێبگەین و روانگەکانی ناوبراو لە چوارچێوەی ئەو بیرۆکەیەدا کە پێی وابوو گەشەسەندن لە رێگای گۆڕانی پێکهاتەیی بزووتنەوەیەکی مێژوویی کاملبوونە کە بەرەو پێشەوە دەڕوا، هەڵکەوتووە.

خوێندنەوەی کلاسیکی مارکسیستی لە گەشەسەندن، تێکەڵاوێکە لە خوێندنەوەکانی ((گەشەسەندن وە هەڵدانی ئابووری))، ((گۆڕانی پێکهاتەیی)) و ((پێشکەوتن بەرەو رەوشێکی کۆتایی)) کە پێی دەڵێن ((کۆمۆنیزم)).

هەرچەند مارکس مۆدێرنیست و لایەنگیری نوێ بوونەوە بوو، بەڵام پێناسەی ناوبراو لەم رەوتە بە تەواوی جیاواز بوو.

یەکەم، پێشکەوتن بەو مانایە کە ئادام ئیسمیت وەك رەوتی هەڵدانی بەردەوام و گەشەسەندنانە باسی لێوە دەکا، نییە. پێشکەوتن لە روانگەی مارکسەوە، گەشەسەندنی پێکهاتە تایبەتییەکان و ئەو توانایییە کە لە کۆمەڵگادا هەیە لە رێگای ئەو قۆناغانەی کە هەر کامیان بە هۆی شێوازێکی بەرهەم هێنانی تایبەتی دیاری دەکرێ، پێناسە دەکرێ. ئەم شێوازانە لە بەرهەمهێنان بریتین لە شێوازەکانی تایفەیی، ئاسیایی[1] و کۆن و قۆناغەکانی فێئودالیزم، کاپیتالیزم و سۆسیالیزم لەخۆدەگرێ کە لەودا هەر قۆناغێك لە رێگای شۆڕشێکەوە دەچێتە قۆناغێکی دیکە و هەر قۆناغێك لە بەراورد لەگەڵ قۆناغی پێشتر، پێشکەوتووتر و کاملترە. مرۆڤەکان بە درێژایی ژیانی خۆیان، خاوەنی پێوەندی بەرهەمهێنانی تایبەتین کە ئەم پێوەندییە نیشاندەری ئاستی گەشەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێنانی ماددین. شێوەی بەرهەمهێنان لە ژیاندا رەوتە کۆمەڵایەتی، سیاسی و هزرییەکان دیاری دەکا. (Marx, 1895/1958, c.363)

بە واتایەکی دیکە شێوازێك کە کۆمەڵگایەك لە رێگای ئەوەوە بارودۆخی ژیانی خۆی دەرەخسێنێ (شێوەی بەرهەمهێنان) لایەنی ئایدۆلۆژیایی، سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەو پێکدێنێ. کەوا بوو کاتێك شێوەی بەرهەمهێنان گۆڕانی بەسەردادێ، گۆڕانکاریی بەرچاو لە تایبەتمەندی کۆمەڵایەتی، ئایدۆلۆژیایی و سیاسی کۆمەڵگا پێکدێ.

بەم جۆرە دەتوانین بڵێین گەشەسەندنی کۆمەڵگای مرۆیی ئاکامی رەوتی هەڵدان و گۆڕانکاریی شۆڕشگێڕانەیە لە شێوازێك لە بەرهەمهێنان بۆ شێوازێکی دیکە. ((ئێمە دەزانین کە بورژوازیی

(1) Asiatic.



مۆدێرن، بۆ خۆی بەرهەمی قۆناغێکی دوور و درێژی گەشەسەندن و کۆمەڵێك شۆڕشە لە شێوازەکانی بەرهەمهێنان و ئاڵوێردا)). (Marx and Engles 1888/1958, p.35)

دووەم، هەر یەك لە شێوازەکانی بەرهەمهێنان ئاستێك و قۆناغێکی دیاریکراو لە گەشەسەندن لە توانایی تەکنۆلۆژیای کۆمەڵگا پێکدێنێ کە بریتییە لە هێزە بەرهەمهێنەرەکان یان بە واتایەکی دیکە هێزەکانی بەرهەمهێنەری کۆمەڵایەتی[1]. چونکە تەواوی رەهەندەکانی ژیانی مرۆڤەکان بەستراوە بە ئاستی گەشەسەندنە کە بەرهەمی شێوازی تایبەتی بەرهەمهێنانی کۆمەڵگایە. ئەم تەکتۆلۆژییایە بە پێچەوانەوە پێوەندی بە سیستەمێکی سیاسی-کۆمەڵایەتی تایبەتییەوە هەیە.

سێهەم، مارکس گرینگییەکی زۆری بە تێگەیشتنی تەکنیکی و زانستی و بەهاکانی لە راڤەکردنی تەواوی رەهەندەکانی جیهان دەدا.

لە روانگەی مارکسەوە قۆناغی سەرمایەداری یان بۆرژوازی گەشەکردووترین و بەرزترین قۆناغە لە رەوتی ئاماژەپێکراودا. چونکە بۆرژوازی لە سەردەمی حکوومەتی سەد ساڵەی خۆیدا، بە قەت هەموو قۆناغەکانی پێش ئەو، هێزی بەرهەمهێنەری پێکهێنابوو. ئەم دەستکەوتانەی سەرمایەداری رۆڵێکی بنەڕەتی بۆ دەستەبەر کردنی سۆسیالیزم کە تەنیا دەیتوانی لە دژبەرییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان و هەوڵەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری پێك بێ، هەبووە. کەوابوو سۆسیالیزم خاوەنی پێشکەوتووترین و کۆتاییترین شێوەی بەرهەمهێنان لە گەشەسەندنی کۆمەڵگای مرۆییە. چونکە، یەکەم سۆسیالیزمی پشت بەستوو بە زانست و تەکنۆلۆژییای پێشکەوتوو دەبێتە دیسیپلینی پیشەسازی و بان پیشەسازیی سەرمایەداری و دووەم، بەرهەمی شۆڕشی سیاسی ئەو کۆکردنەوەی خاوەندارێتی تایبەتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنەر و مەودای چینایەتییە و کۆڵەکەکانی دیموکراسی راستەقینە کە لەودا کۆنترۆڵی ئامرازی بەرهەمهێنان لە دەستی ئەنجوومەنە بەربڵاوەکان دایە کە هەموو خەڵکی لەخۆ گرتووە و پێشکەوتنی هەر گرووپێك، بەستراوە بە پێشکەوتنی هەموو گرووپەکانە، دادەرێژێ.

لە رەوشی دیموکراسی راستەقینەدا، دەوڵەت نامێنێ و حکوومەتی تاکەکان، جێگای دەگرێتەوە. لە قۆناغی سۆسیالیزمدا، مرۆڤ نە تەنیا لە تایبەتمەندیی سەرکوتکەرانەی شێوازەکانی پێشووی بەرهەمهێنان و بە تایبەتی قۆناغی سەرمایەداری رزگاری دەبێ بەڵکو بە رەخساندنی دەرەتانی پێویست بۆ کۆنترۆڵی بارودۆخ، مرۆڤ لە فشاری سروشت رزگار دەکا.

(1) Social Productive Forces.

(Marx and Engels, 1955, p.482) هەروەك لە شوێنەكانی دیكەدا ئاماژەم پێكـردووە، ئەم روانینەی كلاسیك نیشانی دەدا كە سۆسیالیزم پاش بە پیشەسازی بـوون دێتـەدی، مانـای لۆژیكیانـەی ئـەم خوێندنەوەیـە، ئەمەیـە كـە هـیچ شـێوازێكی تایبـەتی سۆسیالیـستی بـۆ دەستڕاگەیشتن بە گەشەسەندن لە ئارادا نییە چونكە سۆسیالیزم ئامرازێك نییە بـەڵكو رەوشـی كۆتاییە. ئەم خوێندنەوە كلاسیكە لە گەشەسـەندن وەك پێـشمەرجی سۆسـیالیزم، ئەمڕۆكـەش لەلایەن هەندێك لە ماركسیستە بە ناوبانگـەكانی رۆژئـاوا وەك پـاوڵ بـاران[1]، بیـل وارن[2] و هتد... پەسند كراوە. (Hyden, 1985)

## دەرئەنجام

پاش ئاماژە بە رێگا سەرەكییەكانی بیرۆكەی گەشەسەندن لـەم فەسـڵەدا، لـە فەسـڵەكانی دواییدا ئاماژە بە هەندێك لە خوێندنەوە گرینگ و جێگای سەرنجەكانی گەشەسـەندن و بابەتـە گرینگەكانی كە لە ساڵەكانی دوای جەنگی دووەمی جیهانی بایەخیان پێدراوە، دەكەم.

(1) Paul A. Baran.
(2) Bill Warren.







# فەسڵی سێهەم

## چەمکەکانی گەشەسەندن

**پێشەکی:**

ئەندێشەی مۆدێرنیزاسیۆن، هەڵدان و پرۆگرامەکانی هاوسەنگی پێکهاتەیی لەگەڵ هەوڵدان بۆ نۆژەنکردنەوە و پەرەپێدانی ئابوورییەکانی رۆژئاوا وەك قەڵغانێك لە بەرامبەر کۆمۆنیزم، گرینگترین هۆکار و تایبەتمەندیی ئۆرتۆدۆکسی دوای جەنگ لە پێوەندی لەگەڵ گەشەسەندندا بووە. (Packenham, 1973)

هەرچەند لەو سەردەمەشدا روانگەی جۆراوجۆر لە پێوەندی لەگەڵ چۆنیەتی دەستڕاگەیشتن بە گەشەسەندن و ئارمانەکانی کۆتایی ئەو هەبوون، بەڵام باسی جیددی سەبارەت بە پرسگەلێك وەك گەشەسەندنی مرۆیی و کۆمەڵایەتی یان گەشەسەندن وك عەدالەتی کۆمەلایەتی لە گۆڕێدا نەبوون و ئەم جۆرە پرسانە- لەکاتی هێنانە بەرباسیش- تەنیا لە ئاستی قسەدا مانەوە و بابەتی سەرەکی زۆرتر هەوڵدان بۆ دەستڕاگەیشتن بە ((هەڵدان))[1] بووە.

پێداگرتن لەسەر پرسی ((هەڵدان)) بەتایبەتی لە یاساکان، چۆنیەتی بیرۆکەکان، سیاسەتەکان و ڕاگەیەندراوەکانی دامەزراوە نێونەتەوەییەکان دوای جەنگ وەك بانکی جیهانی و سەندووقی نێونەتەوەیی دراو، بە ئاشکرا دەبینرێ. ئەم دامەزراوانە بە سەرنجدان بە دەسەڵاتی وڵاتانی پیشەسازی لەسەر ئەوان لە تەواوی پرۆگرامەکان و هەڵسوکەوتەکانی خۆیان هەڵدانی ئابووری و مۆدێرنیزاسیۆنی پێکهاتەییان لە ئەولەوییەت دادەنا و بایەخێکی ئەوتۆیان بە گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی نەدەدا. (Payer, 1974)

چۆنییەتی بیرکردنەوەی زاڵ بەسەر ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانیش جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ دامەزراوە نێونەتەوەییەکانی ئاماژەپێکراو نەبوو. هەروەك چۆن لە راپۆرتی ئەم ڕێکخراوە لە ساڵی ١٩٥١ لە پێوەندی لەگەڵ ((هەڵسوکەوتی پێویست بۆ گەشەسەندنی

(1) Growth.



ئابووری لە وڵاتە گەشە نەکردووەکان)) دەریدەخان، پێداگری ئەم ڕێکخراوەش لەسەر چەندین پرس لەوانە داهاتی راستەقینەی سەرانە، گەشەسەندنی تەکنۆلۆژیای پێشکەوتوو، راپۆرتی ڕێژەی سەرمایە و گەشەسەندنی سەرچاوەکانە کە نیشاندەری ئەولەویەتی ((هەڵدان))[1] لە چۆنیەتی بیرکردنەوەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بەرامبەر گەشەسەندنە.

لە راپۆرتێکی دیکەشدا کە لە ساڵی ١٩٦٤ سەبارەت بە ((گەشەسەندنی ئابووریی ئەمەریکای لاتین لە قۆناغی دوای جەنگ)) لە لایەن ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بڵاوبووەوە، چەمکی ((گەشەسەندن)) هاوسان بوو لەگەڵ ((هەڵدان)) و باسێکی زۆر سەبارەت بە گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی ئەمەریکای لاتین، ئاستی تەندروستی، خوێندەواری، بارهێنان، عەدالەت یان ژینگە نەکراوە. (United Nations, 1964)

کەوابوو، کاتێك کە کۆمەڵەی گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە کانوونی یەکەمی ١٩٦١، دەیەی ٦٠ وەك ((دەیەی گەشەسەندنی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان)) دەناسێنێ، دیارە کە گەشەسەندنی بە مانای ((هەڵدانی ئابووری)) لەبەرچاو گرتبوو لە گەشەسەندن هەتا گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی.

بەڵام تێپەڕبوونی زەمان هەموو شتێکی گۆڕی، لە سەرەتای دەیەی ٦٠ بە دواوە، فاکتۆرگەلی نوێ لە پێناسەی چەمکی گەشەسەندن بەکاردەهاتن.

یەکەم، زۆربەی وڵاتانی داگیرکراوی پێشوو، سەربەخۆ بوون و ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان-لانیکەم لە کۆڕی گشتی و بەشە ئیدارییەکانی ڕێکخراو- گۆڕانی بەسەردا هات. (Dadiza, 1993, p.300) دەوڵەتانی نوێ و تازە سەربەخۆ بوو، بەخێرایی توانیان کاریگەری لەسەر گەیەندراوەکان و چۆنیەتی بیرکردنەوەی زاڵ بەسەر کۆڕی گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دانێن. هەرچەند ئەم دەوڵەتانەی جیهانی سێهەم، دەسەڵاتی ئەوەیان نەبوو کاریگەریی لەسەر بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش و هێزە گەورەکان دابنێن، بەڵام بە کەڵك وەرگرتن لە نفوزی خۆیان توانییان یارمەتی بە بەرفراوانبوونی باسەکان، لێکۆڵینەوەکان، بڕیارنامەکان و ڕاگەیەندراوەکان کە لە پێوەندی لەگەڵ لایەنە جۆراوجۆرەکانی گەشەسەندن بەتایبەت ((گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی))[2] بوون، بدەن.

(١) مەبەستی نووسەر لە بەکارهێنانی وشەی (هەڵدان) لە راستیدا هەڵدانی ئابووری بووە. (وەرگێڕی فارسی)

(2) Social development.





دووەم، بڵاوبوونەوەی چەمکی نوێی گەشەسەندن، تا رادەیەکیش لە ژێر کاریگەریی هەوڵە سیاسییەکانی هەندێك لە رێبەرانی جیهانی سێهەم وەك سەرۆك کۆماری پێشووی تانزانیا، نیەرەرە[١]، کە پێی وابوو، ئامانجی گەشەسەندن ئامانجێکی ئینسانییە، بووە. ناوبراو لەسەر ئەو بڕوایە بوو کە ئەو بەرژەوەندییانەی کە لە ئاکامی ((هەڵدانی ئابووری))، وەدەست دێن و دەبێ بە شێوەی ((بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی)) لە خزمەتی تەواوی خەڵك و بەتایبەتی چین و توێژی هەژاری کۆمەڵگادا بێ. دوو دەیەی پێش لە سەرۆك کۆماری تانزانیا، جەواهر لەعل نەهرۆ، لە وتەیەکیدا لە رۆژی سەربەخۆیی هیند ئامانجی سەرەکیی دەوڵەتی نوێی ((لە نێوبردنی هەژاری، نابەرامبەری دەرەتانەکان و نەخۆشی)) راگەیاند. (Moraes, 1957) دەتوانین وتەی ئەوتۆ بە زۆری لە وتارەکان و راگەیەندراوەکانی تەواوی رێبەرانی جیهانی سێهەم لە ساڵە سەرەتاییەکانی سەربەخۆییدا ببینین. بەم جۆرە، دەتوانین بڵێین کە ئەم بیرۆکانە، کاریگەرییەکی زۆری لەسەر پرۆگرامەکانی رێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکان نەبووە.

سێهەمین هۆکار کە بە توندی چەمکی سەرەتایی باسکراو لەم فەسڵە دەداتە بەر رەخنە، کۆمەڵێك ئەزموون بوون کە نیشاندەری ناکارامەیی ستراتیژییەکانی گەشەسەندن لە وڵاتان بوو. ئەم ئەزموونانە دەریاندەخست کە ئەگەر گەشەسەندن بووە هۆی هاتنەدی بەرژەوەندییەك، ئەم بەرژەوەندییە تەنیا لە پێناوی حەزی بەشێکی بچووك لە کۆمەڵگادا بووە.

ئەم خاڵە، بە باشی لە کۆبوونەوەیەکدا کە لە لایەن رێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکان سەبارەت بە ((سیاسەتە کۆمەڵایەتییەکان و دارشتنی پرۆگرام لە پێوەندی لەگەڵ گەشەسەندنی نەتەوەیی)) لە ساڵی ١٩٦٩ بەڕێوەچوو، دەردەکەوێ. راپۆرتی کۆتایی ئەم کۆبوونەوەیە بە روونی رایگەیاند کە: ((رەنگە گەشەسەندن ببێتە هۆی دواکەتوویی یان لە هەندێك حاڵەتدا ببێتە هۆی پێك هاتنی ناوچە هەژارنشینەکان، دابەزینی ئابووری و لە پەراوێزخستنی وڵاتان)).

بەم جۆرە، بیرۆکەی هەندێك لە کارناسان بووە هۆی ئەوەی کە رێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکان لە راگەیاندنی دووەمین دەیەی گەشەسەندن لە ساڵی ١٩٧٠، پێ لەسەر ئەم خاڵە دابگرێ کە چەمکی گەشەسەندن، چەمکێکی گشتی و ئاڵۆزە کە بریتییە لە رەهەندەکانی ئابووری لەگەڵ رەهەندە کۆمەڵایەتی، سیاسی و بەڕێوەبەرییەکان. (International Social evelopment Review, 1971, p.4)

(1) Nye Rere.



بەم جۆرە هەرچەندە چەمکی مۆدێرنیزاسیۆن هەروا یەکێك لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی پێناسەی گەشەسەندن لای رێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکان بوو، بەڵام هاوکات تایبەتمەندییەکانی وەك خۆراك، بارهێنان و تەندروستی، گۆڕانکاریی کۆمەلایەتی، چاکسازی زەوییە کشتوکاڵییەکان، گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی، کەمکردنەوەی نابەرامبەرییەکان لە دابەشکردنی سەرچاوەکان و بردنە سەری رێژەی بەشداریی خەڵکیش (بەتایبەتی ژنان) وەك هۆکارە سەرەکییەکانی دەستڕاگەیشتن بە گەشەسەندن هاتوونەتە بەرباس.

ئەم چەمك و بیرۆکانە بە باشی لە پرۆگرام و کارکردەکانی دامەزراوە نوێیەکانی رێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکان وەك دامەزراوەی لێکۆڵینەوەی رێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکان بۆ گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی[١] کە لە ساڵی ١٩٦٣ دامەزرا و پرۆگرامی ئاوەدانکردنەوەی رێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکان[٢] کە لە ساڵی ١٩٦٥ دامەزرا، رەنگی دایەوە.

بۆ وێنە دامەزراوەی لێکۆڵینەوەی رێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکان بۆ گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی لە ساڵی ١٩٨٠، لێکۆڵینەوەیەکی بۆ پێناسەی ((رێگاچارەیەکی دیاریکراو بۆ دارشتنی پرۆگرامی گەشەسەندن و راڤەکردنی)) بە پێی ئەزموونەکانی دەیەی ٧٠ ئەنجامدا. ئاکامی ئەم لێکۆڵینەوەیە، نیشاندەری گرینگی رۆڵی سەربەخۆیی نەتەوەیی، بەشداری خەڵك، دابەشکردنی سەروەت و پشتیوانی لە ژینگە و پێوەندیی مرۆیی لە گەشەسەندنە.

بەم جۆرە دەردەکەوێ کە وێنەی بەربڵاوی پەرەسەندنی کۆمەلایەتی و هەموو لایەنەکانی، بەشێوەی حاشا هەڵنەگر پێویستی بە چەمکەکانی سیاسی و رادیکاڵە بۆ پێناسەکردنی ئامانج و ئامرازەکانی دەستڕاگەیشتن بە گەشەسەندن.

چونکە وێنەیەکی ئەوتۆ، نە تەنیا هەڵدان و گەشەسەندنی ئابووری دەگرێتەخۆ، بەڵکو بریتییە لە رەوشی کۆمەڵایەتی گەشەسەندن بە تایبەتی چۆنیەتی دابەشکردنی ئەو بەرژەوەندییانەی کە ئاکامی هەڵدانی ئابووری وەدەست دێن.

چوارەمین هۆکار کە لە دروست بوونی چەمکی بەربڵاوی گەشەسەندندا رۆڵی گرینگ دەگێڕی، باوەڕی توندی رێبەران و خەڵکی جیهانی سێهەم بە چوونە سەری نابەرامبەری لەنێوخۆی کۆمەڵگای روو لە گەشە و بە تایبەتی لە نێوان ئەوان و کۆمەڵگای پیشەسازی بوو کە لە روانگەی ئەوانەوە پێویستی بە بایەخدانی جیددی هەیە.

(1) UNRISD.
(2) UNDP.

بەتایبەتی، ئەوان لەسەر ئەو بڕوایە بوون دابەشکردنی دووبارە و ڕێنوێنی کاریگەری سەرچاوە جیهانییەکان بۆ گەشەسەندنی وڵاتانی جیهانی سێهەم پێویستی بە گۆڕانکارییەکی قووڵ و چاکسازیی پێکهاتەیی لە زۆربەری دامەزراوە نێونەتەوەییەکان وەك سندووقی نێونەتەوەیی دراو، ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و بانکی جیهانی هەیە.

سەرەڕای ئەمەش، چوونە سەری قەرزەکان و کەمکردنەوەی یارمەتییەکان بە وڵاتانی جیهانی سێهەم لە دەیەی ١٩٧٠، نیشانیدا گۆڕینی ڕژێمی ئابووری نێونەتەوەیی ڕۆژئاواخوازیی حاکم بەسەر جیهان، لە چوارچێوەی بەرژەوەندی جیهانی سێهەم بە تایبەتی لە بوارەکانی وەك بەهای کەل و پەل و کاڵاکان، ڕاگواستنی تەکنۆلۆژیا و تیجارەت، پێویستی بە چاکسازی سیاسی و دامەزراوەکانە. (Williams, 1987, p.143)

ئەم بیرۆکەیە تاڕادەیەکی زۆر لە بڕیارنامەکان و ڕاگەیەندراوە جۆراوجۆرەکانی کۆبوونەوە نێونەتەوەییەکان لە دەیەی ١٩٧٠، بە تایبەتی بڕیارنامەی کۆڕی گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ١٩٧٤ کە نیشاندەری پێویستی دیسیپلینێکی ئابووری نێونەتەوەیی نوێ بوو، ڕەنگی دایەوە.

ئەم گەڵاڵە و پێشنیارانە لە ڕوانگەی دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکانەوە هەڕەشە بوو بۆ سەر بەرژەوەندییەکانیان. چونکە لە کاتی بەڕێوەچوونیدا، دەبووە هۆی دابەشکردنی سەرچاوە ئابوورییەکانی جیهان کە ئەم کارە بۆ خۆی، ئاسەوارێکی توندی سیاسی هەم لە ئاستی نێو نەتەوەیی و هەم لە ئاستی نێوخۆیی لێدەکەوێتەوە. (Williams, 1987, p.61)

دامەزراوەی داگ هامێرشۆڵد[1] لە ڕاپۆرتێکیدا لە ساڵی ١٩٧٥، گەڵاڵەیەکی دیکەی بۆ گەشەسەندن لە ژێر ناوی ((گەشەسەندن و هاوکاریی نێو نەتەوەیی)) بڵاوکردەوە. ئەم گەڵاڵەیە پێویستی بە گۆڕینی پێکهاتە سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان[2] بوو. ئەم گۆڕانکارییە بریتی بوو لە چاکسازی زەوییە کشتوکاڵی، چاکسازی شاری، دابەشکردنی دووبارەی سەروەت و ئامرازەکانی بەرهەمهێنان لە نێو وڵاتان و دابەشکردنی دەسەڵات لە ڕێکخراوەکان و دامەزراوە نێونەتەوەییەکان وەك ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، بانکی جیهانی و سندووقی نیونەتەوەیی دراو و هتد... ئەم گەڵاڵەیە، هەروەها بریتی بوو لە بەخشینی سەربەخۆیی (ئۆتۆنۆمی)ی سیاسی بە دەوڵەتەکان بۆ دیاریکردنی ڕێوشوێنی خۆجێیی و سەربەخۆیی گەشەخوازی کە دەبێ هەماهەنگ لەگەڵ ژینگە بێ.

(1) Dag Hammerskjold Fundation.
(2) Socio-Economic.



بەڵام دەبێ بڵێین، هیچ یەك لەم گەڵاڵانە بە بێ پێکهێنانی گۆڕانکاریی بەرچاوی پێکهاتەیی لە جیهان، دیموکراتیزەکردنی دەسەڵاتی بڕیاردانی ئابووری و سیاسی و بەهێزبوونی توانایی بەڕێوەبەریی و ئیداری نایەتەدی. (Day Hammer skjold Foundation, 1975, p.38)

لە ماوەی پێنج ساڵدا، دوای ئەوەی کە ئەندێشەکانی ئابووری و سیاسی نێو لیبراڵ لە سەرەتای دەیەی ٨٠ ناوەندە دەوڵەتییەکانی ڕۆژئاوای گرتەوە، زۆربەی گەڵاڵە و پێشنیارە سیاسی و ڕادیکاڵەکان (وەك پێویستی بە دیسیپلینێکی نوێی ئابووری) کاڵ بوونەوە و بایەخی خۆیان لە دەستدا. (Krasner, 1985).

دیارە، ئەگەرچی ئەو هەوڵانەی لە دەیەی ٦٠ و دەیەی ٧٠ بۆ سەرلەنوێ پێناسەکردنی چەمکی گەشەسەندن دران تاڕادەیەکی زۆر شکستی هێنا، بەڵام ئەم هەوڵانە بوونە هۆی ئەوەی کە بابەتی گەشەسەندنی کۆمەلایەتی، بەردەوام لە بەرنامەی کاری گەشەسەندندا بێ. ئەم دیاردەیە بەم مانایەیە کە، هەرچەند هەوڵدان بۆ دەستڕاگەیشتن بە هەڵدانی ئابووری-ئەمجارە لە لایەن کەرتی تایبەتی بە جێگای دەوڵەت- جارێکی دیکە لە ئەولەوییەتی زۆربەی پێناسە پێشکەشکراوەکان لە چەمکی گەشەسەندن لە کۆتاییەکانی دەیەی ٨٠ و دەیەی ١٩٩٠ دانرا. بەڵام هیچ کات ئەم ئەگەرە لە ئارادا نییە کە چەمکی گەشەسەندن تەنیا وەك هەڵدانی ئابووری پێناسە بکەن.

سەرەڕای ئەوەی کە دەستڕاگەیشتن بە چەمکێکی بەربڵاوی ئەوتۆ لە گەشەسەندن (لەگەڵ گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی) بە کردەوە زۆر دژوارە، بەڵام یەکێك لە کارمەندانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە کۆتایی دەیەی ٨٠ دا دەنووسێ: ((ئێستا، گەشەسەندن بە ڕێژەیەکی یەکجار زۆر وەك ڕەوتێکی خەڵکی و عادیلانە لەبەر چاودەگیرێ کە ئامانجەکەی باشکردنی ڕەوشی ژیانی مرۆڤە)). (Dadzie, 1993, p.307)

هاوتەریب لەگەڵ بیروبۆچوونی ڕادیکاڵانە کە پێویستی بە پێداچوونەوەی دیکەش لە چەمکی گەشەسەندن هەیە، گەڵاڵە و پێشنیاراتی میانەڕەو (ئاکادمیك)ی دیکەش پێشکەشکران کە هەوڵیان دەدا پێویستی هەڵدانی ئابووری و بابەتەکانی دیکەی وەك گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی و عەداڵەتی کۆمەڵایەتی تێکەڵ بکەن. یەکێك لەم بیروبۆچوونانە، بریتی بوون لە جێگیرکردنەوەی سەرلەنوێی گەشەسەندن لە چوارچێوەی تەوەری پێداویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤ.





## گەشەسەندن بە مانای دابینکردنی پێداویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤ[١]

لە دەیەی ١٩٧٠، ئەم خاڵە بە روونی سەلمێندرا کە لە زۆربەی وڵاتانی روو لە گەشە پێرەوی کردن لە گۆڕانکاری پێکهاتەیی و هەڵدانی ئابووری، ئاکام کاریگەریی ئەرێنی پێشبینیکراو لە تیۆریدا بە دواوە نەبووە. لە هەندێك حاڵەتدا —وەك بەرازیل— بەرژەوەندییەکانی وەدەست هاتوو لە هەڵدانی ئابووری، بەو جۆرە کە لە تیۆریدا پێشبینی کرابوو، لە توێژەکانی دەوڵەمەند بۆ توێژەکانی خوارەوە کۆمەڵگا پەرەی نەسەند. بە واتایەکی دیکە وانایەتە بەرچاو کە دەستڕاگەیشتن بە هەڵدانی ئابووری لەو کۆمەڵگایانەی کە پێشتر زۆر نابەرامبەر بوون (وەك ئەمەریکای لاتین)، بە شێوەی ئۆتۆماتیك ببێتە هۆی کەمبوونەوەی نابەرامبەرییەکان، هەرچەند کە رەوشی خەڵك لە بەراورد لەگەڵ رابردوو بە شێوەیەکی بەرچاو باش بووە. لە لایەکی دیکەوە، هەڵدانی ئابووری لانیکەم لە سەرەتاوە، لە باشترین حاڵەتدا بووە هۆی بەردەوامبوونی نابەرامبەرییەکانی رابردوو و لە خراپترین حاڵەتیشدا بووەتە هۆی زۆربوونی نابەرامبەرییەکان.

دیارە، هەرچەند تیۆرگەلێکیش ئەم بابەتەیان وەك دیاردەیەکی کاتی و تێپەڕبوو دەزانی و پێیان وابوو کە بەرامبەری بەڵێنی دراو دواتر دێتە دی، بەڵام پێشبینی دەکرا نارەزایەتی و دڵنیا نەبوونێکی بەربڵاو بەرامبەر بە بەڵێنی دەستڕاگەیشتن بە یەکسانی و ئاکامە ئەرێنییەکانی دیکەی هەڵدانی ئابووری لە نێو بیروڕای گشتی لە ئارادا بێ. (Kuznets, 1995)

ئاکامی لێکۆڵینەوەیەك کە لەلایەن گرووپێکی لێکۆڵەری سەر بە بانکی جیهانی لە پێوەندی لەگەڵ ئاکامی بەدواداچوونی ستراتیژیی گەشەسەندن لە وڵاتانی گەشە نەکردوو لە سەرەتای دەیەی ٧٠ بەڕێوەچووە، نیشانی دەدا کە: ((ئێستا دەرکەوتووە کە زیاتر لە یەك دەیە هەڵدانی خێرای ئابووری لە وڵاتانی گەشە نەکردوو، قازانجێکی یەکجار کەمی بۆ نزیکەی یەك سێهەمی حەشیمەتەکانیان بە دواوە بوو سەرەڕای ئەوەی کە نێونجی داهاتی سەرانە لە وڵاتانی جیهانی سێهەم لە ساڵی ١٩٦٠ نزیکەی ٪٥ گەشەی کردووە، بەڵام ئەم گەشەیە بە شێوەی نابەرامبەر لە نێوان وڵاتەکان، ناوچەکانی نێو وڵاتان و گرووپە کۆمەڵایەتی-ئابوورییەکان دابەش بووە)). (Chenery etal, 1974)

خاڵی سەرنج ڕاکێشی ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەمەیە کە لە هەندێك لەو وڵاتانەی کە توێژە هەژارەکانی کۆمەڵگا بە شێوەی یەکسان و عادیلانە کەڵك لە ئاکامی هەڵدانی ئابووری وەردەگرن، دەوڵەت رۆڵی کاریگەر و چالاکی لە دابەشکردنی داهاتەکان گرتووەتە ئەستۆ.

(1) Development as the Satisfaction of basic Human Needs (BHN).



بە واتایەکی دیکە، کەسانێك کە بیرۆکەی (دابەشکردنی سەرلەنوێ هاوڕێ لەگەڵ هەڵدان)[١] یان هێناوەتە بەرباس، بە تەواوی بڕوایان بە رۆڵی سەرەکی سیاسەت لە گەشەسەندندا هەیە.

بەو جۆرەی کە ریچارد جوولی[٢] یەکێك لە لێکۆڵەرانی لێکۆڵینەوەی ئاماژەپێکراو دەڵێ: ((بواری سیاسەت بەردەوام وەك هۆکارێکی دیاریکەری زۆر گرینگە سەبارەت بە ستراتیژی دابەشکردنی سەرلەنوێ هاوڕێ لەگەڵ هەڵدانی ئابووری)). (Jolly, 1975, p.11)

لە حاڵێکدا ئاکامی لێکۆڵینەوەی ئاماژەکراو لەسەر رۆڵ و گرینگی دابەشکردنی سەرلەنوێ وەك یەکێك لە رەوشەکانی گەشەسەندنی هەمە لایەنە پێ دادەگرێ، بەڵام پێناسەیەکی نوێی لە چەمکی گەشەسەندنی پێشنیار نەکردووە.

لەڕاستیدا، ئەم لێکۆڵینەوەیە تەنیا دەریخست کە ئەو دەستە لە چەمك و ستراتیژییانەی گەشەسەندن کە تەنیا پێ لەسەر هەڵدانی ئابووری دادەگرن، بەرامبەر بە پرسەکانی پێوەندیدار بە عەدالەتی کۆمەڵایەتی و هەڵدانی هاوسەنگ زۆر سنووردارە.

لەڕاستیدا، لێکۆڵینەوەکانی دوایی لە دەیەی ٨٠ نیشانیدا، کە پشتیوانییەکی یەکجار کەم لە گریمانەی ((بڵاوبوونەوە لە سەرەوە بۆ خوارەوە))[٣] کراوە و بەڵام بەڵگەی زۆر لەبەر دەستدایە لە پێوەندی لەگەڵ لاینگری لە گریمانەی ((بڵاوبوونەوە لە خوارەوە بۆ سەرەوە))[٤].

ئەم لێکۆڵینەوانە دەریدەخەن کە سەرلەنوێ دابەشکردنی سەرەتایی و هێنانەدی پێویستییەکان لە رێگای گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی دەرفەتێکی لەباربوو بۆ دەستڕاگەیشتن بە هەڵدانی ئابووری. (Newman and Tomson, 1989, p.469)

یەکێك لە تیۆریسییەنەکان کە هەوڵێکی زۆری بۆ پەرەپێدانی رەهەندەکانی چەمکی گەشەسەندن، بانتر لە جێگیربوونی نەریتی ئەو لەسەر پرسی ((هەڵدان)) داوە، ئابووریناسی بەریتانیا، دادلی سێرزە[٥]. ناوبراو بە بڵاوکردنەوەی چەندین وتار لە دەیەی ١٩٦٠، رەخنەی لە پێناسەی گەشەسەندن وەك هەڵدانی ئابووری گرتووە.

سێرز پێی وایە، ئەو کێشانەی کە دەبێ گەشەسەندنی وڵاتێك چارەسەری بکا بریتییە لە: هەژاری، بێکاری و نابەرامبەری. ناوبراو لەسەر ئەو باوەڕەیە ئەگەر پاش قۆناغێکی چەند

(1) redistribution with Growth.
(2) Richard Jolly.
(3) Trickle-down thesis.
(4) Trickle-uo thesis.
(5) Dudley Seers.





ساڵە، ٣ تایبەتمەندیی ئاماژەپێکراو لە وڵاتێکدا باش بەڕێوەبچێ، دەتوانین بڵێین کە وڵاتی دیاریکراو لەو قۆناغەدا لە ڕێڕەوی گەشەسەندن هەنگاو دەنێ. بەڵام ئەگەر یەك یان دوو تایبەتمەندی لە تایبەتمەندییەکانی ئاماژەپێکراو، لە هەمان قۆناغدا، خراپتر بێ (بە تایبەت ئەگەر هەر سێ تایبەتمەندی زیاد بکا) بە هیچ جۆر ناتوانین بڵێین کە وڵات لە ڕێڕەوی گەشەسەندن هەنگاو دەنێ، تەنانەت ئەگەر نێونجی داهاتی سەرانەی وڵاتیش چووبێتە سەرەوە. (Seers, 1969, p.3) لەگەڵ ئەمەشدا، لە سەرەتای دەیەی ٧٠، ڕێکخراوی نێونەتەوەیی کار[1] و پرۆگرامی جیهانی دامەزراندن[2] (کە سێرز لەودا ڕۆڵێکی گرینگی هەبوو) رایانگەیاند کە دامەزراندن ڕۆڵی سەرەکی هەیە لە کەمکردنەوەی هەژاری و بەهێزکردنی ڕەوتی گەشەسەندن لە ڕێگای هێنانەدی ((پێداویستییە سەرەکییەکان))[3]. (Ilo, 1979)

ئاکامی لێکۆڵینەوەیەکی ئەوتۆ، چەمکی گەشەسەندنی وەك ڕەوتی هێنانەدی ((پێداویستییە سەرەکییەکان)) پێناسە دەکا و پێوەری گەشەسەندنیش ((ڕێژەی هاتنەدی پێداویستییە سەرەتاییەکانی (سەرەکی) کۆمەڵگا و تاکەکان)) لە بەرچاو دەگیرا. (Green, 1978, p.7)

((پێداویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤ))[4] کامانەن؟ شایانی باسە کە زۆربەی لایەنگرانی چەمکی گەشەسەندن وەك ((دابینکردنی پێداویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤ)) پێیان وایە کە ئەم پێداویستیانە بریتییە لە ٢ جۆر پێداویستی ماددی و مەعنەوی. خوێندنەوەیەکی ئەوتۆ لە گەشەسەندن بە دوای ئەوەدا دێ کە تەواوی پێداویستییە کۆمەڵایەتی، دەروونی و فیزیاییەکان باش بکا.

بەم جۆرە دەتوانین بڵێین ((پێداویستییە سەرەکییەکان)) بریتین لە:

١- پێویستی بە خودموختاری.
٢- پێویستی بە باوەڕ بە خۆبوون و پشت بەستن بەخۆ.
٣- ئاسایش و ئازادیی سیاسی.
٤- بەشداری لە بڕیاردان.
٥- ناسنامەی نەتەوەیی و فەرهەنگی.
٦- هەستێکی مەبەستدار لە ژیان و کار (Streeten, 1979, p.136)

(1) International Labour Organization.
(2) World Employment Programme.
(3) Basic Needs.
(4) Basic Human Needs.



بەڵام سەرەڕای ئەم بیرۆکانە، لە کردەوەدا ئەولەوییەت بە پێداویستییە ماددییەکان بوو و بایەخدان بە مافی مرۆڤ و مافی سیاسی ساڵەکانی پاش دەیەی ٩٠، هاتەدی.

لە روانگەی ڕێکخراوی نێونەتەوەیی کار، ((پێداویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤ)) بریتییە لە ٥ بابەتی سەرەکی. ئەم ٥ بابەتە بریتییە لە: کاڵاکانی پێویست بۆ بەکارهێنانی بنەماڵە (خۆراك، جل و بەرگ و خانوو) خزمەتگوزارییە سەرەتاییەکان (پەروەردە و بارهێنان، ئاو، تەندروستی و راگواستن)، بەشداری لە بڕیاردان، هاتنەدی مافە سەرەتاییەکانی مرۆڤ و پەیداکردنی پیشەی بەرهەمهێنەر[1] (بۆ وەدەست هێنانی داهاتی پێویست بە مەبەستی دابینکردنی پێداویستییەکانی بنەماڵە). (I Lo, 1976, p.32)

بە واتایەکی دیکە، گەشەسەندن وەك دابینکەری بەردەوامی و ڕێك و پێکی پێداویستییە سەرەتاییەکانی، بریتییە لە ((دابەشکردنی سەرلەنوێی داهات، پێداویستییەکان[2] و دەسەڵات)). (Green, 1978, p.8)

هەرچەند کە هەندێك لە پشتیوانانی ڕەوتی گەشەسەندن وەك ((دابینکەری پێداویستییە سەرەتاییەکان)) پێیان وایە کە ئەم ستراتیژییە بە پێچەوانەی ((هەوڵدان بۆ بە لوتکە گەیاندنی ڕێژەی هەڵدانی ئابووری و ئەولەوییەت دان بە کەڵەکەکردنی سەرمایە))یە، بەڵام ڕێکخراوی نێونەتەوەیی کار، لەسەر ئەو باوەڕەیە کە هەڵدانی خێرای ئابووری یەکێك لە گرینگترین فاکتۆرەکانە لە ستراتیژی دابینکردنی پێداویستییە سەرەتاییەکان. (I Lo, 1976, p.33)

بیرۆکەی ((پێداویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤ)) وەك کاریگەریی بیرۆکەی گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی و عەدالەتی کۆمەڵایەتی لە دەیەی ٦٠ و ٧٠ بە دوای پەرەپێدان و بەهێزکردنی ڕەهەندەکانی فەرهەنگی-سیاسی و شێوازەکانی گەشەسەندندا بووە.

بەڵام هێنانە بەرباسی ئەم دیاردە نوێیەش زۆر ئاسەواری سیاسی بە دواوە بووە و تیۆریسینەکانی بیرۆکەی ((پێداویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤ)) ئاگایان لەم ئاسەوارانە هەبووە.

بە دڵنیاییەوە، هەر جۆرە پێناسە یان ستراتیژی نوێی گەشەخوازی کە ببێتە هۆی سەرلەنوێ دابەشکردن یان هێنانەدی ((پێداویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤ))، پێویستی بە هەڵوێستی گونجاوی سیاسی لە ڕێگای دەوڵەتەوە هەیە. (Bell, 1974)

(1) Productive Employment.
(2) Assets.





لە لایەکی دیکە، بەهۆی ئەوەی کە بازاڕ —بۆ خۆی— توانای دابەشکردنی عادیلانەی بەرژەوەندییەکان و سوودەکانی هەڵدانی ئابووری و هێنانەدی ((پێداویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤ))ی نەبوو، گرینگی ڕۆڵی دەوڵەت لەم ڕەوتە هەرچی زیاتر، ڕوون دەبووەوە.

بەڵام بە هاتنی دەیەی ١٩٨٠، بەهۆی سەرهەڵدانی نیولیبراڵیزم و بڵاوبوونەوەی لە پرسە جۆراوجۆرەکانی سیاسی و ئابووری و زاڵبوونی ئەم بیرۆکەیە لە زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاوایی و ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان، ڕۆڵی دەوڵەت لە گەشەسەندن بە توندی درایە بەر ڕەخنە. کەوابوو بازاڕ بووە داینەمۆی گەشەسەندن و جارێکی دیکە ((هەڵدانی ئابووری)) لە ناوەندی ستراتیژی گەشەسەندن جێی گرت.

بەم جۆرە، تیۆرییەکانی پەیوەندیدار بە ((سەرلەنوێ دابەشکردنی سەروەت و دابینکردنی پێداویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤ)) بە هەمان خێرایی کە لە نیوەی یەکەمی دەیەی ٧٠ پەرەی ئەستاندبوو، لە بەرنامەی باس و بابەتی لێکۆڵینەوەی تایبەت بە گەشەسەندن هاتە دەرەوە و گرینگی خۆی لەدەستدا. هۆکارەکەی بۆ ئەمە دەگەڕێتەوە کە زۆرجار سیاسەت لە وڵاتانی ڕۆژئاوایی و دامەزراوە نێونەتەوەییەکان لەم دەیەیە، بە جێگای دەوڵەت پێیان لەسەر ڕۆڵی بازاڕ وەک هۆکاری دەستەبەرکردنی گەشەسەندن دادەگرت.

دیارە جارێکی دیکە لە سەرەتای دەیەی ٩٠ چاوخشێندرایەوە بەسەر ڕۆڵی دەوڵەت لە گەشەسەندن و هاتەوە ناو باس و لێکۆڵینەوەکانی گەشەسەندن لەم نێوەدا هیچ دامەزراوەیەکی دیکە بە قەت بانکی جیهانی بایەخیان بەم ئاڵوگۆڕە لە تیۆری و پرۆگرامەکانی گەشەسەندن نەداوە.

## بانکی جیهانی و گەشەسەندن

لێکدانەوە و پێناسەی ڕەوتی کامڵبوونی چەمکی گەشەسەندن و ئامانجەکانی لە قۆناغی دوای جەنگ، بەبێ ئاماژەکردن بە ڕۆڵی بانکی جیهانی بە هیچ جۆر کامڵ نابێ.

بانکی جیهانی، وەک یەکێک لە سەرەکیترین ڕۆڵگێڕی ڕەوتی گشتی گەشەسەندن لە جیهان و بەهۆی پێگە تایبەتییەکەی لە پێکهێنان و ناساندنی ستراتیژی جۆراوجۆری هەڵدانی ئابووری، ڕۆڵێکی بەرچاوی لە پرۆسەی کامڵبوونی گەشەسەندن گێڕاوە. (Wade, 1996, p.5)

دیارە، بانکی جیهانی هیچ کات پێناسەی فەرمی خۆی لە چەمکی گەشەسەندن پێشکەش نەکردووە، بەڵام بە لێکدانەوەی ئامانج و ڕەوتەکانی گەشەسەندن کە لە بڵاوکراوە جۆراوجۆرەکانی بانکی جیهانیدا ڕەنگی داوەتەوە، دەتوانین ئاگاداری خوێندنەوەکانی بانکی جیهانی لە چەمکی گەشەسەندن بین.



بەپێی ڕێککەوتننامەی سەرەتایی پێکهێنانی بانکی جیهانی، مەبەست لە پێکهێنانی بانک بەهێزکردنی نۆژەنکردنەوە و پەرەپێدانی ئەورووپا لە قۆناغی دوای شەڕ باسکراوە. ئامانجەکانی ئەم ڕێککەوتننامەیە بریتییە لە: نۆژەنکردنەوە و پەرەپێدانی سەرچاوەکان و دەرەتانەکانی بەرهەمهێنەر، پەرەپێدانی وەگەڕخستنی سەرمایەی تایبەتی دەرەوە و زیادکردنی ئاستی بەرهەم و ستانداردی کار و ژیان لە وڵاتانی ئەندام. (IBRD, 1989)

بە کورتی دەبێ بڵێین کە لە سەرەتای پێکهێنانی بانک، خوێندنەوەی بانک لە چەمکی گەشەسەندنی گونجاو لەگەڵ هەڵدانی ئابووری، گۆڕانی پێکهاتەیی و مۆدێرنیزاسیۆن بوو کە حاکم بوو بەسەر کەشی هزریی قۆناغی دوای جەنگ.

خوێندنەوەی بانک لە چەمکی گەشەسەندن و ئامانجەکانی، بە درێژایی ساڵانی دوایی، بەشێوەیەکی بەرچاو بڵاوبووەوە. بە درێژایی دەیەی ٧٠ (بە تایبەتی لە سەردەمی سەرۆکایەتی رابێرت مەک نامارا) بانکی جیهانی، لە حاڵێکدا هەڵدانی ئابووری وەک سەرەکیترین تایبەتمەندی گەشەسەندن چاو لێدەکرد، بە توندی لە راگەیەندراو و بەیاننامەکانیدا پێی لەسەر گرینگی ڕۆڵی ((گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی)) دادەگرت.

بە سەرنجدان بە ناڕەزایەتی بەربڵاو کە لە پێوەندی لەگەڵ یەکسان زانینی هەڵدانی ئابووری و گەشەسەندن لە ئارادا بوون، مەک نامارا ڕایگەیاند: لە حاڵێکدا بانک هەروا پابەندی بەڵێنییەکانی خۆی لە پێوەندی لەگەڵ ((وەگەڕخستنی سەرمایە و کەڵک وەرگرتنی بۆ هەڵدانی توانییەکانی بەرهەمهێنان لە وڵاتانی ڕوو لە گەشە)) دایە، بەڵام دەبێ قەبووڵی بکەین کە گەشەسەندن ئامانجی کۆمەڵایەتیشی هەیە کە بە دوای نەهێشتنی هەژاری و پێکهێنانی عەدالەتە (Mcnamara, 1970, p.6)

لەم ڕووەوە ناوبراو پێی وابوو کە دەبێ بانک ئاوڕێک لە بابەتەکانی دیکە وەک حەشیمەت، شارنشینی، چاکسازی زەوییە کشتوکاڵییەکان، دابەشکردنی داهاتەکان، تەندروستی و ژینگە، بداتەوە.

دەیەی ٨٠ بە ((دەیەی ونبوونی گەشەسەندن))[1] بەناوبانگە، چونکە ئەو ساڵانە شاهیدی سەرکەوتنی ((دژی شۆڕش لە تیۆری و سیاسەتەکانی گەشەسەندن))[2] بوو، کە نەتەنیا چەمکی گەشەسەندنی خستبووە ژێر کاریگەری خۆیەوە، بەڵکو کاریگەریی بەربڵاوی لە ستراتیژی و سیاسەتەکانی گەشەسەندن بەجێهێشت. (Toye, 1987)

(1) The Lost Decade for Development.
(2) Counter-Revolution in Development theory and Policy.





لە ژێر کاریگەری تیۆرییە ئابوورییەکانی نیولیبراڵەکان، زۆربەی وڵاتە گرینگەکانی ڕۆژئاوا و هەندێك لە وڵاتانی روو لە گەشە (بەتایبەت ئەمەریکای لاتین) ئەولەوییەتی سیاسەتەکانی خۆیان بەجێگای پێداگرتن لەسەر رۆڵی دەوڵەت و سەرلەنوێ دابەشکردنی سەروەت، بۆ رۆڵی سەرەکی بازاڕی ئازاد، کەمکردنەوەی بەشداری دەوڵەت لە رەوتی گەشەسەندن، بڵاوکردنەوەی تیجارەتی ئازاد و سیاسەتی وەگەرخستنی سەرمایەی دەرەوە گۆڕی.

هەروەك یەکێك لە لێکۆڵەران باسی کردووە، تەوەری سەرەکی رەوانگەی نیولیبراڵەکان سەبارەت بە گەشەسەندن دەتوانین بەم جۆرە گەڵاڵە بکەین: ((بازاڕە نەخۆشەکان[1] باشترە لە دەوڵەتە نەخۆشەکان)). (Colclough, 1993, p.3)

ئەم روانگانە لە دەیەی ٨٠، بەشێوەی سیاسەتی هاوسەنگ کردنی پێکهاتەیی لە بەرامبەر دابینکردنی قەرز، لە بانکی جیهانیدا رەنگی دایەوە.

بەم جۆرە لەژێر کاریگەریی بۆچوونەکانی نیولیبراڵەکان گەشەسەندنیش هەم وەك رەوت و هەم وەك ئامانجێك بە وردی پێناسەکراو هاتە بەرباس. ئەم پێناسانە بەتایبەتی بریتی بوو لە روانگەگەلێك وەك ئازادیی ئابووری، بازاڕی ئازاد، گەڵاڵەکانی کەرتی تایبەتی و نەهێشتنی کۆسپ و رێوشوێنی دەست و پێگیر و رایاندەگەیاند کە ئەم هەنگاوانە بارودۆخی پێویست بۆ سەرهەڵدانی تواناکانی بازرگانی[2] و تیجاری دەرەخسێنێ.

دیارە هەندێك لە روانگەکان، ئامانجی بەرینتری هەبوو کە بریتی بوون لە: ((کەمکردنەوەی دەسەڵاتی ئابووری و رێژەی کۆنترۆڵی دەوڵەت، کە لە کۆتاییدا دەبووە هۆی کەمبوونەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت لە کۆمەڵگا و زیادبوونی ئازادییە سیاسییەکان)). (Friedman, 1980, p.21)

بیرۆکەی ئەوتۆ سەبارەت بە گەشەسەندن، جارێکی دیکە پێی لەسەر ئەولەوییەتی ((هەڵدانی ئابووری)) بە جێگای گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی و نەهێشتنی هەژاری دادەگرت و پێیان وابوو لە درێژخایەندا هەڵدانی ئابووری پرسی هەژاری چارەسەر دەکا. (Colclough, 1993, p.6)

بەم جۆرە ئەم بیرۆکانە، تەواوی تیۆرییەکانی دەیەی ٦٠ و ٧٠ کە بڕوایان بە رۆڵی سەرەکی دەوڵەت لە گەڵاڵەکردنی، سەرلەنوێ دابەشکردنی سەروەت و دابینکردنی پێداویستییە

(1) Imperfect.
(2) Entrepreneurial.



سەرەکییەکانی مرۆڤ هەبوو، رەتکردەوە. سیاسەتی دابینکردنی قەرز لەلایەن بانکی جیهانی بە مەرجی هاوسەنگکردنی پێکهاتەیی وڵاتی وەرگری قەرز، کە نزیکەی یەك چوارەمی قەرزەکانی بانکی جیهانی لە دەیەی ٨٠ی لەخۆ دەگرت، هەوڵی دەدا هەتا ئەنگیزە و ئامرازی پێویست بۆ رێکخستنی سەرلەنوێی ئابوورییەکانی روو لە گەشە لەسەر بنەمای ئەسڵەکانی بیرۆکەی نیو لیبراڵەکان، برەخسێنێ. (Mosley, 1988)

بانکی جیهانی لە راپۆرتی گەشەسەندنی جیهانی لە ساڵی ١٩٩١، لەگەڵ ئاماژەکردن بە رۆڵی دەوڵەت و بازاڕ لە گەشەسەندنی وڵاتە جۆراوجۆرەکان، پێی لەسەر رۆڵی دەوڵەت لە لایەنەکانی گەشەسەندنی بازاڕ تەوەر، دادەگرتەوە و پێی وابوو کە ((دڵنیایی و بڕواهێنان بە توانایی دەوڵەت لە رێبەری کردنی گەشەسەندن دەبێتە هۆی دابەزینی پشت بەستن بە بازاڕ لە رەوتی گەشەسەندندا))، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا بانك پێی وایە کە دەستێوەردانی دەوڵەت لە گەشەسەندن تەنیا لە کاتێکدا کە زۆر پێویست بێ، دەبێ بەڕێوەبچێ.

لەگەڵ ئەمەشدا، بەڵگە و دیکۆمێنتەکانی بەردەست نیشانی دەدا کە هاوسەنگ کردنی پێکهاتەیی و قەرز لە وڵاتانی روو لە گەشە، هەزینەی یەکجار زۆر بەهۆی چوونە سەری بەهای کەرەستەکانی پێوەندیدار بە خۆراك، خزمەتگوزاری تەندروستی و پەروەردە و فێرکردن و هتد... بە سەر خەڵکی هەژاردا دەسەپێنی. (Demery, 1987; Glewwe, 1988, Longhurst, 1988)

لەبەر ئەم هۆیە، بانکی جیهانی لە راپۆرتی گەشەسەندنی جیهانی لە ساڵی ١٩٩١، روانگەیەکی چڕوپڕی لە گەشەسەندن پێشکەش کرد، کە گەشەسەندنی ئابووری بەم جۆرە پێناسە دەکا: ((بردنە سەری بەردەوامی ئاستی ستانداردەکانی ژیان کە پێداویستییەکانی ماددی، پەروەردە و بارهێنان، تەندروستی و پارێزگاری لە ژینگە لەخۆ بگرێ)).

یان بە واتایەکی دیکە ((گەشەسەندن لە پێناسەیەکی بەربڵاوتردا بریتییە لە چەندین لایەنی جۆراوجۆر وەك یەکسانی دەرەتانەکان، ئازادیی سیاسی و ئازادییە مەدەنییەکان)). کەوابوو مەبەستی گشتی گەشەسەندن بردنە سەری ئاستی مافی مەدەنی، مەزهەبی ئەوان)). (World Bank, 1991 a: 31)

دیارە وانایەتە بەرچاو کە خوێندنەوەیەکی ئەوتۆ لە گەشەسەندن لە چوارچێوەی بانکی جیهانی، لە کردەوەشدا، هاتبێتەدی.





ئەم خوێندنەوەیە، تەنیا تاڕادەیەك لە پرۆگرامەكانی دابینكردنی قەرز لە بوارەكانی پەروەردە و فێركردن، تەندروستی، ژینگە و ((كەرتی كۆمەڵایەتی)) لە دەیەی ٩٠ دا رەنگی داوەتەوە. (World Bank, 1998 a:8)

بانكی جیهانی لە راگەیەندراو و بەیاننامەكانی ئەم دواییەی خۆیدا، بە ئاشكرا گەشەسەندنی وەك هەڵدانی ئابووری و گەشەسەندنی كۆمەڵایەتی (هاوكات) پێناسەكردووە، هەروەها، بانك پێ لەسەر رۆڵی خۆی وەك بەهێزكەری ئابووری و پەرەپێدانی بازاڕ بۆ باشكردنی چۆنیەتی ژیانی خەڵك بەتایبەتی توێژی هەژار لە هەموو شوێنێكی جیهان دادەگرێ. (Word Bank, 1998 a: vii)

لە كۆبوونەوەیەكدا كە بانكی جیهانی، رێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان و رێكخراوی هاوكاری ئابووری و گەشەسەندن[1] بەڕێوەیان برد بانك ٦ ((ئارمانی كۆمەڵایەتی)) بۆ هەزارەی نوێ دیاریكرد كە بریتیین لە: كەمكردنەوەی هەژاری، پەروەردە و فێركردنی سەرەتایی بۆ هەموو خەڵكی جیهان، هەوڵدان بۆ یەكسانی رەگەز، كەمكردنەوەی رێژەی مردنی منداڵان، باشكردنی خزمەتگوزاری تەندروستی ژنانی دوو گیان و پارێزگاری لە ژینگە. (World Bank, 1999)

سەرەڕای ئەمەش، لوتكەی بە سیاسی بوونی خوێندنەوەی بانكی جیهانی لە چەمكی گەشەسەندن بە باشی لە باسەكانی بانك سەبارەت بە ((حكومەتگەرایی دڵخواز))[2] دەبینرێ. (World Bank, 1989, 1992, 1994)

لە ساڵی ١٩٩٧، كە بانكی جیهانی لە راپۆرتی ساڵانەی گەشەسەندن بە شێوەیەكی كتوپڕ جارێكی دیكە ئاماژەی بە باسی رۆڵی دەوڵەت لە رەوتی گەشەسەندندا كرد. سیاسەتەكانی ئەم دامەزراوە نێونەتەوەییە لە پێوەندی لەگەڵ گەشەسەندنی هەرچی زیاتری ((دەوڵەت تەوەر)) بووە. لەم راپۆرتەدا، بانك پێی وایە كە ((دەوڵەت وەك هۆكارێك (لە نێو فاكتۆرەكانی دیكە) رۆڵی ئاسانكاری و كاتالیزۆر لە رەوتی هەڵدانی ئابووری دەگێڕێ و لەم پێناوەدا رۆڵی سەرەكی لە گەشەسەندنی كۆمەڵایەتی و ئابووریدا هەیە)). (World Bank, 1997 b:1)

كەوابوو، لە كاتێكدا ئامانج، دەستڕاگەیشتن بەگەشەسەندنی كۆمەڵایەتی و ئابووریی سەقامگیربێ، دەبێ دەرەتانی دەوڵەت لە بواری ((توانایی بۆ بەڕێوەبردن و بەهێزكردنی هەڵسوكەوتی بە كۆمەڵی كارلێهاتوو)) زیاد بكا (World Bank, 1997, B: 1)

(1) Organization for Economic Cooperation and Development.
(2) Good Governance.



لە كۆتاییدا دەبێ بڵێین، لە حاڵێكدا هەڵدانی ئابووریی و هێزەكانی بازاڕ هەروا وەك هۆكار و تایبەتمەندیی سەرەكی لە سیاسەتی دابینكردنی قەرزی بانكی جیهانی ماوەتەوە، بایەخدان بە جیاوازی سەرەكی لە نێوان خوێندنەوەی بانك لە چەمكی گەشەسەندن لە ساڵەكانی دوای جەنگ و تێگەیشتنی بەربڵاوی ئەو لە ئامانجە كۆمەڵایەتی و سیاسییەكانی گەشەسەندن بۆ هەزارەی نوێ، زۆر گرینگە. لە زۆر بواردا، ئەم جیاوازییانە، نیشاندەری كاریگەری بیرۆكەی حاكم بەسەر وڵاتانی گەشەكردوو و روو لە گەشە لەسەر سیاسەتەكانی بانكی جیهانییە و دەستڕاگەیشتن بە ئامانجی راگەیاندراو بۆ هەزارەی نوێش، راستەوخۆ لە ژێر كاریگەریی رەوتە سیاسییەكانی حاكم بەسەر نێوخۆ و دەرەوەی پێكهاتەی بانكی جیهانیدا دەبێ.

### گەشەسەندن بە مانای ئازادی و پەرەپێدانی مافی هەڵبژاردن

لە حاڵێكدا خوێندنەوەكانی بانكی جیهانی لە گەشەسەندن لە سەردەمە جیاجیاكاندا، جیاواز و لە حاڵی گۆڕاندا بووە، لوتكەی باس و روانگەكان لە پێوەندی لەگەڵ گەشەسەندن لە رێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان، لە هەڵوێستێكی نوێی ((پرۆگرامی ئاوەدانكردنەوەی رێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان)) لە ساڵی ١٩٩٠ بە بڵاوكردنەوەی ((راپۆرتی ساڵانەی گەشەسەندنی مرۆیی))[1] دەركەوت.

لە زۆر لایەنەوە، ئەم راپۆرتە ئاماژەی بە بابەتگەلێك وەك گەشەسەندنی كۆمەڵایەتی، پێداویستییە سەرەكییەكانی مرۆڤ و سەرلەنوێ دابەشكردنی سەروەت، كە لە دەیەی ٧٠ باو بووە، دەكرد. بەڵام پێم وایە، بیرۆكەی سەرەكی پرۆگرامی ئاوەدانكردنەوەی رێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان لە بڵاوكردنەوەی ئەم راپۆرتە ئەمە بووە كە، پێی وابوو مەبەستی سەرەكی و مانای بنەڕەتی گەشەسەندن((باشكردنی رەوشی ژیانی مرۆڤ))ە.

بەڕێوەبەری پرۆگرامی ئاوەدانكردنەوەی رێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان، لە پێشەكی یەكەمین ((راپۆرتی گەشەسەندنی مرۆیی)) لە ساڵی ١٩٩٠، ئامانجی لە بڵاوكردنەوەی ئەم راپۆرتەی ئاوا باس كرد:

((پەیامی سەرەكی راپۆرتی گەشەسەندنی مرۆیی، ئەمەیە كە، هەرچەند هەڵدانی داهاتی ناپاڵفتەی نەتەوەیی هەروا وەك یەكێك لە گرینگترین فاكتۆرەكان بۆ هێنانەدی پێداویستییە

(1) Human Development Report.





سەرەکییەکانی مرۆڤ دێتە ئەژمار، بەڵام ئەوەی گرینگە ئەمەیە کە چۆن ئەم هەڵدانە دەبێتە هۆی بەهێزبوونی گەشەسەندنی مرۆیی لە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکاندا)). (UNDP, 1990)

بەم جۆرە هەڵدانی ئابووری هەروا وەك فاکتۆرێکی سەرەکی لە گەشەسەندن ماوەتەوە دیارە بەم جیاوازییە کە ئەم جارە وەك ئامرازێك بۆ بەهێزکردنی گەشەسەندنی مرۆیی باس کراوە. بەڵام گەشەسەندنی مرۆیی چییە؟ و ئامانجە سەرەکییەکانی کامانەن؟

بەپێی پێناسەی پێشکەشکراو لە لایەن پرۆگرامی ئاوەدانکردنەوەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، گەشەسەندنی مرۆیی بریتییە لە: ((ڕەوتی پەرەپێدانی هەڵبژاردنەکانی مرۆڤ، لە ڕێگای دابینکردنی ڕەوشی ژیانی درێژخایەن، ساڵم و داهێنەر بۆ خەڵك)). (UNDP, 1998, p.76)

گەشەسەندنی مرۆیی ٣ لایەنی سەرەکی لەخۆ دەگرێ کە بریتییە لە، ژیانی ساڵم و درێژخایەن، پەروەردە و فێرکردن و دەستڕاگەیشتن بەو سەرچاوانەی کە دەبێتە هۆی هێنانەدی ستانداردەکانی جێگای پەسندی ژیان.

ئەم سێ لایەنە، مافی هەڵبژاردنی مرۆڤ دەرەخسێنێ، چونکە کەسانی نەخۆش، هەژار و نەخوێندەوار زۆر کەم مافی هەڵبژاردنیان هەیە و هیچ کات ناتوانن ژیانی درێژخایەن، ساڵم و خولقێنەریان هەبێ.

دەستەبەرکردنی لایەنەکانی دیکەی مافی هەڵبژاردن، پێویستی بە ئازادی سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتی هەیە هەتا بەم جۆرە ژیانی تاك داهێنەر و بوونیاتنەر بێ و مافی مرۆڤیش گەرەنتی بکرێ. (UNDP, 1990, p.10)

پرۆگرامی ئاوەدانکردنەوەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ڕاپۆرتی گەشەسەندنی مرۆیی ساڵی ١٩٩١، گرینگترین کەمتەرخەمیی بەرامبەر بە مافی مرۆڤی بۆ نەبوونی بەڵێنی سیاسی گەڕاندەوە. پرۆگرامی ئاوەدانکردنەوەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ڕاپۆرتی گەشەسەندنی مرۆیی ساڵی ١٩٩١یش بە توندی پێی لەسەر ئازادییە سیاسییەکان وەك فاکتۆری پێویست لە هێنانەدی گەشەسەندنی مرۆیی داگرتووە. (UNDP, 1992, p.27)

هەروەها پرۆگرامی ئاوەدانکردنەوەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، بە مەبەستی پێوانەی ڕێژەی پێشکەوتنی گەشەسەندنی مرۆیی لە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکاندا، لە ساڵی ١٩٩٠ دەستی بە بڵاوکردنەوەی ((تایبەتمەندی گەشەسەندنی مرۆیی))[1] کردووە. ئەم

(1) Human Development Index.



تایبەتمەندییە لە ڕاستیدا تێکەڵاوێکە لە هۆکارە جۆراوجۆرەکانی وەك ((هیوای ژیان))[1]، دەستکەوتەکانی فێرکردن و ڕێژەی داهات، هەتا لەم ڕێگایەوە وێنەیەکی هەمە چەشن لە گەشەسەندنی مرۆیی لە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکان پێشکەش بکا.

ئاکامی لێکۆڵینەوەکانی پرۆگرامی ئاوەدانکردنەوە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان نیشان داوە کە ڕێژەی پێشکەوتنی گەشەسەندنی مرۆیی لە زۆربەی وڵاتان لەسەرەخۆتر و خوارتر لە ڕەوتی چاوەڕوانکراو-بە سەرەنجدان بە بەرهەمی ناپاڵفتەی نەتەوەیی سەرانە[2]- بووە. بۆ وێنە، لە نێو ١٧٤ وڵات کە لە ڕاپۆرتی گەشەسەندنی مرۆیی ساڵی ١٩٩٨ لێکۆڵینەوەیان لەسەر کراوە، ٧٣ وڵات (کە زۆربەیان وڵاتانی روو لە گەشە بوون) لەڕووی تایبەتمەندییەکانی گەشەسەندنی مرۆیی، لە بەراورد لەگەڵ ئاستی هەڵدانی داهاتی ناپاڵفتەی نەتەوەیی، گەشەیەکی کەمتریان کردووە. ئەم ئاکامە بەو مانایەیە کە، ئەم وڵاتانە نەیانتوانیوە کەڵك لە هەڵدانی ئابووری و بردنە سەری ئاستی خۆشگوزەرانی بۆ باشکردنی ژیانی خەڵك وەربگرن. (UNDP, 1998, p.20)

لە نێو ٧٣ وڵاتی ئاماژەپێکراو، هەندێك لەو وڵاتانە زۆر دەوڵەمەندن (وەك کوێت، هۆنگ کۆنگ و موریتس) و هەندێکی دیکەش لە وڵاتەکان هەژارن (وەك ئانگۆلا، لائوس و گواتیمالا). ئەم بابەتە نیشاندەری ئەمەیە کە سەروەت گەرەنتی نییە بۆ باشکردنی تایبەتمەندییەکانی گەشەسەندنی مرۆیی، وەك چۆن ناتوانین هەژاری وەك لەمپەرێك لە بەردەم گەشەسەندنی مرۆیی لە کۆمەڵگا چاو لێبکەین.

ئەم ڕاپۆرتە دەریدەخا، هەندێك لە وڵاتانی دەوڵەمەند (چ دیموکراتیك و چ نادیموکراتیك) بەهۆی نەبوونی توانایی سیاسی یان نەبوونی توانایی پێویست بۆ ڕێکخستن و بەڕێوەبەریی دابەشکردنی گونجاوی بەرژەوەندی وەدەست هاتوو لە هەڵدانی ئابووری نەیانتوانیوە تایبەتمەندییەکانی گەشەسەندنی مرۆیی باش بکەن، لە حاڵێکدا لەو سەردەمەدا هەندێك لە وڵاتانی هەژارتر (وەك تانزانیا، ماداگاسکار و ڤییەتنام) لە دەستڕاگەیشتن بە گەشەسەندنی مرۆیی سەرکەوتوو بوون.

لە ساڵەکانی کۆتایی دەیەی ١٩٩٠، پرۆگرامی ئاوەدانکردنەوەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان زیاتر لە هەموو شتێك پێیان لەسەر گرینگی سیاسەت لە دەستەبەرکردنی

(1) Life Expectacy.
(2) GDP.

گەشەسەندن دادەگرت. ئەم پرۆگرامە لە تەواوی بەیاننامەکان و راپۆرتەکانی خۆی ئەولەوییەتی یەکەمی ((گەشەسەندنی مرۆیی سەقامگیر))ی وەك ریشەکێشکردنی هەژاری، پێکهێنانی پیشە و کار، بەهێزکردنی رۆڵی ژنان لە کۆمەڵگا و پاراستن و بوژاندنەوەی ژینگە باسکردووە.

دیارە لە تەنیشت ئەم ئەولەوییەتانەدا، پرۆگرامی ئاوەدانکردنەوەی لە حاڵی حازردا لە ((حکوومەتگەریی دڵخواز)) و دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگا لە رێگای دەسەڵاتی بەشی سیاسی بۆ چین و توێژە هەژارەکان وەك ئاوازێکی پێویست بۆ وەدەستهێنانی گەشەسەندنی مرۆیی، پشتیوانی دەکا.

چالاکی پرۆگرامی ئاوەدانکردنەوەی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و دامەزراوە نێونەتەوەییەکانی دیکە بە درێژایی ساڵانی رابردوو نیشاندەری ئەمەیە کە واتا و مەبەستی گەشەسەندن لە واتای سنوورداری سەرەتایی ئەو کە تەنیا بریتی بوو لە هەڵدانی ئابووری، بۆ لایەنێکی دیکە لە چەمکی گەشەسەندن کە گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی و مرۆیی و بەم دواییانەش گەشەسەندنی سیاسی لە چوارچێوەی دیموکراتیزاسیۆن و حکوومەتی دڵخواز لەخۆ دەگرێ، گۆڕدراوە.

### ئامارتیاسێن[1] و گەشەسەندن وەك ئازادی

تیۆرییە جۆراوجۆرەکانی گەشەسەندن (چ ئەو تیۆرییانەی وەك ئامراز لێکراون و چ ئەوانەی پێیان وابووە گەشەسەندن ئامانجێکە) بە باشی لە بیرۆکەی پێشنیارکراوی سێن لەژێر ناوی ((گەشەسەندن وەك ئازادی)) کورت کراوەتەوە. (Sen, 1999)

لە روانگەی سێن ((پەرەپێدانی ئازادی))[2] هەم وەك ئامانجی سەرەتایی و هەم وەك یەکێك لە ئامرازە بنەڕەتییەکانی دەستەبەرکردنی گەشەسەندن دێتە ئەژمار. دەتوانین ئەم دووە وەك ((رۆڵی دامەزراوەیی))[3] و ((رۆڵی ئامرازی))[4]ی ئازادی لە گەشەسەندن پێناسە بکەین. (Sen, 1999, p.30).

بەم جۆرە ((گەشەسەندن لە سەرەتادا پێویستی بە نەهێشتنی سەچاوە سەرەکییەکانی سنووردارکردنی ئازادییە کە بریتین لە: هەژاری و سەرەڕۆیی، رێوشوێنی ناتەواوی ئابووری و بێ

(1) Amartyasen.
(2) Expansion of freesom.
(3) Constitutire Role.
(4) Instrumental Role.



بەشی کۆمەڵایەتی، سەرنج نەدان بە ئاسانکاری گشتی و دەمارگرژی (پێك نەهاتن)ی دەوڵەتە سەرکوتکەرەکان)). (Sen, 1999, p.37)

سێن، لەگەڵ هەندێك لەو بیرۆکانە کە پێیان وابوو، هەندێك لە جۆرەکانی ئازادی، بەتایبەت ئازادی سیاسی دەبێ هەتا کاتی وەدەستهێنانی گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی و ئابووری رابگیرێ، بە توندی دژایەتی دەکرد.

بە پێچەوانەی ئەم بیرۆکانە، ناوبراو لەسەر ئەو بڕوایەیە کە، ئازادی سیاسی و ئازادییەکانی دیکە وەك ئازادبوون لە نەخۆشی و نەزانی بەشێك لە ((لایەنەکانی دامەزراوەیی)) گەشەسەندن دێنە ئەژمار. لە هەمان کاتدا هەندێکی دیکە لە ((ئازادییەکانی ئامرازی)) توانایی بە خەڵك دەدا هەتا بە ئازادی ژیان بکەن و بەهاوکاری یەکتر ببنە هۆی پێشکەوتنی رەوتی گەشەسەندن.

ناوبراو ٥ جۆری جیاواز لە ((ئازادییەکانی ئامرازی)) ناو دەهێنێ:

١- ئازادی سیاسی، کە توانایی بە خەڵك دەبەخشێ هەتا لە دروست بوونی حکوومەت و سیاسەتەکانی و گەرەنتی وەڵامدەربوونی، بەشداربن.

٢- پێداویستی ئابووری، کە دەرەتانی گونجاو بۆ تاکەکان دەرەخسێنی هەتا لە سەرچاوەکان بە مەبەستی بەکاربردن، بەرهەمهێنان و گۆڕانکاریی سوودمەند بێ.

٣- دەرەتانە کۆمەڵایەتییەکان، کە ئەو دەستە لە پێکهاتەکان لەخۆ دەگرێ کە لە کۆمەڵگا بە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری لەوانە خزمەتگوزاری تەندروستی و بارهێنان، پێك دێن. ئەم خزمەتگوزارییانە سەرەڕای گرینگی خودی ئەوان، رۆڵی ئامرازیی گرینگی، لە رێگای دەستەبەرکردنی بارودۆخی گونجاو بۆ بەشداری کاریگەری سیاسی و ئابووری خەڵك، لە ژیانی ئەواندا دەگێڕێ.

٤- سیستەمی گەرەنتی شەفافییەت، کە دڵنیایی گشتی و کۆمەڵایەتی کە لە ئاکامی ((گەیاندنی زانیاری و شەفافییەت)) لە پێوەندی لەگەڵ بابەتە جۆراوجۆرەکان پێك دێ، دەستەبەر دەکا و لەم رێگایەوە بڵاوبوونەوەی گەندەڵی و سات و سەودا سنووردار دەکا.

٥- سیستەمی دابینکردنی کۆمەڵایەتی، ئەم سیستەمە لەبەر ئەمەی دابینکەری تۆڕی ئاسایشی کۆمەڵایەتییە و پێش بە هەژاربوونی خەڵك دەگرێ، وەك یەکێك لە ئازادییەکانی ئامرازی بۆ هێنانەدی گەشەسەندن چاوی لێدەکرێ. (Sen, 1999, p.39-9)





وا دێتە بەرچاو کە روانگەی سێن زۆر نزیکە لە بیرۆکەی سوسیال دیموکراتی مۆدێرنی ئادام ئیسمیت[1]. ئادام ئیسمیت پێی وابوو کە تەنیا بە بوونی رژێمێك کە خاوەنی هەموو جۆرەکانی ئازادییە و (لەنێوبردنی هەموو بەربەستەکانی ئازادی) دەتوانرێ بارودۆخی گونجاو بۆ بەهێزکردنی گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی پێك بێ.

بەم جۆرە دەوڵەت و کۆمەڵگا (هەردوو) رۆڵی گرینگیان لە بەهێزکردن و پشتیوانی لە تواناییەکانی مرۆڤ لەسەر شانە، چونکە دەستەبەرکردنی گەشەسەندن و بە واتایەك گەشەسەندن وەك ئازادی-بەردەوام پێویستی بە هەڵوێستی سیاسییە.

لەگەڵ ئەمەشدا، کێشەی سەرەکی ئەمەیە وانایەتە بەرچاو کە رەوتی گەشەسەندن لە تەواوی وڵاتان جگە لە ژمارەیەکی کەم نەبێ- سەرکەوتوو بووبێ.

بۆ وێنە نێونجی نرخی هەڵدانی ساڵانەی بەرهەمی ناپاڵفتەی نەتەوەیی[2]، لە ساڵەکانی نێوان ١٩٨٥ هەتا ١٩٩٥ لە وڵاتانی کەم داهات (جگە لە هیند و چین) و وڵاتانی خاوەنی داهاتی نێونجی، نێگەتیڤ بووە. (Word Bank, 1997)

بە پێی راپۆرتەکانی پرۆگرامی ئاوەدانکردنەوەی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە دەیەی ٩٠، هەژاری بەردەوام وەك بابەتێکی بەربڵاو و نەپساوە لە جیهانی روو لەگەشەدا (بە تایبەت ئەفریقیا و باشووری ئاسیا) ماوەتەوە. هەرچەند پێوانەی رێژەی هەژاری لە ساڵە جۆراوجۆرەکاندا کارێکی دژوارە، بەڵام ئاکامی لێکۆڵینەوەکانی دوایی دەریخستبووە کە رێژەی سەرهەڵدان و هەژاری لە نێوان ساڵەکانی ١٩٨٧ هەتا ١٩٩٣ لە ئەمەریکای لاتین، وڵاتانی لێواری کارائیب، ئاسیای ناوەندی و وڵاتانی خاورووی بیابانی ئەفریقیا زیادی کردووە. ئەمە لە حاڵێکدایە کە لە هەمان سەردەمدا ئەم رێژەیە لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا بەشێوەیەکی بەرچاو کەمی کردووە. (Word bank, 1997, a:53)

نایەکسانی نێوان وڵاتانی هەژار و دەوڵەمەندیش زیادی کردووە و لە هەندێك لە وڵاتان نایەکسانی ناوخۆیی (لە نێوان توێژی هەژار و دەوڵەمەند) زۆر قووڵتر بووە. (UNDP, 1998, p.30)

لە کۆتاییدا، لە ساڵەکانی نێوان ١٩٨٠ هەتا ١٩٩٦، رێژەی قەرزی وڵاتانی جیهانی سێهەم یەکجار زۆر زیادی کردووە، بۆ وێنە تەنیا لە وڵاتانی خاورووی بیابانی ئەفریقیا ئەم رێژەیە لە ٨٤ ملیار دۆلار و ٢٢٧ ملیار دۆلار چووەتە سەرەوە. (Word Bank, 1998)

---
(1) Adam Smith.
(2) GNP.



دیارە، دەبێ بڵێین کە لە نێو ئەم وڵاتانەدا، هەندێك حاڵەتی دەگمەنیش هەیە، بەڵام وێنەی گشتی رەوتی گەشەسەندن بە ئاشکرا نێگەتیڤ بووە. (Escobar, 1995, p.212)

ئەم ناکامیانە بوونەتە هۆی ئەوەی کە هەندێك لە تیۆریسییەتەکان رابگەیەنن کە تەواوی بیرۆکەی گەشەسەندن و بەرێوەبردنەکەی جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ رەوتی ((فراوانخوازی و کۆلۆنیالیزم))دا نییە.

بەڵام پێش تاوتوێ کردنی ئەم بۆچوونانە، سەرەتا ریشە و بوارەکانی سەرهەڵدانی بیرۆکەی ((گەشەسەندنی بەردەوام))[1] کە لە دەیەی ١٩٨٠ لە بەرنامەی بابەتەکانی پێوەندیدار بە گەشەسەندندا بوو، دەخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

## گەشەسەندنی بەردەوام

وشەی ((گەشەسەندنی بەردەوام)) بۆ یەکەم جار لە دەیەی ١٩٨٠، لە راگەیەندراو و بەیاننامە جۆراوجۆرەکان سەبارەت بە گەشەسەندن، کەڵکی لێ وەردەگیرا. ئەم وشەیە لە راستیدا نیشاندەری نیگەرانییەکان و تێگەیشتنی گشتی لە پێوەندی لەگەڵ پرسەکانی ژینگەیە. (Redclift, 1987) دیارە نیگەرانی سەبارەت بە ژینگە بابەتێکی نوێ (کە تایبەت بە دەیەی ٨٠ بێ) نەبوو، بەڵکو پێشتریش باسێکی زۆر سەبارەت بە پرسەکانی ژینگە لە ئارادا بوون. (Carson, 1962, Commoner, 1971)

بۆ نموونە، یەکەمین کۆنفراسی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دەربارەی ((ژینگەی مرۆڤ))، لە هەمبەر نیگەرانییەکانی دەوڵەتی سوید لە پێوەندی لەگەڵ ژینگە، لە ساڵی ١٩٧٢ لە شاری ستۆکهۆڵمی سوید بەسترا. ئەم کۆنفرانسە سەرچاوەی پێکهێنانی ((پرۆگرامی ژینگەی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان))[2] و بەرێوەچوونی ژمارەیەکی زۆر لە کۆنفرانسە نێونەتەوەییەکان لە پێوەندی لەگەڵ بابەتەکانی ژینگە لە دەیەی ١٩٧٠ بوو. (Sachs, 1992). یەکێکی دیکە لە بەڵگە گرینگەکانی پێوەندیدار بە پرسەکانی ژینگە راپۆرتی ((کلوپ رۆم))[3]ە لەژێر ناوی ((کۆسپەکانی گەشەسەندن))[4] بوو. (Meadows, 1972)

---
(1) Sustainable Development.
(2) United Nations Environmental Programme.
(3) Clup Of Rome.
(4) Lomits to Growth.





ئەم راپۆرتە هەموو خەڵكی جیهانی ئاگادار دەكردەوە كە سەرچاوەكانی زەوی، سنووردارن و تەواو دەبێ و چوونە سەری بەردەوامی حەشیمەت، پیشەسازی، پیس بوون و وێرانكردنی سەرچاوەكان دەبێتە هۆی پێكهێنانی لەمپەری جیددی لەسەر رێگای هەڵدان و گەشەسەندنی مرۆیی. هەروەها ئەم راپۆرتە پێشبینیكردووە، ئەگەر نموونەی هاوسەنگكردنی جیهانی[1] لە نێوان حەشیمەت و ژینگە لە جیهاندا پێك نەیەت و نرخی هەڵدانیش كەم نەبێتەوە، قەیرانگەلی كۆمەڵایەتی و ئابووری ترسناك لە جیهاندا روو دەدا. (Redclift, 1987, p.53)

بەڵام، ئایا ئەم نیگەرانییانە، بە ئاسانی كۆتاییان بە رەوتی هەڵدان و گەشەسەندندا؟ وڵاتانی روو لە گەشە بە توندی نیگەرانی ئەم رەوشە بوون. ئایا ئەم دواییانەش جۆرێك ((پیلانگێڕی كۆلۆنیالیزم))[2]ی نوێ بۆ پێشگیری لە رەوتی هەڵدان و گەشەسەندنی جیهانی سێهەم بوو؟ (Birnie, 1993, p.338)

ئەم بابەتە بەردەوام یەكێك لە گرینگترین نیگەرانییەكانی وڵاتانی روو لە گەشە بووە، هەرچەند لە ((كۆبوونەوەی زەوی)) لە ساڵی ١٩٩٢، راگەیەندرا كە ((بەشی بەرچاوی وێرانبوونی ژینگە هەتا ئەمرۆ، ریشەی لە جیهانی یەكەمدا هەیە. (Todaro, 1997, p.345)

هەروەها، ئەگەر بڕیار بێ، رەوتی هەڵدانی ئابووری لە جیهانی سێهەم (بە بیانووی پێشگیری لە وێرانبوونی ژینگە)) كۆنترۆڵ بكرێ، ئایا ئەدەبووە هۆی سەقامگیریی رەوشی نایەكسانی نێوان نەتەوە هەژار و دەوڵەمەندەكان؟ ئایا ئەم بابەتە بەو مانایە نییە كە ((بەردەوام بوونی خۆشگوزەرانی و بەختەوەری لە وڵاتانی باكوور بەستراوەتەوە بە بەردەوامی هەژاری و گەشە نەكردوویی لە وڵاتانی باشوور))؟

هەروەك دواتر دەركەوت، ئەم بابەتە، كێشەیەكی تەكنیكی یان پرسێكی زانستی لە پێوەندی لەگەڵ وێرانكردن و تەواوكردنی سەرچاوە سروشتییەكان نەبوو، بەڵكو بابەتێكی بە تەواوی توندی سیاسی بوو كە راستەوخۆ كاریگەری لە دەسەڵاتی نەتەوەیی وڵاتەكان هەبوو.

بەم جۆرە، دەستەواژەی ((گەشەسەندنی بەردەوام)) لە كەشێكی سیاسی كە لەودا پێویستی بە درێژەدانی رەوتی هەڵدان لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی نیگەرانییەكانی ژینگە بە توندی حاكم بوو، وەك رێگاچارەیەك بۆ پێكهێنانی هاوسەنگی و پێكەوە ژیانی نێوان ستراتیژییەكانی پارێزگاری لە ژینگە و گەشەسەندن، پێكهات. (Brinie, 1993, p.338)

(1) Global Equilibrium.
(2) Colonialist Conspiracy.



پاش ئەوەی لە دەیەی ١٩٨٠، یەكێتی نێونەتەوەیی پارێزگاری لە سروشت و سەرچاوە سروشتییەكان[1] بۆ یەكەم جار ستراتیژی جیهانی پارێزگاری لە ژینگەیان لە ژێر چاودێری گەشەسەندنی بەردەوام پێشكەش كرد، كەڵك وەرگرتن لەم دەستەواژەیە پەرەی گرت.

هەرچەند كە چەمكی ((گەشەسەندنی بەردەوام)) بە چڕ و پڕی لەلایەن پرۆگرامی ژینگەی رێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان و یەكێتی نێونەتەوەیی پارێزگاری لە ژینگە و سەرچاوە سروشتییەكان، تاوتوێ كرابوو، بەڵام باوترین پێناسەی پێشكەشكراو لە ((گەشەسەندنی بەردەوام)) لە ساڵی ١٩٨٧ لەلایەن ((كۆمیسیۆنی جیهانی ژینگە و گەشەسەندن))[2] كە لە ساڵی ١٩٨٣ لەلایەن كۆڕی گشتی رێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان پێك هاتبوو، پێشكەشكرا.

بە پێی پێناسەی كۆمیسیۆن: ((گەشەسەندنی بەردەوام)) پەرەسەندنێكە سەرەڕای دابینكردنی پێداویستییەكانی ئەم نەوەیە، پێداویستی نەوەكانی داهاتوو بۆ دابینكردنی پێویستییەكانیان نەخاتە مەترسییەوە)). (كە بە پێی پێناسەی پێشكەشكراو دەتوانین وەك هەڕەشەی گەشەسەندن چاو لێبكەین). (WCED, 1984, p.43)

ئەو هەڕەشانەی كە رووبەڕووی ژینگە بوون و لەلایەن كۆمیسیۆنەوە دەستنیشانكراوە، بە تەواوی ناسراون و ئەم هەڕەشانە بریتین لە: هەڵدانی لە رادەبەدەری حەشیمەت، پەرەسەندنی بیابانەكان، وێرانكردنی دارستانەكان، پیسبوونی هەوا و دەریا، گەرمبوونی زەوی، بڵاوبوونەوەی گازە گوڵخانەییەكان و كەرەستەی كیمیایی وێرانكەری تویێی ئۆزۆن، كەمبوونەوەی جۆراوجۆری ژیان و گۆڕانكاری لە رادەبەدەریكەش و هەوا.

لەگەڵ ئەمانەشدا، كۆمیسیۆنی ئاماژەپێكراو رێنوێنی پێویستی بۆ داڕشتنی سیاسەت لە ئاستە نەتەوەیی و نێونەتەوەییەكان پێشكەش كردووە كە بریتین لە: بەهێزكردن و بەرەو پێشبردنی سیاسەتەكانی هەڵدانی ئابووری بە تایبەتمەندیی ((عەدالەتی كۆمەڵایەتی، دادپەروەری، ئاسایش كە گونجاو بێ لەگەڵ گەشەسەندنی بەردەوام)) پارێزگاری لە سەرچاوە سروشتییەكان، رێكخستنی رێژەی حەشیمەت لە ئاستێكی جێگای پەسند لە بەراورد لەگەڵ سەرچاوەكانی بەردەست، سازگارنەبوونی تەكنۆلۆژیا لەگەڵ ژینگە و هاوسەنگ كردنی ئاسەواری وێرانكەری لەسەر ژینگە، پەرەپێدانی پێوەندی و هاوكاری نێونەتەوەیی بۆ

(1) IUCN.
(2) World Commission on Environment and Development (WCED).





پارێزگاری لە ژینگە و لەبەرچاوگرتنی پرسی ژینگە وەك تەوەری جیانەبووەوەی دارشتنی سیاسەت لە بابەتە جۆراوجۆرەکان. ( Worl Commission on Environment and Development, 1987, p.364-6)

بەم جۆرە بیرۆکەی ((گەشەسەندنی بەردەوام)) بە خێرایی لە ئەولەوییەتی باسەکانی گەشەسەندن جێی گرت و تەنانەت لە رێککەوتننامە و رێوشوێنە نێونەتەوەییەکانیش رەنگی دایەوە. بۆ وێنە ئەم بیرۆکەیە بە شێوەی بەربلاو لە کۆبوونەوەی زەوی کە لە ساڵی ١٩٩٢ لە شاری ((ریو)) بەرێوەچوو پێی لەسەرداگیراوە و لە بەیاننامەی کۆتاییدا، کە بە ((بەرنامەی کاری سەدەی ٢١))[١] ناسراوە، رەنگی داوەتەوە. ئەم بەرنامەی کارە لە راستیدا بریتییە لە پرۆگرامگەلێك بۆ بەرێوەبەری جیهانیی بابەتەکانی پێوەندیدار بە ژینگە لە سەدەی ٢١ دا.

وا دێتە بەرچاو، گرینگترین هۆکارێك کە بووە هۆی پشتیوانی زۆربەی دامەزراوە نێونەتەوەیی و نەتەوەکان لە ((بیرۆکەی گەشەسەندنی بەردەوام))، دژایەتی نەکردنی ((ستراتیژی گەشەسەندنی بەردەوام)) لەگەڵ بەردەوام بوونی رەوتی هەڵدانی ئابوورییە. بۆ وێنە، لە ئەسڵی ١٢ لە ((راگەیەندراوی ریۆ)) لە ساڵی ١٩٩٢، هاتووە کە هەڵدانی ئابووری دەتوانێ پرس و کێشەکانی ژینگە کەم بکاتەوە. بەپێی ئەم ئەسڵە ((دەوڵەتەکان دەبێ بە مەبەستی هەڵدان و پەرەپێدانی سیستەمی ئابووری کراوەی نێونەتەوەیی کە دەبێتە هۆی هەڵدانی ئابووری و گەشەسەندنی بەردەوام و لە بەرێوەبەریی هەرچی باشتری پرسەکانی ژینگە کاریگەرە، لەگەڵ یەکتر هاوکاری بکەن. (UNDP, 1999)

دیارە هەندێك لە رەخنەگرانی بیرۆکەی ((گەشەسەندنی بەردەوام)) پێیان وایە کە ((جیاوازییەکی توند)) لەم بیرۆکەیەدا شاردراوەتەوە. چونکە ئەوان پێیان وایە، پەرەسەندنی سیستەمی کراوەی ئابووری نێونەتەوەیی (کاپیتالیزم) و هەڵدانی ئابووری و پیشەسازی کە بیرۆکەی گەشەسەندنی بەردەوام وەك رێگایەك بۆ کەمکردنەوەی وێرانکردنی ژینگە دەیناسێنێ، بۆ خۆی سەرچاوەی تەواوی کێشەکانی ژینگەیە لەم قۆناغەدا. لەم پێوەندییەدا ئەوان ئاماژە بە رۆڵی سیستەمی کاپیتالیستی لە بلاوبوونەوەی قەیرانی ژینگە لە جیهانی سێهەمدا دەکەن. (Bryant and Bailey, 1997, p.104)

لە راڤەی ریشەکان و رەوشی ئێستای پرسی ژینگە و دوورە دیمەنی داهاتووی ئەو، ئەم رەخنەگرانە، ((رۆڵی سیاسەت)) بە گرینگترین هۆکار لەم پێوەندییەدا دەزانن و پێیان وایە کە

(1) Agenda 21.



رەوشی ئێستای ژینگە لە ئاستی نێونەتەوەیی و نەتەوەیی دەگەرێتەوە بۆ ((ململانێیەکان و بەرژەوەندی سیاسی)).

**گەشەسەندن وەك دەسەڵات**[١]

**دژی بە پیشەسازی بوون**[٢]

بیرۆکەی گەشەسەندن و شێوازە جۆراوجۆرەکانی بەرێوەبەری، هیچ کات بەبێ رەخنە نەبووە.

بۆ وێنە لە بەریتانیا، کە سەرچاوەی شۆرشی پیشەسازیی ئەوروپا بووە، لە کۆتایی سەدەی ١٨ و لە سەدەی ١٩دا زۆربەی شاعیران و نووسەرانی بەناوبانگی ئەم ولاتە بەردەوام لە نووسینەکانی خۆیاندا روانینێکی رەخنەگرانەیان بەرامبەر بە ((گەشەسەندنی شۆرشی پیشەسازی)) بووە. هەندێك لەوان وەك تۆرلۆپ و دیکێنز[٣] بە جوانی ئاسەواری وێرانکەری گۆرانکارییە کۆمەڵایەتییەکانی شۆرشی پیشەسازی لەسەر توێژی هەژاری کۆمەڵگایان تاوتوێ کردووە. هەندێکی دیکە لە نووسەرانیش، بە چاوپۆشی لە ناعەدالەتی و نایەکسانییەکان لە سیستەمی کۆمەڵایەتی فئودالی، پەژارەی خۆیان لە کەم رەنگ بوونی بەها کۆنەکانی کۆمەڵایەتی دەربرییوە. (Williams, 1963, Weiner, 1985)

هەرچەند کە بیرۆکەی گەشەسەندن وەك هەولدانێکی بێ کۆتایی بۆ کۆنترۆڵ و باشکردنی رەوشی کۆمەڵایەتی، ئابووری و سروشتی لە بەریتانیای سەدەی ١٩ زۆر باو بووە، بەلام هەموو نوخبەکان قەبوولیان نەبووە. بۆ وێنە، جان ئستوارت میل لە ناوەراستی سەدەی ١٩ لە یەکێك لە کتێبەکانی لەژێر ناوی ((بنەماکانی ئابووری سیاسی))[٤] هیواداریی خۆی لە پێشڤەچوونی بەردەوامی ((فەرهەنگی زەینی))[٥] و کاروباری مەعنەوی و کۆمەڵایەتی و ئەوەی کە ئەو پێی دەڵێ ((هونەری ژیان[٦]، دەربرییوە. بەڵام ناوبراو لە پێشڤەچوونێك کە بەهۆی داهێنانی پێشەسازی و میکانیکی بەدەست هاتبوون، خۆشحاڵی خۆی دەرنابرێ. (mill, 1848/1970, p.113-16)

ئەم نەریتە لە رەخنەگرتن تەنانەت دەتوانین لە قۆناغی نوێش ببینین.

(1) Domination.
(2) Anti-Industrialism.
(3) Trollope and Dickens.
(4) Principles of political Economy.
(5) Mental Culture.
(6) Art of living.





بۆ وێنە دەتوانین رەخنەگەلی ئەوتۆ لە بیرۆکەی پۆپۆلیستەکان، پۆپۆلیستە نوێییەکان و ئانارشیستەکانی رووسی لە کۆتایی سەدەی ١٩ هەتا شۆڕشی رووسیا و هەروەها لە بۆچوونەکانی غاندی لە هیند لە نیوەی یەکەمی سەدەی ٢٠دا، ببینین.

گاندی لە وتارەکەیدا لە ساڵی ١٩٠٩ سەبارەت بە ((پیشەسازی بوون)) دەڵێ: ((من هەر کات مێژووی ئابووریی هیند دەخوێنمەوە، فرمێسك هەڵدەوەرێنم و هەر کات دووبارە بیری لێ دەکەمەوە دڵم وەژان دەکەوێ. ئەمە مەکینە بوو کە ئابووری روو لە گەشەی هیندستانی لەنێوبرد. مەکینە گرینگترین هێمای شارستانیەتی مۆدێرنە و هەر ئەم مەکینەیە کە بووەتە هۆی لەنێوبردنی هەموو پیشەسازییە دەستییەکانی هیندستان. (Gandhi, 1909/1997, p.107)

نەریتی دژی بە پیشەسازی بوون و رەخنەگرتن لە بە پیشەسازی بوون تەنانەت لە فیلمی ((چەرخی نوێ))ی چارلی چاپلینیش رەنگی داوەتەوە.

بێ گومان، ئەم جۆرە بیرۆکەیەش ئێستا لە زۆربەی شوێنەکانی جیهان و لەلایەن کەسانێك کە ناچارن لە پێکهاتەی تاقەت پروکێنی پیشەسازیدا کار بکەن، هەیە. هەرچەند رەخنەی توند لە رەوتی بە پیشەسازی بوون هەروا هەیە، بەڵام بە دەگمەن لە باسە گشتییەکاندا باسی لێوە دەکرێ. دیارە حیزبە ((سەوز))ەکان لە وڵاتە جۆراوجۆرەکان توانیویانە کاریگەری گرینگ لەسەر سیاسەتەکانی گەشەسەندنی پیشەسازی مۆدێرن دابنێن.

**کاپیتالیزم، گەشە نەکردوویی و بەستراوەیی**

رەخنەگرتن لە بە پیشەسازی بوون تەنیا یەکێك لە رەخنە ئاڵۆز و بەربڵاوەکانە لە بیرۆکەی گەشەسەندنی رۆژئاوایی و شێوازەکانی بەڕێوەبردنی.

لایەنێکی دیکەی رەخنە لە پێوەندی لەگەڵ گەشەسەندن سەرەڕای پێداگرتن لە ئامانج و بیرۆکەی گەشەسەندن وەك بە پیشەسازی بوون و مۆدێرنیزاسیۆن، ئەم گریمانەیەی لایەنگرانی مۆدێرنیزاسیۆن کە ((رەوتی گەشەسەندن و مۆدێرنیزاسیۆن لە وڵاتانی گەشە نەکردووی رۆژئاوایی لە وڵاتانی روو لە گەشەش دووبارە دەبێتەوە)) بە توندی رەتدەکاتەوە. لایەنگرانی ئەم لایەنە، هەروەها لەگەڵ بۆچوونی مارکس کە ((وڵاتانی گەشەکردوو و پیشەسازی لە راستیدا وێنەیەك لە داهاتووی وڵاتانی کەمتر گەشەکردووە)) دژایەتیان هەیە. (Marx, 1976, p.97)



گرینگترین خاڵی هاوبەشی لایەنگرانی ئەم لایەنە ئەمەیە کە، ئەوان پێیان وایە سیاسەتگەلێك وەك یارمەتی دەرەکی، وەگەرخستنی سەرمایەی دەرەکی و تیجارەتی نێونەتەوەیی نەتەنیا نەبووەتە هۆی بڵاوبوونەوەی ((گەشەسەندنی سەرمایەداری و پاراستنی سەربەخۆیی)) لە وڵاتانی جیهانی سێهەم، بەڵکو بووەتە هۆی گەشە نەکردوویی و بەستراوەیی ئەم وڵاتانە بە وڵاتانی گەشەکردوو و کۆمپانیا فرە رەگەزەکان. (Wilber and Jameson, 1988)

ریشەکانی ئەم لایەنە لە رەخنە زۆرن. یەکێك لەوانە نووسراوەکانی نووسەرە مارکسیستەکانە وەك لوکزامبۆرگ و هلیفردنیگ و بەتایبەت بۆخارین و لێنین لە دوو دەیەی سەرەتای سەدەی ٢٠ بووە (Brewer, 1980, Warren, 1980)

نووسراوەکانی ئەم بیرمەندانە، ئەم پرسیارەی هینایە گۆڕێ کە بە شێوەی گشتی ئیمپریالیزمی سەرمایەداری چۆن دەتوانێ گەشەسەندن لە وڵاتانی هەژار پێك بێنێ؟

سەرەڕای ئەمەش، بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی مارکس، ئەم تیۆریستیەتانە پێیان وابوو کە ((سەرمایەداری هیچ کارکردی پۆزێتیڤی لە هیچ شوێنێکدا نەبووە))، لە روانگەیەك کە لە کۆنگرەی شەشەمی نێونەتەوەیی کۆمۆنیست لە ساڵی ١٩٢٨ سەری هەڵدا. (Warren, 1980, p.83)

ئەم بیرۆکەیە، جارێکی دیکە لە ساڵەکانی دوای جەنگی دووەمی جیهانی لەلایەن ئابووریناسێکی ئەمەریکی بەناوی ((پۆل باران)) هاتە بەرباس. ناوبراو لە کتێبەکەیدا لەژێر ناوی ((ئابووریی سیاسی هەڵدان))[1] لەسەر ئەو باوەڕە بوو: ((سیستەمی سەرمایەداری، کە سەردەمێك داینەمۆیەکی بەهێز بوو بۆ گەشەسەندنی ئابووری، ئێستا بووەتە کۆسپێکی جیددی لەسەر رێگای پێشکەوتنی مرۆڤ)). (Baran, 1957, p.249-50)

لەگەڵ ئەمەشدا ناوبراو پێی وابوو کە دەسەڵاتی سەرمایەداری مۆنۆپۆڵ[2] و ئیمپریالیزم بەسەر وڵاتانی پێشکەوتوو و دواکەوتوویی کۆمەڵایەتی و ئابووری لە وڵاتانی گەشەنەکردوو بە تەواوی پێوەندییان پێکەوە هەیە. (Baran, 1957, p.249-50)

ئەم بیرۆکانە زۆرتر لە ئەزموونی وڵاتانی ئەمەریکای لاتین وەردەگیران. سەرەڕای ئەوەی کە وڵاتانی ئەمەریکای لاتین لە رێگای تیجارەت و وەگەرخستنی سەرمایە پێوەندییەکی نزیکیان لەگەڵ جیهانی سەرمایەداری گەشەسەندن هەبوو، بەڵام رەوتی گەشەسەندن لەو

(1) Thr Political Economy of Growth.
(2) Momopoly Capitalism.





ولاتانە زۆر لەسەرەخۆ و سەرنەکەوتوو بوو، بەجۆرێك کە زۆربەیان هەروا لە رەوشی ((گەشەنەکردوویدا)) ماونەتەوە.

ناتوانین دواکەوتوویی و گەشەنەکردوویی لە ئەمەریکای لاتین و شوێنەکانی دیکە وەك ((یەکێ لە قۆناغەکانی رەوتی دروست بوونی ئابووریی سەرمایەداری مۆدێرن)) ناوبنێین. بەڵکو دەبێ ئەوانە وەك رەوتێك بناسین کە لە ئاکامی نفوزی دامەزراوەکانی سەرمایەداری مۆدێرن لە پێکهاتە کۆنەکانی ئەم ولاتانە پێکهاتوون. (Furtado, 1964, p.138)

بە واتایەکی دیکە هەروەك فرانك پێی وایە: ((گەشەسەندنی ئابووری و گەشەنەکردوویی دوو رووی دراوێکن)). (Frank, 1971, p.33) مەبەستی فرانك لەم رستەیە ئەمەیە کە گەشەسەندنی سەرمایەداری لە جیهانی پیشەسازیدا، لە رێگای پێوەندیی سیاسی و ئابووری لە سەردەمی ئیمپراتۆری و پاش ئەو، بووە هۆی پێکهێنانی بارودۆخی گەشەنەکردوویی لە ئەمەریکای لاتین و شوێنەکانی دیکە.

بەپێی ئەم بۆچوونانە، گەشەسەندن رەوتێکی خۆجێیی و سەربەخۆ نییە، بەڵکو بەستراوە بە گەشەسەندنی سەرمایەدارییە. بەرهەمی ئەم گەشەسەندنە بەستراوەیە، ئابووریی ناهاوسەنگە کە لە تایبەتمەندییەکانی ئەو ((سەروەت و خۆشگوزەرانی لە رادەبەدەر)) بۆ ژمارەیەکی کەم لە خەڵك و لە بەرامبەردا هەژاری زۆربەی خەڵك و بێکارییە.

هەروەها، گەشەسەندنی بەستراوە، نائارامییە سیاسییە ئاڵۆزەکان لەخۆ دەگرێ وەك پێوەندی لەرزۆك، و ناسەقامگیر لە نێوان چینی خاوەن زەوی، کرێکار و بورژوا، سوپا و بوروکراسی و بەرژەوەندی ئابووری دەوڵەتی لەگەڵ بەرژەوەندی ئابووری دەرەکی.

لە رەوشێکی ئەوتۆدا، بەستراوەیی ئابووری بۆ ئەو ولاتانە بەکاردەبرێ کە ((پێکهاتەی بنەڕەتی کەڵەکەکردن و پەرەپێدانی سەرمایە لە نێوان سیستەمدا بوونی نەبێ)). یان، بە پێی پێناسەیەکی دیکە ((بەستراوەیی رەوشێکە کە لەودا، رەوشی ئابووری گرووپێك لە ولاتان بە پێی گەشەسەندن و پەرەپێدانی ئابووری ولاتانی دیکە دادەڕێژرێ و دیاری دەکرێ. هەروەها پێوەندی بەستراوەیی دوولایەن لە نێوان دوو یان چەند ئابووری و یان لە نێوان چەند ئابووری و سیستەمی تیجارەتی جیهانی، کاتێك هەندێك لەم ولاتانە بتوانن بە ئیرادەی خۆیان ئابووری خۆیان پەرەپێبدەن و بەهێزی بکەن لە حاڵێکدا هەندێکی دیکە لە ولاتان تەنیا بەهۆی پەرەپێدان و بەهێزکردنی ئابووری ولاتانی دیکە، دەرەتانی بەهێزکردنی ئابووری خۆیان هەبێ و (بە ئیرادەی خۆیان نەتوانن بەرێوە بەرن) دەبێتە پێوەندییەکی بەستراوەیی)). (Dos Santos, 1973, p.76)



هەندێك لە نووسەرانی روانگەی گەشەنەکردوویی، بەستراوەیی و گەشەسەندنی بەستراوەیان بە دوور و درێژی لە نووسراوەکانی خۆیاندا هێناوەتە بەرباس و پەرەیان پێداوە. گرینگترینی ئەم نووسەرانە بریتین لە: ڤالتێر رادنی[١]، ئیمانوئێل ڤالێرشتاین[٢]، کالین لیز[٣]، سەمیر ئەمین[٤]، باغچی[٥].

بابەتێك کە هەموو نووسەران لە سەری یەك بۆچوونیان هەبوو ئەمە بوو کە هەر یەك لەوان پێیان وابوو ئەوەی پێی دەڵێن گەشەسەندن لەڕاستیدا ((پەرەپێدانی جیهانی وەبەرهێنانی سەرمایەداری لە رێگای کۆلۆنیالیزم، گۆڕینی ولاتانی جیهانی سێهەم بە ولاتانی بەستراوە و سووکایەتی کردن بە خەڵکی جیهانی سێهەم و پەرەپێدانی هەژاری لە نێویاندا)) بووە.

بە واتایەکی دیکە رەوتێك لە تەواوی ئەم ساڵانەدا بەردەوام بووە، دروست بە پێچەوانەی گەشەسەندنە. هەندێك لە بیرمەندان پێیان وایە رێگاچارەیەك بۆ هاتنەدەر لەم رەوشە دڵتەزێنە، گرتنەبەری رێوشوێنێکە بە مەبەستی پشتیوانی کردن لە ئابووری نەتەوەیی و سیاسەتی جێنشین کردنی هاوردە.

هەندێکی دیکەش لەسەر ئەو بڕوایەن پچڕانی پێوەندی لەگەڵ جیهانی سەرمایەداری و پێکهێنانی سیستەمی سۆسیالیستی لە ئاستی نەتەوەیی یان جیهانی تەنیا رێگاچارەی کێشەکانی گەشەنەکردووییە. (Baran, 1957, p.267) بۆ ئەم دەستەیە لە بیرمەندان پرسی سەرەکی ئەمە بوو کە ((چۆن دەتوانن پێکهاتەی سۆسیالیزم دابڕێژن))؟ چونکە بەبێ رزگاری لە پێکهاتەی جیهانی سەرمایەداری و (یان رووخانی ئەم پێکهاتەیە) ولاتانی جیهانی سێهەم هەروا لە گەشەنەکردوویدا دەمێننەوە. (Frank, 1971, p.35)

هەرچەند بیرۆکەی گەشەنەکردوویی و بەستراوەیی لە دەیەی ١٩٧٠ زۆر باو بووە بەلام لە دەیەی ١٩٨٠ بە خێرایی کەم رەنگ بووەوە و پێگەی خۆی لەدەستدا. (Lall, 1957, Larrian, 1989)

هەروەها، هەڵدانی ئابووری هەندێك لە ولاتانی جیهانی سێهەم بە تایبەتی لە رۆژهەلاتی ئاسیا، بووەتە هۆی لاواز بوونی بۆچوونەکانی لایەنگرانی ئەم لایەنە سەبارەت بە

(1) Walter Rodney.
(2) Immanuel Wallerstein.
(3) Colin Leys.
(4) Samir Amin.
(5) Bagchi.





چارەسەرنەبوونی ڕەوشی گەشەنەکردوویی، بە جۆرێك کە ئەمڕۆکە کەمتر کەسێك باسی لێوە دەکا. (Barrett and White, 1982)

لە دەیەی ١٩٨٠، لیبراڵیستە نوێیەکان لە تەواوی ڕەهەندەکانەوە پەرەی ئەستاند و بە دوای ڕووخانی یەکیەتی سۆڤییەت و سیستەمی سۆسیالیستی لە جیهان لە کۆتایی دەیەی ٨٠، پرۆگرامەکانی هاوسەنگکردنی پێکهاتەیی لیبراڵیزمی ئابووری بووە هۆی تێکەوە پێچانی ئابووری دەوڵەتی لە ڕۆژهەڵات و سیاسەتەکانی پشتیوانی لە ئابووری نەتەوەیی لە باشوور.

بەم جۆرە، گەشەسەندنی سەرمایەداری، کە بۆ ماوەی ٧٠ ساڵ لە لایەن سۆسیالیزمەوە ڕاگیرابوو، جارێکی دیکە لە دەیەی ١٩٩٠ زۆر زوو لە بەرنامەی کاری وڵاتە جۆراوجۆرەکان لە شیلی هەتا چین، جێی گرت.

ئێستا وادەهاتە بەرچاو کە چەمك و ئامانجی سەرەکی گەشەسەندن دیاریکراوە و جێگای پەسەندی جیهانیشە.

بەڵام ئایا بەڕاستی بەم جۆرەیە؟ لە حاڵێکدا تیۆریسیەنێك وەك فۆکۆیاما بە دڵنیاییەوە ڕادەگەیەنێ کە ((سیستەمە سیاسی و ئابوورییەکانی لیبراڵ))، ((شێوازی کۆتایی)) گەشەسەندنی سیاسی و ئابوورین، هەندێك لە تیۆریسیەن و چالاکانی پۆست مۆدێرن، بە گشتی بوونی حەقیقەت و ڕاستی بێ ئەملا و ئەولایان دەبردە ژێر پرسیارەوە و پەرەسەندیش یەکێك لەم پرسانە بوو. (See Keily, 1995, p.153)

### گەشەسەندن وەك ((گوتاری زاڵ))[1]

زۆرکەس کە گەشەسەندنیان وەك ((گوتاری زاڵ))ی تاوتوێ کردووە، لەژێر کاریگەری تیۆری گوتاری پۆست مۆدێرنیستەکان و بەتایبەت تیۆریسیەنی فەرەنسی ((میشل فۆکۆ))[2] بوون. پێناسەی ئاماژەپێکراو لە گوتار، ڕۆڵی گرینگی لە پێکهێنانی بیرۆکەی ئەم تیۆریسیەنانە لە پێوەندی لەگەڵ گەشەسەندن لە جیهانی سێهەمدا هەبووە. (Said, 1978, Escobar, 1989)

هەرچەند بیرۆکەی گوتار لە زۆربەی بەشە زانستییەکان وەك زمانناسی، ئەدەبیات و فەلسەفە کاریگەریی زۆری بووە، بەڵام ئەم بیرۆکەیە لە خوێندنەوەکانی تایبەت بە سیاسەت و گەشەسەندن ڕۆڵی یەکجار کەمی گێڕاوە (Howarth, 1995).

(1) Development as a discourse of domination.
(2) Michel Foucault.



بە زمانێکی سادە گوتارێك، لە سەرەتادا، پێکهاتووە لە کۆمەڵێك گریمانە، بیرۆکەکان، بەهاکان، پێناسەکان، بیروبۆچوونەکان، هێماکان، گوتەکان، مانا و ڕاڤەگەلێ پێکەوە گرێدراون کە خەڵك لە کاتی باسکردنی بابەتێکی تایبەتی (وەك دیموکراسی یان گەشەسەندن) و هەروەها لە ڕووبەڕووبوونەوەی بە کردەوە لەگەڵ ئەو بابەتانە، کەڵکیان لێوەردەگرن. بەم جۆرە دەبێ بڵێین کە ((گوتارێك))، تەنیا ئامرازێك بۆ ((وێناکردن))[1]ی بابەتێکی جێگای باس نییە، بەڵکو هەر جۆرە هەڵوێستێکی بە کردەوە لە پێوەندی لەگەڵ ئەو بابەتەیش لەسەر بنەمای وێناکردنی ئەنجامدراو، ڕوو دەدا.

لەڕاستیدا، گوتارەکان کاناڵگەلێك بۆ تێگەیشتنمان لە کۆمەڵگا و پێگەمان لەودا چۆنیەتی هەڵسوکەوت لەو پێگەیەدا، پێکدێنێ.

کەوابوو دەتوانین بەو ئاکامە بگەین کە گوتارەکان بە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکان و فەرهەنگە جۆراوجۆرەکان و (تەنانەت لە چینە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگادا) لە بەراورد لەگەڵ یەکتر جیاوازییان هەیە.

کەوابوو بیرۆکەی گوتارەکان لەگەڵ بیرۆکەی بوونی ڕاستییەکان، واتاکان و بایەخە ڕەها و جیهانییەکان بە توندی لە دژایەتیدا بوون.

لەگەڵ ئەمەشدا فۆکۆ پێی وابووە ((هەر کۆمەڵگایەك خاوەنی ڕژێمێکی تایبەتی لە ڕاستییەکان و بە واتایەکی دیکە گوتارێکی تایبەت بە خۆیانن کە لەسەر ئەو بنەمایە هەڵسوکەوت دەکا و لەسەر ئەو بنەمایە خاڵە دروست و نادروستەکان دەستنیشان دەکا)). (Foucault, 1980, p.131)

وادێتە بەرچاو کە باسکردن لە پێوەندی لەگەڵ گەشەسەندن و هەژاری لە چوارچێوەی بیرۆکەی گوتار، تارادەیەك ئێمە لەگەڵ ڕاستییەکان دوور دەخاتەوە بەڵام بە کەمێك تێڕامان بۆمان دەردەکەوێ کە لایەنی گوتار، کاریگەریی قووڵی لەسەر خوێندنەوەی گەشەسەندن و چەمکەکەی هەبووە.

یەکەم، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە هەر کۆمەڵگایەك خاوەنی ڕژێمی تایبەت بە خۆی لە حەقیقەت و لە ئاکامدا گوتاری تایبەت بە خۆیەتی، ئەو بیرۆکانەی کە بە دوای پێکهێنانی ڕاستییەکان، بایەخیان، ئامانجەکان و یان تەنانەت مافی مرۆڤە جیهانی و ڕەهان، بە توندی ڕەتدەکرێنەوە. چونکە هیچ پێوەرێك نییە کە بە پێی ئەو بتوانین یەکێك لە گوتارەکان بەسەر

(1) Representing.

ئەوی دیکەدا لە ئەولەوییەت دابنێین و لە حاڵێکدا، بە هەر شێوەیەك گوتاری یەکێك لەم کۆمەڵگایانە لە پێوندی لەگەڵ بابەتێکی تایبەت (بۆ نموونە گەشەسەندن) بەسەر کۆمەڵگایەکی دیکەدا بسەپێ، دەبێ بەو گوتارە بڵێین ((گوتاری کۆلۆنیلیزم))[1]. (Escobar, 1995, p.213)

بەم جۆرە دەتوانین بڵێین کە چەمکی گەشەسەندن و گەشەنەکردوویی کە لە حاڵی حازردا لە باسەکان کەڵکی لێوەردەگیرێ و زۆرتر لە گوتاری رۆژئاوا وەرگیراوە لە راستیدا گوتاری کۆلۆنیالیزمە.

زۆربەی رەخنەگران وەك ئێسکوبار[2] پێیان وایە کە ((گەشەسەندن)) چەمکێکی رۆژئاواییە. هەندێك لەم رەخنەگرانە دەڵێن لە راستیدا ((سەردەمی پەرەسەندن و پەرەنەگرتوویی)) بە وتارەکەی ترومەن لە ٢٠ی کانوونی دووەمی ١٩٤٩، کە لەودا ناوبراو پرۆگرامی ((گەشەسەندنی ناوچە گەشەنەکردوونەکانی)) راگەیاند، دەستی پێکردووە. (Sachs, 1990)

ئەم رەخنەگرانە دەڵێن لەو رۆژەدا تەنیا بەهۆی شێوەی بیرکردنەوەی تایبەت بە رۆژئاوا، نزیکەی ٢ ملیار کەس وەك گەشەنەکردوو ناسران. (Esteva, 1992, p.6-7)

سەرەڕای ئەمەش ئێسکوبار لەسەر ئەو بروایە بوو ((بەبێ بوونی تێگەیشتنی دروست لە گەشەسەندن لە گوتاری رۆژئاوایی، ناتوانین ئەو شێوازە سیستماتیکانەی کە وڵاتە گەشەکردووەکانی رۆژئاوایی لە رێگای ئەوەوە دەتوانن جیهانی سێهەم لە رووی سیاسی، فەرهەنگی، ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە، کۆنترۆڵ و بەڕێوەبەرن، بە باشی وەرگرین)). (Escobar, 1984, p.384)

بەم جۆرە گوتاری گەشەسەندن ریشەی لە سەرهەڵدانی رۆژئاوا، مێژووی سەرمایەداری، مۆدێرنیزم و بە جیهانی بوونی دامەزراوە دەوڵەتییەکانی رۆژئاوایی (دەوڵەت-نەتەوە) و میکانیزمەکانی وەبەرهێنان هەیە. (Crush, 1995, p.11)

ئایا دەرەتانی گۆڕینی ئەم گوتارە هەیە؟ ئایا گوتاری زاڵی رۆژئاوا لە پێوەندی لەگەڵ گەشەسەندن دەگۆڕدرێ؟

وەڵامی میشل فۆکۆ بۆ ئەم پرسیارانە پۆزێتیڤە.

فۆکۆ پێی وایە: ((گۆڕانکاری لە گوتارێکدا پێویستی بە بوونی بیرۆکەی نوێ، داهێنان یان روانگەی جیاواز نییە، بەڵکو گۆڕانکاریی لە قۆناغی بە کردەوەدا دەتوانێ ببێتە هۆی گۆڕانکاریی لە گوتاردا)). (Foucault, 1972, p.209)

(1) Colonizing Discourse.
(2) Escobar.



ئێستا ئەگەر ئەم دەرەتانە پێك نەیەت، ئەم تیۆریسیەنانە دوورە دیمەنی چۆن هەڵدەسەنگێنن. ئەوەی کە روونە، بە سەرنجدان بە پێناسەیەك کە لە سیاسەت لە فەسڵی یەکەمدا پێشکەشم کرد، ئەم گۆڕانکارییە کە پێویستی بە شێوازە نوێیەکانی سوود وەرگرتن، بەرهەم و دابەشکردنی سەرچاوەکانە، نێوەرۆکێکی سیاسی هەیە.

ئێستا ئەم پرسیارە دێتە گۆڕێ کە ئەو بژاردنەدا کامانەن کە جێگای گوتاری ئێستا دەگرنەوە؟ شێوازە نوێیەکانی چۆن پێکدێن؟

باشترین وەڵام بۆ ئەم پرسیارانە، ئەمەیە کە شێوازە نوێیەکان و چەمکە نوێیەکان لە گەشەسەندن لەسەر بنەمای بیروبۆچوونەکان و داهێنانە خۆجێیی و بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان کە ریشەیان لەنێوخۆی کۆمەڵگای خۆجێیی دابێ (نە بزووتنەوە دەوڵەتییەکان یان ئەو بزووتنەوانەی کە لە لایەن ئاژانسە بیانییەکان یان گرووپێك لە نوخبەکان دروست دەبێ)، سەرهەڵدەدەن. (Escobar, 1995, p.225)

کەوابوو دەتوانین بڵێین کە ئەم چەمکە نوێیانە بە تەواوی خۆجێین. رەنگە باشترین کۆتایی بۆ ئەم بەشە رستەیەك لە ((فلۆرا لویس))[1] بێ. لویس لە پێوەندی لەگەڵ سەرهەڵدانی گوتارە نوێیەکانی گەشەسەندن دەڵێ: ((تامەزرۆیی بۆ گوتاری جیاواز، باشتر و خۆجێیی تر لە سیستەمی گەشەسەندنی رۆژئاوایی و لە هەمان کاتدا کاریگەرتر لەڕووی ماددی و کۆمەڵایەتی، لە هەموو شوێنێکدا دەبینرێ. ئەم بابەتە کە ((ئێمە بە دوای شێوازی خۆمانین)) بووە بە پرسێکی رۆژانە، بەڵام ئەم وتانە هێشتا مەودایەکی زۆری لەگەڵ گەڵاڵەیەکی تۆکمە و بیرۆکەیەکی تەواودا هەیە. (Flora Lewis, New York Times, 31 December 1979)

(1) Flora Lewis.





## دەرئەنجام

لەم فەسڵە و فەسڵی پێشتر، هەوڵم داوە هەتا ڕەوتی کامڵبوونی چەمکی ((گەشەسەندن)) لایەنی کەم لە سەردەمی ((ئادام ئیسمیت))دا تاوتوێ بکەم.

لە بەشی دەرئەنجامیش ئاماژە بە چەند خاڵێك کە دەبێتە بوارێك بۆ چوونە ناو فەسڵی دوایی دەکەم. یەکەم، دەبێ ئاماژە بەم خاڵە بکەم کە، سەرەڕای ئەوەی کە چەمکی گەشەسەندن و گەشەنەکردوویی بەرهەمی قۆناغی پاش جەنگی دووەمی جیهانییە، بەڵام بایەخدان بە بابەتی پێشکەوتن و گەشەسەندن بۆ سەردەمێکی زۆر پێشتر لەو دەگەڕێتەوە. لە ڕاستیدا بەو جۆرەی کە لە فەسڵی یەکەمدا ئاماژەم پێکرد، ئەم بابەتە یەکێك لە باسە گرینگەکانی زانستی کۆمەڵایەتی بووە (لە هەردوو ڕوانگەی مارکسیستی و غەیری مارکسیستیدا).

دووەمین خاڵ ئەمەیە کە، لانیکەم تەواوی چەمکەکانی گەشەسەندن کە هەتا ئەمڕۆ ناسێندراون، ڕیشەی لە ئامانجێکی سیاسی تایبەتدا بووە یان لە دژکردەوە لە بەرامبەر بارودۆخی سیاسی تایبەت و وەك بەشێکی جیانەبووەوە لە هەوڵدان بۆ گۆڕانکاری ئەم بارودۆخە، بووە.

لەگەڵ ئەمەشدا، هەریەك لە چەمکە ئاماژەپێکراوەکان کاریگەریی سیاسی جێگای سەرنجی لەسەر داڕشتنی سیاسەت و شێوازەکانی بەڕێوەبەری گەشەسەندن هەبووە. بۆ نموونە، لایەنگرانی بیرۆکەی گەشەسەندن وەك هەڵدانی ئابووری لە دەیەی ١٩٨٠، خوازیاری نەهێشتنی دەستێوەردانی دەوڵەت لە بازاڕدا بوون. لە لایەکی دیکەوە لایەنگرانی گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی وەك خاڵێکی سەرەکی لە باسەکانیاندا، بەردەوام خوازیاری دەستێوەردان و بەشداری زیاتری دەوڵەت بۆ ڕێکخستن و بەڕێوەبەری ((سەرلەنوێ دابەشکردنی سەرچاوەکان)) بوون.

لە هەمان کاتدا، لایەنگرانی نەزمی نوێی ئابووری نێونەتەوەیی وەك بنەمایەك بۆ گەشەسەندنی جیهان، خوازیاری هەڵوێستی نێوان دەوڵەتەکانن بۆ ڕێکخستنی بازاڕە نێونەتەوەییەکان.

بە کورتی دەبێ بڵێین کە سیاسەت و گەشەسەندن، چ لە کردەوەدا و چ لە چەمکدا، لە یەکتر جیاناکرێنەوە و لە هەر شوێنێك کە ستراتیژی گەشەسەندن جێبەجێ کراوە، بووەتە هۆی بەهێزبوونی بەرژەوەندی هەندێك لە چینەکان و لاوازبوونی بەرژەوەندی هەندێکی دیکە.



سێهەمین خاڵیش لەسەر ئەم بابەتە پێ دادەگرێ کە سەرەڕای ماناکان و ئامانجە جۆراوجۆرەکانی گەشەسەندن و سەرەڕای بوونی هەوڵی زۆر و گۆڕانکاریی بەردەوام لە ئەولەوییەتەکان و سیاسەتەکانی گەشەسەندن، ژمارەیەکی زۆر کەم لە وڵاتانی ڕوو لە گەشەی جیهان بە ئاستێکی جێگای پەسند لە گەشەسەندن و چوونە سەری ستانداردەکانی ژیان گەیشتوون.

رابێرت مەك ناماراوە سەرۆکی بانکی جیهانی، لە ساڵی ١٩٧٣، گرینگترین ئامانجی گەشەسەندن لە جیهاندا لەنێوبردنی هەژاری تا ساڵی ٢٠٠٠ ڕاگەیاند. ئەم بابەتە دەگەڕێتەوە بۆ نزیکە چارەکە سەدەیەك لەمەوپێش. بەڵام ئەم ئامانجە هێشتا نەهاتووەتەدی. هەرچەند لەو سەردەمەوە هەتا ئێستا ئابووریی جیهان لە هەڵدان و گەشەسەندنی خۆی بەردەوام بووە و زۆربەی وڵاتان دەوڵەمەند بوون، بەڵام زۆربەی ئارمانە سەرەتاییەکانی گەشەسەندن وەك ئاوی خواردنەوەی سالم، جل و بەرگ، شوێنی نیشتەجێ بوون و خۆراکی لەبار بۆ زیاتر لە ملیارێك کەس لە جیهانی بەناو ڕوو لە گەشە دەستەبەر نەکراوە.

هۆکاری ئەم سەرنەکەوتنە چییە؟ تەوەری سەرەکی باسی ئەم کتێبە ئەمەیە کە وەڵامی ئەم پرسیارە، بە تەواوی سیاسییە و هۆکاری سیاسی کۆسپی سەرکەوتنی ئەم گەڵاڵانە بوون.

لە فەسڵی دواییدا، هەندێك لە تیۆرییەکانی دەوڵەت لە وڵاتانی ڕوو لە گەشە، لەگەڵ شیکردنەوەی هۆکارەکانی دواکەوتوویی و ناکامی ئەم وڵاتانە لە بە دواداچوونی ستراتیژییەکانی گەشەسەندن، تاوتوێ دەکەم.





## فەسڵی چوارەم

### دەوڵەتانی گەشە نەکردوو

لە فەسڵەکانی پێشوو ئاماژەم بەوە کردبوو کە تێگەیشتنی دروست لە نموونە و شێوازە بەربڵاوەکانی گەشەنەکردوویی و دواکەوتوویی زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێیەم، پێویستی بە ناسینی وردی تایبەتمەندی و توانایی دەوڵەتەکانی حاکم بەسەر ئەم وڵاتانە و سیاسەتە جۆراوجۆرەکانیان کە لەم وڵاتانە بەڕێوەدەچن.

کەمتەرخەمی ڕێکخراوە گرینگە نێونەتەوەییەکان و دەوڵەتە نێوخۆییەکان —چ لە خوێندنەوەی بەربڵاوی ئاکادمیکی بەڕێوەچوو لە بواری گەشەسەندن و چ لە پرۆگرامەکان و گەڵاڵەکانی پێشکەشکراو لەم بوارەدا— بە بابەتێکی گرینگی جۆری سیاسەتەکان و تایبەتمەندیی دەوڵەتەکانی حاکم لە وڵاتانەدا (تەنانەت هەتا کۆتایی سەدەی بیستەم) جێگای سەرسوورمانە.

بەکورتی دەبێ بڵێین کە کەمتەرخەمی لە هەمبەر سیاسەتەکانی گەشەسەندن لە وڵاتانی دواکەوتوو، یەکێك لە کێشە سەرەکییەکانی لێکۆڵینەوەی ئاکادمیکی گەشەسەندن و شیکردنەوەی سیاسەتەکانی گەیاندنی یارمەتییە.

بۆ وێنە هەتا ئەم دواییانەش بانکی جیهانی بە پێی ماددەی ١٠ی ڕێککەوتننامەی ١٩٨٩ (IBRD)، بانکی لە دەستێوەردان لە کاروباری سیاسی وڵاتانی ئەندام و بەکارهێنانی پێشمەرجی سیاسی لە بڕیارەکانی دابینکردنی قەرز و لە لێکدانەوەی سیاسی قەدەغە کردووە. ئەم ماددەیە بووە هۆی ئەوەی کە هەتا لێکدانەوەکان و بڕیارەکانی بانك لە هەر جۆرە تاوتوێ کردنی سیاسەتەکانی گەشەنەکردوویی و دواکەوتوویی دووربخاتەوە. ئەم پرسە سەرەکیترین خاڵی لاوازی بانکی جیهانی لە چالاکییەکانیدا بوو.

سەرنجدان بە بابەتە سیاسییەکانی گەشەسەندن دەتوانین لە بواری مێژووییەوە لە سیاسەتەکانی دەوڵەتە گەورەکاندا ببینین. ئەگەرچی ئەمرۆکە وڵاتانی گەورە، بەخشینی قەرز و یارمەتی بە وڵاتانی داواکار دەبەستنەوە بە پێشمەرجەکانی وەك پێکهێنانی دیموکراسی و سەرنجی زیاتر بە



مافی مەدەنی، بەڵام ئەم سیاسەتانە لەگەڵ هەڵوێستی ئەم دەوڵەتانە لە قۆناغەکانی دوای جەنگی سارد جیاوازە. چونکە ئەم دەوڵەتانە لە بەخشینی قەرز، چەکدارکردن و پشتیوانی لە دەوڵەتە نادیموکراتیکەکان و تەنانەت ڕژێمە سەرکوتکەرەکانی ئەمەریکای لاتین و ڕۆژهەڵاتی ئاسیا کە مافی مرۆڤ لە هەموو شێوازەکانیدا پێشێل دەکەن، ڕۆڵی گرینگیان گێڕاوە.

بەڵام ئەوەی چ شتێك بووەتە هۆی ئەم گۆڕانکارییە ئاشکرایە لە سیاسەتەکانی گەشەخوازیی دەوڵەتەکانی ڕۆژئاوایی، بابەتێکە کە لە فەسڵی دواییدا هەوڵ دەدەم هەتا وەڵامێکی گونجاو بۆ ئەو مەبەستە بخەمەڕوو.

ئەوەی کە گوترا بە مانای ئەوە نییە کە بابەتە سیاسییەکان هیچ کات لە لێکدانەوەکان و خوێندنەوەکانی بەڕێوەچوو پێگەیان نییە. لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە بەتایبەت لەلایەن ئابووریناسان بەڕێوەچووە، بە شێوەیەکی زۆر ڕواڵەتی ئاماژە بە هۆکارە سیاسییەکان کراوە.

بۆ وێنە پۆل باران، لە یەکێك لە لێکۆڵینەوە سەرەتاییەکانی خۆی لە ساڵی ١٩٥٧ لە پێوەندی لەگەڵ ((ئابووری سیاسی هەڵدان)) هێرش دەکاتە سەر ئەو دەوڵەتانەی کە ناوبراو پێیان دەڵێ دەوڵەتەکانی کۆمپرا دۆر[1] لە زۆربەی وڵاتانی ڕوو لە گەشە (وڵاتانی دەوڵەمەندی کەنداو و ئەمەریکای لاتین)

ناوبراو بە بەڵگە دەیسەلمێنێ کە ئۆگری ئەم وڵاتانە بۆ گرێبەستی ڕێککەوتننامە لەگەڵ کۆمپانیا بیانییەکان بووەتە هۆی چوونە سەری گەندەڵی و دەست بەسەرداگرتنی زۆربەی سەرچاوەکانی بە قازانجی چینی دەسەڵاتدار.

سەرەڕای ئەمەش ناوبراو خەمساردی ئەم دەوڵەتانەی بۆ دارشتنی پرۆگرام لە پێناوی بەرژەوەندی نەتەوەیی وەك هۆکاری سەرەکی لەوەی کە ناوبراو پێی دەڵێ مۆرفۆلۆژی دواکەوتوویی، چاو لێدەکا. (Baran, 1957, p.163)

میردال ئابووریناسێکی دیکەیە کە لە کتێبی ((بیرۆکەی ئابووری و ناوچە دواکەوتووەکان)) دەنووسێ:

((وڵاتانی دواکەوتوو بۆ نەهێشتنی لەمپەرەکانی گەشەسەندنی ئابووری تەنانەت لە قۆناغی سەرەتایی، پێویستیان بە دیموکراسی ڕاستەقنە هەیە)).

دیارە بە درێژایی قۆناغی ٣٠ ساڵی یەکەمی دوای جەنگی دووەمی جیهانی، ئەم بابەتە کە گەشەسەندن پێویستی بە دارشتنی پرۆگرام و بەڕێوەبردنی لەلایەن دەوڵەتەوە

(1) Comprador Governments.





هەیە بووەتە شتێکی روون و ئاشکرا لە خوێندنەوە ئاکادمیکەکان و روانگەی کاربەدەستان لە گەشەسەندندا.

بەو جۆرەی کە میگدال[١] ئاماژە دەکا:

((هەردوو توێژی کاربەدەستانی دەوڵەتی و تیۆریسیەنەکانی ئاسیایی، ئەفریقایی و ئەمەریکای لاتین دەیانویست هەتا خۆشگوزەرانی و حورمەتی ئینسانی لە هەموو ئاستەکانی سیاسەتی کۆمەڵایەتی و ئابووریی خۆیان لەبەرچاو بگرن)) بەم دواییانە، کالین لی[٢] پێی لەسەر ئەم خاڵەی دادەگرت کە:

((بابەتەکە بەم ئاسانییە نییە کە بڵێین، تیۆریی گەشەسەندن تەنیا تیۆرییەکی بۆ دەوڵەتە داگیرکراوەکان و پێش کۆلۆنیالیزم[٣] لە پێناوی خێرایی بەخشین بە هەڵدانی ئابووریی نەتەوەیی بووە. ئامانجی گەشەسەندن، هەڵدانە و هۆکاری گەشەسەندن، دەوڵەتە. ئەمانە ئەو ئاکامانەن کە لەم تیۆرییە لە کاتی هاتنە بەرباسی لە دەیەی ٥٠ی زایینی بە دواوە بەدەست هاتوون)).

سەرەڕای ئەمەش، لە سێ دەیەی یەکەمی دوای جەنگ، ئەم راستییە کە تایبەتمەندییەکان و توانایی دەوڵەتەکان لەسەر گەشەسەندن کاریگەر دەبێ، لە بنەڕەتدا بەهۆی حاکم بوونی خۆشبینی فەلسەفی و دوور لە راستی کەمتر سەرنجی پێ دراوە.

رەنگە روانگەی دوور لە راستی لە وڵاتانی ئەفریقایی زۆرتر لە شوێنەکانی دیکە باوبێ.

لێکدانەوەی ورد لە سیاسەتی دەوڵەتەکان و لە ئاکامدا سیاسەتە گەشەسەندنی ئەوان، لە کاتێکدا سەرنجی پێدرا کە دەرکەوت تەنیا چەند دەوڵەتێکی کەم لە ئەمەریکای لاتین، ئاسیا یان ئەفریقیا، توانییان لە بەڕێوەبرەیی رەوتی گەشەسەندن سەرکەوتوو بن و زۆربەی دەوڵەتەکانی ئەم ناوچانە لەم بوارەدا سەرکەوتوو نەبوون. دوای ئەوە بوو کە بە کارکردنی زیاتر لەسەر پرسی سیاسی، دەوڵەت و حکوومەت وەك لایەنەکانی کاریگەر لە گەشەسەندن ناسێندران.

کاتێك ئابووریناسان رەهەندە سیاسییەکانی گەشەسەندن لەبەرچاو ناگرن، ئایا دەتوانین لە بەشی زانستی سیاسی و زاناکانی چاوەڕانییەکی زیاترمان هەبێ؟

رەنگە!! بەڵام لە کردەوەدا و لانیکەم هەتا ئەم دواییانە جگە لە چەند حاڵەتێکی دەگمەن، بایەخێکی زۆر کەمیان بە پێوەندی نێوان سیاسەت، دەوڵەت و گەشەسەندن لە جیهانی سێهەم لە بەشی زانستی دراوە.

---

(1) Migdal.
(2) Colin leys.
(3) Ex-Colonial.



هەروەك لە فەسڵی یەکەمدا ئاماژەم پێکرد، ئەم جۆرە بابەتانە، بە خوێندنەوەی ناوچەیی و خوێندنەوەی گەشەسەندن سپێردراون. چونکە لە هەر کات و شوێنێکدا کە بەشی زانستی سیاسی پرسی وڵاتانی جیهانی سێهەم تاوتوێ دەکەن، چوارچێوەی شیکارییان بەستراوەتەوە بە پرسە مێژوویی، دامەزراوەیی و رێکخستنەکان.

لە لایەکی دیکەوە زۆربەی خوێندنەوە تایبەتییەکانی سیاسی کە لە جیهانی سێهەم بەڕێوەچوون، لە ئاستێکی بەربڵاودا ئاماژەیان بە پرسە نێوخۆییەکانی وڵاتانی جیهانی سێهەم کردووە و زۆر بە کەمی ئاوڕیان بە پێوەندی ئەم بابەتانە و پرسە سیاسییەکان بە جیهانی دەرەوە داوەتەوە.

لەگەڵ ئەوەی کە بابەتی سەرەکی و هێڵی فیکریی خوێندنەوەکانی گەشەسەندن تاڕادەیەکی زۆر بابەتەکانی پێوەندیدار بە سیاسەتەکانی ئابووری گەورە[١] لە خۆی دەگرێ، هەندێك لە لێکۆڵەران هەوڵیان داوە هەتا بە کەڵك وەرگرتن لە تایبەتمەندیی دەوڵەتەکانی جیهانی سێهەم هۆکاری ناکامی گەشەکردوویی لەم وڵاتانە دەستنیشان بکەن. مەبەستی ئەم فەسڵە، دۆزینەوەی هەندێك لەم هۆکارانەیە. بەڵام پاش ئاماژەکردن بە بابەتی جێگای سەرنج، بە کورتی ئاوڕێك لە توخمە سەرەکییەکانی بیرۆکەی دەوڵەت دەکەین. مەبەستم لە ئاماژە بەم بابەتە، شیکردنەوەی ئەم بیرۆکەیە نییە چونکە بەرهەمی زۆر لەم پێوەندییەدا هەیە، بەڵکو مەبەستم لە ئاماژەی کورت بەو بەرهەمانەی لە پێوەندی لەگەڵ دەوڵەت لەبەردەستان، دۆزینەوەی هەندێك پێوەندی رێفرێنسگەلێکە لەم تیۆرییە هەتا سەرەڕای باسەکانی خۆم، ئاماژە بەوان بکەم. دووەمین مەبەستم لەم بەشە ئەوەیە کە هەتا باسەکانی پێوەندیدار بە دەوڵەتەکانی گەشەکردوو و دواکەوتوو نەتەنیا لە چوارچێوەی خوێندنەوەکانی گەشەسەندن یان خوێندنە ناوچەییەکان، بەڵکو لە چوارچێوەی باس و بابەتە سەرەکییەکانی بەشی زانستی سیاسی بێنمە گۆڕێ.

## ئەندێشەکانی بیرۆکەی دەوڵەت

دوو ئەندێشەی گرینگ باڵی بەسەر بیرۆکەی دەوڵەت و لێکدانەوەکانی پێوەندیدار بەو لە زانستی سیاسی مۆدێرندا کێشاوە. ئەندێشەی یەکەم و کۆنتر لە لایەن کارڵ مارکس و ئەندێشەی دووەم لە لایەن ماکس ڤیبەر پێشکەشکراوە.

ئاماژە کورت بە توخمەکان و بابەتە سەرەکییەکانی ئەم دوو ئەندێشەیە بە مەبەستی بەراوردکردنی بیرۆکەکانی پێوەندیدار بە دەوڵەتانی جیهانی سێهەم لەگەڵ ئەوان پێویستە.

---

(1) Macro-Economic Policy.





## ماركسيزم و دەوڵەت

لێکۆڵەرانی ئەم سەردەمەی بیرۆکەکانی مارکسیستی دەوڵەت دوو خوێندنەوەی گرینگییان لە بیرۆکەی دەوڵەتی مارکس و ئینگلس وەرگرتووە.

ویستگە و ریشەی خوێندنەوەی کلاسیکی یەکەم لە ((مانیفێستی کۆمۆنیزم))[1]ی مارکس و ئینگلس شاردراوەتەوە.

باسی سەرەکی ئەم خوێندنەوەیە بریتییە لەوەی کە دەوڵەت و ڕێکخراوە پێوەندیدارەکانی ئامرازی بورژوازی (چینی دەسەڵاتدار) لە کۆمەڵگای سەرمایەدار دان.

دەوڵەت و لایەنەکانی بەستراوە بەو لە خزمەتی بەرژەوەندی چینی بورژوا و دژی چینەکانی دیکە و بە تایبەت چینی کرێکارە.

دەتوانین ئەم بیرۆکەیە لە بۆچوونەکانی لینین و زۆربەی تیۆریسیەنەکانی مارکیستی ئەم دواییانە لەوانە میلیباند[2] ببینین.

ئەم پرسیارە کە کام یەك لە دەوڵەتەکانی جیهانی روو لە گەشە چینایەتییە و ئەوەی کە ئایا ئەم دەوڵەتە توانیویەتی دەستیان بە گەشەسەندنی کاپیتالیستی کاریگەر رابگا، لە راستیدا پرسیارێکی ئەزموونی و سەرتر لەو سیاسییە.

سەرەڕای جیاوازی زۆری نێوان چینە دەسەڵاتدارەکان لە دەوڵەتەکانی جیهانی سێهەم —وەك دەوڵەتی تالانچی هائیتی، فیلیپینی سەردەمی مارکۆس یان دەوڵەتەکانی تایلەند، سەنگاپوور— هەر جۆرە باسکردنێکی هەمە لایەنە لە پێوەندی لەگەڵ چینی دەسەڵاتدار دەبوایە زۆر بە پارێزەوە بکرایە.

دووەمین خوێندنەوە لە دەوڵەت لە بەرهەمی مارکس دەتوانین بە باشی لە نووسراوەکانی مارکس سەبارەت بە فەرەنسا ببینین. لەم نووسراوانەدا، مارکس، دەوڵەت و دەزگا پێوەندیدارەکانی وەك دەزگایەك کە تا رادەیەکی زۆر لە بەرژەوەندی سنووورداری بورژوازی سەربەخۆیە لەناو دەبا و پێی وایە کە تەنیا لە سەردەمی بناپارتی دووەم بە رواڵەت دەوڵەت سەربەخۆیی تەواوی وەدەست هێناوە.

دیارە دەوڵەتێکی ئەوتۆ بەهۆی پێویستییەکانی کاپیتالیزم کە تەنیا لە هەوڵی بردنە سەری بەرژەوەندییەکانی خۆیەتی، لەژێر فشارادایە.

(1) The Communist Manifesto.
(2) Miliband.



دیارە ناوبراو لەسەر ئەو بڕوایەیە کە خوێندنەوەیەکی ئەوتۆ لە دەوڵەت بە پێچەوانەی خوێندنەوەی سەرەتایی، وێنەیەکی وردتر و مێژوویی تر لە رۆڵی دەوڵەت لە گەشەسەندنی کۆمەڵگای کاپیتالیستی لە سەدەی شازدەهەم بە دواوە دەخاتەڕوو. (Elster, 1985)

دواتر مارکسیستی یۆنانی، نیکۆس پولانزاس[1]، بە پێداگرتن لەسەر بیرۆکەی سەربەخۆیی رێژەیی دەوڵەت لە کۆمەڵگای کاپیتالیستی کە لە بیرۆکەی گرامیشی وەرگیراوە. ئاماژە بە لێکدانەوەو راڤەکردنی کامڵتری خوێندنەوەی دووەم لە دەوڵەت دەکا.

پولانزاس دەیویست هەتا لە نێوان ئەم خوێندنەوەیە لە دەوڵەت و ئەوەی کە بۆ خۆی پێی وایە خوێندنەوەیەکی ساکارانەیە کە ((دەوڵەتی وەك ئامرازێك لە دەستی چینی نێونجی لێکدەدایەوە)) جیاوازی دابنێ. (Poulantzas, 1973)

کارکردی سەرەکی دەوڵەت، پێکهێنانی سەقامگیریی، سەرەڕای بوونی جیاوازییە حاشا هەڵنەگرەکان کە لە هەر کۆمەڵگایەکی کاپیتالیستیدا هەیە و مەرجی هاتنەدی ئەم کارکردە سەربەخۆیی رێژەیی دەوڵەتە. لەرووی گەشەخوازییەوە، خوێندنەوەی دووەم لە دەوڵەت لە نووسراوەکانی مارکس لە دەوڵەتی لە حاڵی مۆدێرنیزاسیۆن وەرگیراوە کە چالاك، روو لە گەشە و پایەندبێ بە پێشکەوتنی گەشەسەندنی کاپتالیستی. ئەم خوێندنەوەیە بە تەواوی لە ژێر کاریگەری خوێندنەوەی مێژوویی مارکس لە کاپیتالیزم وەك هێزی شۆڕشگێڕی مۆدێرنیزاسیۆن لە مێژووی مرۆڤ دایە.

کەموکوڕیی تێگەیشتنی خوێندنەوەیەکی ئەوتۆ لە سەربەخۆیی رێژەیی دەوڵەت لە نووسراوەکانی مارکس، لە باسەکانی هاوچەرخ لە پێوەندی لەگەڵ ((کاریگەریی دەوڵەتانی گەشە کردوو))[2] لە جیهانی سێهەم، خاوەنی چەندین نموونەی بەرچاون. بە روونی دەتوانین ببینین کە هەندێك لە دەوڵەتەکان لە جیهانی سێهەم وەك کۆریای باشوور و بوتسوانا لە پێکهێنانی سەربەخۆیی سەرکەوتوو بوون، لە حاڵێکدا هەندێکی دیکە وەك هیند سەرکەوتوو نەبوون. (Corbridge and Harriss, 2000)

(1) Nicos Poulantzas.
(2) Effenctive Developmental Sates.





**ڤیبەر و دەوڵەت**

لە روانگەی ڤیبەرەوە، دەوڵەتە مۆدێرنەکان بەتایبەتی دەوڵەتە رۆژئاواییەکان بەم دواییانە بە گەشەسەندنی تەواوی گەیشتوون.

تایبەتمەندیی دەسەڵات لە دەوڵەتی مۆدێرن لەگەڵ تایبەتمەندیی دەسەڵات لە جۆرەکانی دیکەی دەوڵەت کە ڤیبەر پێشتر ئەوانەی دەستنیشان کردبوو، لەرووی جۆرناسییی[(١)] دەسەڵات، زۆر جیاوازە.

شێوازی تایبەتی حکوومەت دەسەڵاتی دەوڵەتی مۆدێرن لە دەسەڵاتی نەریتی و بەتایبەت دەسەڵاتی پاتریمونیال کە لە کۆمەڵگاکانی پێش سەرمایەداریدا هەبوون، جیاوازە. تایبەتمەندیی بەرچاوی هێز و دەسەڵاتی دەوڵەتی لە حکوومەتی پاتریمونیال، وەرگرتنی حکوومەتی تاکەکەس لە لاین خەڵکەوە بوو کە شێوازی توندتری ئەو شتە بوو کە ڤیبەر پێی دەگوت ((سوڵتانیزم)). (Weber, 1964, p.346) ڤیبەر بەم جۆرە ئەم حکوومەتە پێناسە دەکا:

((کەسێك کە دەسەڵاتی بە دەستە تاکێکی سەرتر نییە، بەڵکو تاکێکی زاڵە. دەزگای حکوومەتی ئەم تاکە، پێکنەهاتووە لە کارمەندگەلی راستەقینە، بەڵکو بریتین لە دەست و پێوەندی ((حاکم)). پێوەندی نێوان حاکم و دەزگای حکوومەتییەکەی بە پێی رێوشوێن و یاسای ئیداریی نییە بەڵکو لە چوارچێوەی وەفاداری تاکە بەرامبەر بە حاکم)). (Weber, 1964, p.341)

هەروەها ڤیبەر پێی وایە کە لە حکوومەتێکی پاتریمونیالدا ((بابەتە سیاسییەکان وەك کاروباری تایبەتی حاکم چاو لێدەکرێ و هێزی سیاسیش وەك بەشێك لە داراییەکانی حاکم لەبەرچاو گیراوە)). (Weber, 1968)

ئەم لێدوانەی ناوبراو لە کردەوەدا بەو مانایەیە کە:

لە حکوومەتێکی ئەوتۆدا، عەدالەتی ئیداری و سەرنجدان بە یاسا و رێوشوێنەکان لەبەرچاو ناگیرێن و لە کردەوەدا هەموو شتێك بە روونی بەستراوەتەوە بە تێبینیی تایبەتی و پێوەندی و حەز و دەسەڵاتی تاکەکەس. (Ibid)

شایانی باسە کە پێناسەی دەوڵەتانی جیهانی سێهەم وەك دەوڵەتانی ((میراتگری نوێ))[(٢)] یان دەوڵەتە سەرکوتکەرەکان[(٣)] (وەك هائیتی و زائیر) یان دەوڵەتە خاوەن کوتلەکان[(٤)] (وەك فیلیپین)، لە ژێر کاریگەری خوێندنەوەکانی ڤیبەر لە دەوڵەت بوون.

(1) Typology.
(2) Neo-Patrimonial.
(3) Predatory.
(4) Cronyist State.



بە پێچەوانەی دەوڵەتە سەرەتاییەکان، ڤیبەر، پێی وایە دەوڵەتی مۆدێرن لە پێوەندی لەگەڵ سەر زەوییەکی دیاریکراودا مافی بەکارهێنانی هێزی لەو سەرزەوییەدا هەیە. (Weber,1964,p.156)

ئەم جۆرە دەوڵەتە لە لایەن خەڵکەوە بە رەوا زانراوە و لە رێگای دەزگایەکی حکوومەتی یاسامەند و رێکوپێك کە بەهۆی نوێنەران و بەشەکانی یاسادانان سنووردار دەکرێ، بەڕێوەدەچێ. (Albrow, 1970, p.45) ڤیبەر پێی وایە تایبەتمەندیی بەرچاوی دەوڵەتی مۆدێرن بوروکراسییە کە لە روانگەی ناوبراوەوە نیشاندەری (( دەسەڵاتی عەقڵانی-یاسایی))ە کە بە تەواوی لە حکوومەتەکانی میراتگر و سوڵتانیزم کە پێشتر ئاماژەی پێکراوە، جیاوازە.

تایبەتمەندییەکانی بوروکراسی جێگای سەرنجی ڤیبەر بریتین لە:

١- ئازادی بە کردەوەی کارمەندەکان لەگەڵ پابەندبوونیان بە بەڕێوەبردنی ئەرکی ئیداری.
٢- زنجیرەی پلەداران[(١)].
٣- دیاریکردنی ئەرکی هەریەك لە ئیدارەکان
٤- دامەزراندن بە پێی رێککەوتننامە.
٥- هەڵبژاردنی کارمەند بە پێی لێوەشاوەیی لە پیشەکەیدا.
٦- دابینکردنی مووچە و مافی خانەنشین کردن.
٧- کاری ئیداری وەك تەنیا چالاکی یان گرینگترین پیشەی کارمەندەکان.
٨- بردنە سەری پلە بە پێی لێهاتوویی و توانایی.
٩- تاپۆ نەکردنی پیشەکان (پۆستەکان) و سەرچاوەکانی پێوەندیدار لە لایەن کارمەندەکان.
١٠- رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کارمەندەکان بە پێی یاسا.

خوێندنەوەی ڤیبەر لە دەوڵەت و بوروکراسی کاریگەری قووڵی لەسەر زانستی سیاسی غەیرە مارکسیستی لە رۆژئاوا بەجێهێشتووە. ئەم خوێندنەوەیە بووەتە بنەمای سەرەکی بۆ لێکۆڵینەوەکانی پێوەندیدار بە بیرۆکەی ئەزموونی دیموکراتیك و دارشتنی سیاسەتی گشتی.

لە راستیدا ئەگەر کەسێك بیهەوێ ((گوتاری دەوڵەت))[(٢)] لە چوارچێوەی ئەم خوێندنەوەیەدا بەکاربێنێ، ئەم بیرۆکە و شێوازانە، بنەمای سەرەکی بیرۆکە و شێوازەکانی سۆسیال دیموکراتیك و لیبراڵی رۆژئاوایی بوونیاد دەنێ.

(1) Hierarchy.
(2) State Discourse.





سەیر نییە کە زۆربەی تایبەتمەندییەکانی ئەم پێناسە چڕ و پڕە لە بوروکراسی جێگای پەسند، بەشێوەیەکی بەرچاو لە روانگەی رۆژئاوایی لە ((حکوومەتی دڵخواز)) کە لە دەیەی ٨٠ و ٩٠ی زایینی لەلایەن بانکی جیهانی و رێکخراوەکانی گەشەخواز و دەوڵەتە رۆژئاواییەکان پێشکەش کرابوو، رۆڵی هەبووە.

لەبەر ئەم هۆکارەیە کە ئەم بیرۆکانە لە لایەن رێبەران و بیرمەندانی جیهانی سێهەم رەخنەیان لێگیرا و رەتکرانەوە.

لە هەر حاڵدا، شتێك کە لە پێناوی ئامانجی ئەم کتێبەدا لە پێوەندی لەگەڵ تیۆرییە نەریتییەکانی دەوڵەت —مارکسیستی و ڤیبەری— گرینگە، ئەمەیە کە هەر دووی ئەم تیۆرییانە کۆمەڵگای کاپیتالیستی پیشەسازی پێشکەوتوو یان لە حاڵی پێشکەوتنیان لە تیۆرییەکانی خۆیاندا وەك پێش گریمانە داناوە.

هەردوو تیۆری ئاکامی دارشتنی تیۆریی سیاسی لە کۆمەڵگای کاپیتالیستییە و تا ئاستێکی جێگای سەرنجیش لە هەمان چوارچێوەی فیکریدا ماوەتەوە.

لە روانگەی مارکسەوە (بەتایبەتی لە خوێندنەوەی دووەم لە دەوڵەت)، دەوڵەت یارمەتی بە بڵاوبوونەوەی رەوتی گەشەسەندنی کاپیتالیستی دەدا لە هەمان کاتدا دەبێتە هۆی زیادبوونی جیاوازی و کێشە دەروونییەکان. (Polant Zas, 1973, Warren, 1980, Elster, 1985)

لە راستیدا دەتوانین دەوڵەتی ئیمپراتۆری لە هیند[1] وەك نموونەیەك بۆ ئەم نووسراوەی مارکس بێنینەوە کە لە رێگای پێکهێنانی یەکێتی سیاسی، پێوەندی نێوان شارەکان بەهۆی رێگای ئاسن و تێلیگراف، پێوەندی نێونەتەوەیی بە هۆی کەشتییەکانی هەڵمی، چاپەمەنی ئازاد و سیستەمی نەتەوەیی یاسایی و سوپای رێك و پێك دەستیان بە گەشەسەندنی کاپیتالیستی جێگای سەرنجی مارکس راگەیشت. لە لایەکی دیکەوە لە روانگەی مارکس ڤیبەرەوە دەوڵەتی مۆدێرن و بوروکراسی بەستراوە بەو، نەتەنیا یەکێك لە مەرجەکانی گەشەسەندنی کاپیتالیستییە بەڵکو وەك یەکێك لە ئاسەوارەکانی ئەم رەوتەش چاوی لێ دەکرێ.

سەرەڕای ئەمەش، خوێندنەوەی مارکس ڤیبەر، لە رۆڵی سەرەکی عەقڵانییەت ((لەسەر بە پیشەسازی بوونی کاپیتالیستی رۆژئاوا پێ دادەگرێ. ڤیبەر بە پەڕارەیەکی تایبەتەوە بەم جۆرە

(1) Imperial State in India.



باس دەکا کە ((عەقڵانییەت چارەنووسی سەردەمی ئێمە دیاری دەکا)). ناوبراو لەم بارەیەوە دەڵێ: ((لە سەردەمی ئێمەدا هیچ هێزێکی نامۆ نییە کە پێویست بە لێپێچینەوە نەکا و هەموو شت بەهۆی لێپێچینەوەو عەقڵانییەتەوە دەخرێتە ژێر چاودێری. ئەمەش بە مانای بێ هیوایی خەڵکی جیهانە چونکە چی دیکە هیچکەس ناتوانێ پشت بە هێزە بان سروشتییەکان ببەستێ)). (Weber, 1965, p.139)

بە شێوەیەکی بەرچاو، بۆچوونی ڤیبەر لە هەمبەر بێ هیوایی خەڵکی جیهان، لە روانگەی مارکسەوە جێگای خۆشحاڵییە، چونکە ناوبراو ئەم بارودۆخە وەك بنەمایەك بۆ ئازادی مرۆڤ لە نەزانی، خورافات، دەسەڵاتی سروشت و لە کۆتاییدا ئازادبوون لە ستەمی سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتی دەزانێ.

سەرەڕای ئەمەش خاڵی گرینگ ئەمەیە کە مارکس و ڤیبەر دەوڵەتی مۆدێرنیان وەك کارکرد و لە هەمان کاتدا وەك هۆکاری گەشەسەندنی کاپیتالیستی چاو لێکردووە کە کۆمەڵێك دامەزراوەی هەماهەنگکراو دەسەڵاتدارن، کە هەردوو بەهۆی لۆژیك و پێویستییەکانی بە پیشەسازی بوون رێکخراون و لە هەمان کاتدا پێکهێنراون. بەڵام لە دەیەی ١٩٥٠ کە خوێندنەوەکانی تایبەت بە جیهانی سێهەم پەرەی ئەستاند، کۆمەڵگایەکی زۆر کەم لە جیهانی سێهەمدا هەبوون کە لە هەموو رەهەندەکانەوە شایانی بەراورد کردن لەگەڵ دەوڵەتە رۆژئاواییەکان بوون، تەنانەت ئەم چەند کۆمەڵگایەش، خاوەنی هەندێك تایبەتمەندی جێگای سەرنجی مارکس و ڤیبەر لە دەوڵەتی مۆدێرن نەبوون. لەگەڵ ئەمەشدا، تەنیا ژمارەیەکی زۆر کەم لە دەوڵەتانی جیهانی سێهەم، هەتا ئەم ئێستا، لە رێڕەوی گەشەسەندنی پیشەسازیی کاپیتالیستی لە شێوازی رۆژئاواییەکەی، هەڵکەوتوون و لەو وڵاتانەی کە پێوەندی کاپیتالیستی بە شێوەیەکی سیستماتیك و بەربڵاوبووە (وەك ئەمەریکای لاتین) گەشەسەندن تا هەوسەنگ، بەستراوە، رێژەیی و چەواشەکراو بووە. (Cardoso, 1979) لەگەڵ ئەمەشدا، هەندێك لە دەوڵەتانی ئەمەریکای لاتین، کە خۆیان لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی جێگای سەرنجی مارکس و ڤیبەر لە دەوڵەت، گونجاندبوو میراتگری نەریتەکانی ((کادیلیزمو))[1] کە بریتییە لە تاکگەرایی[2]، باندبازی[1] و ناوەندگەرایی[2] بوون. (Dominguez, 1987)

(1) Caudilismo.
(2) Personalism.





بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، هێشتا دەوڵەتگەلێك وەك دەوڵەتانی پاش كۆلۆنیالیزم و شۆڕشگێڕی هەن كە بەدوای گەشەسەندنی ئابووریدان. (Robertson, 1984) هەرچەند ئەم جۆرە دەوڵەتانە (لە شوێنە جیاجیاكانی جیهان) خاوەنی قۆناغێكی كورت لە هەڵدان و گەشەسەندن بوون، بەڵام لێكۆڵینەوەكانی بەرێوەچوو لە دوو دەیەی دوای قەیرانی نەوتی ١٩٧٠، نیشاندەری رابردووی نێگەتیڤی گەشەخوازی لەم وڵاتانەدا بوو. هەروەك لە فەسڵی پێشوو ئاماژەم پێكرد هاتنەخوارەوەی هەڵدان، نایەكسانی لە رادەبەدەر، چوونە سەری هەژاری و پەرە ئەستاندنی جیاوازییەكان لە تایبەتمەندییە بەرچاوەكانی ئەم وڵاتانە بووە. (World Bank, 1990)

یەكێك لە راسپاردە تیۆریكەكان كە لە پێوەندی لەگەڵ ئەم دیاردەیە پێشكەش كراوە بیرۆكەی ((سیستەمی جیهانی))یە. ئەم بیرۆكەیە رابردووی نێگەتیڤی گەشەخوازی لە چوارچێوەی بەربەستە دەرەكییەكان و كاریگەریی رووخێنەری كۆلۆنیالیزم و بەردەوامی بەستراوەیی بە جەمسەرە زاڵەكانی ئابووری لە ئابووریی كاپیتالیستیدا دەزانێ كە لەودا وڵاتانی روو لە گەشە تەنیا وەك پەراوێز و بەستراوە سەیر دەكرێن. (Wallerstein, 1979) هەرچەند كە ئەم تیۆرییە بۆچوونی جێگای پەسند و گرینگی لە پێوەندی لەگەڵ كاریگەریی نایەكسانییە جیهانییەكان و لە ئاكامدا دروست بوونی روانگەی سیاسی گرینگ لە هەمبەر تیجارەتی جیهانی، پێشكەش دەكا، بەڵام ئەم تیۆرییە رێگاچارەیەكی شیكارییە كە راستی و دروستییەكەی بە تێپەڕبوونی زەمان نەسەلمێندراوە.

(Lau, 1975, Warren, 1980, Field house, 1986, Hagard, 1990, Leys, 1995)

دووەمین رێگاچارەی شیكاریی كە لێرەدا ئاماژەی پێدەكەم، پێ لەسەر هۆكاری نێوخۆیی بە تایبەت رۆڵی دەوڵەت لە گەشەسەندن دادەگرێ. زۆر تیۆری لەسەر ئەم بنەمایە سەبارەت بە تایبەتمەندییەكان و تواناییەكانی دەوڵەتانی جیهانی سێهەم پێشكەش كراون. ئێستا ئەم پرسیارە دێتە گۆڕێ كە بنەمای ئەم بیرۆكانە چییە و چ پێوەندییەكی لەگەڵ روانگەكانی ڤیبەر و ماركس سەبارەت بە دەوڵەت لە زانستی سیاسیدا هەیە؟

(1) Clientism
(2) Centeralism.



### میرداڵ و دەوڵەتی نەرم[1]

((كاتێك لە شەودا هەموو جیهان نوستووە، هیند بەخەبەردێ هەتا بژی و ئازاد بێ.. جێگای خۆیەتی كە لەم باودۆخەدا، هەموومان پابەندیین بە خزمەتكردنی هیند و خەڵكەكەی و ئامانجە بەرزە ئینسانییەكانی.. خزمەت بە هیند واتە خزمەت بە ملیۆنان مرۆڤی ئازاری چێشتووە. ئەمە بە مانای كۆتایی هێنان بە هەژاری، نەزانی و نەخۆشی و نابەرامبەری دەرەتانەكانە)). (Moraes, 1957, p.1-2)

جەواهر لەعل نەهرۆ، بەم وتارە، رێبەرایەتی سەربەخۆیی هیندی لە ١٤ی ئاگوستی ١٩٤٨ بەدەستەوە گرت. سەرەڕای پێشكەوتنی سەرەتایی لە هەندێك بواردا، راستییەكەی ئەوەیە كە ٢٠ ساڵ دوای ئەو ملیۆنان هیندی لە نەزانی و نەخۆشیدا بوون. (Corbridge and Harris, 2000)

لە هەوڵدانێك بۆ پاساودانی رەوتی لەسەرخۆی گەشەسەندن لە هیند ئەویش ٢٠ ساڵ دوای سەربەخۆیی، گانێر میرداڵ[2] بیرۆكەی ((دەوڵەتی نەرم))ی لە دەیەی ١٩٦٠ پێشكەش كرد. (Myrdal, 1968)

ئەگەرچی بیرۆكەی ناوبراو زۆرتر لەسە بنەمای لێكۆڵینەوەی بەربلاوی خۆی لە باشووری ئاسیا بووە بەڵام لە راستیدا ئەم تیۆرییە بە وردی لەگەڵ رەوشی دەوڵەتی هیند دەگونجا. هەرچەند كە دەتوانین لە پێناسەی وڵاتانی دیكەی جیهانی سێهەمیش بەكاربێنین.

### دەوڵەتی نەرمی میرداڵ بەم جۆرە پێناسە دەكرێ

نەبوونی پرەنسیپی كۆمەڵایەتی لە وڵاتانی گەشەنەكردوو لەگەڵ پێشێلكردنی یاسادانان بەتایبەتی بەرێوەنەبردنی یاساكان، پێرەوی نەكردن لە یاساكان و رێوشوێنەكانی پێشكەشكراو لە لایەن بەرپرسانی فەرمی لە ئاستە جۆراوجۆرەكاندا و بوونی جیاوازیی بەرژەوەندیی لە نێوان بەرپرسانی فەرمی و تاكەكان و گرووپە دەسەڵاتدارەكان لە كۆمەڵگا كە دەتوانێ ببێتە هۆی پێكهێنانی هەڵوێستێكی گشتی لەنێو خەڵك بۆ دژایەتی كردنی چاودێری گشتی، لە تایبەتمەندییەكانی ئەم دەوڵەتەیە. سەرەڕای تایبەتمەندییەكانی سەرەوە، گەندەڵی وەك

(1) Myrdal and Soft State.
(2) Gunner Myrdal.





دیاردەیەك کە لە تەواوی وڵاتانی گەشە نەکردوو لە حاڵی بڵاوبوونەوەدایە، ئەویش یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندییەکانی دەوڵەتی نەرمە. (Myrdal, 1970)

دەوڵەتی نەرم بەرهەمی رەوشی سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتی لە باشووری ئاسیایە. کۆلۆنیالیزم بە هەڵوەشاندنەوەی رێکخراوەکانی نەریتی، گوندی و بەبێ دیاریکردنی بەدیلێکی دڵنیاکەرەوە بۆ ئەوان، بواریان بۆ چەواشەکردنی ئەم رەوشە رەخساندووە. هەروەها دەوڵەتی نەرم بەردەوام بوونی ئەو روانگانەیە کە میردال پێی دەڵێ ((نافەرمانی))[1] لە حکوومەتدا. ناوبراو ((نافەرمانی))ی بەکاریگەرترین چەك دەزانێ لە خەباتی سەربەخۆیی خوازانە دژی حکوومەتی داگیرکەر. ئەم بیرۆکەیە دواتر لە پێوەندی لەگەڵ دەوڵەتە ئەفریقاییەکانیش لەلایەن پیتەر ئێکە[2] کەڵکی لێوەرگیراوە.

بیر لێکردنەوە لە نەبوونی پرەنسیپی کۆمەڵایەتی وەك ناوەندی تیۆریی میردال، زۆر گشتی دێتە بەرچاو. بەڵام دەردەکەوێ کە مەبەستی ناوبراو لە نەبوونی پرەنسیپی کۆمەڵایەتی لاوازیی هەمە لایەنە یان کەمتەرخەمی خەڵك لە پاراستنی یاساکان و رێوشوێنەکانە لە هەموو ئاستێکدا و یان بە واتایەکی دیکە رەوشێك کە لەودا یاسا و پاراستن و بەرێوەبردنی زۆر لاوازبێ. (Myrdal, 1970)

چونکە ئەم دەوڵەتە توانایی ئەوەی نییە کە بتوانێ بە شێوەیەکی جیددی گەندەڵی لە هەموو ئاستێکدا ریشەکێش بکا. یەکێك لە ئاسەوارەکانی دەوڵەتی نەرم ئەمەیە کە رەوشی گونجاو بۆ نوخبە پارێزگار و دواکەوتووەکان لە ناوچە گوندی و شارییەکان دەرەخسێنێ هەتا لە پێناو لاوازکردنی بەرێوەچوونی پرۆگرامەکانی مۆدێرنیزاسیۆن هەنگاو هەڵگرن.

بۆ نموونە پرۆگرامی ((Land to the Tiller)) لە چاکسازی زەوییە کشتوکاڵییەکان لە هیندا تەنیا لە سنووری قسەدا بووە، چونکە دەوڵەتی نەرم نەیتوانی پێش بە بەرێوەنەچوونی پرۆگرامەکە بگرێ. بە کورتی، میردال پێی وایە کە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی لە وڵاتانی زوو لە گەشە، کۆسپن لەسەر رێی بەرێوەچوونی کاریگەری یاساکان و رێوشوێنەکانی گەشەسەندن.

(1) Disobedience.
(2) Peter Ekeh.



بە پێی ئەزموونەکانی میردال، دەتوانین خاڵی بەرامبەری ((دەوڵەتی نەرم)) لە دەوڵەتە دەوڵەمەندەکانی سکاندیناویدا ببینین.

خاڵێکی گرینگی دیکە کە پێویستە ئاماژەی پێ بکرێ (سەرەڕای ئەوەی کە میردال بۆ خۆی باسی ناکا) ئەمەیە کە ناوبراو یەکێك لە یەکەمین کەسانێکە کە پێی لەسەر رۆڵی سەرەکی سیاسەت لە گەشەسەندن دادەگرت.

### دەوڵەتانی گەشەکردووی دەرەکی[1]

پێناسەی میردال لە ((دەوڵەتی نەرم) لە هیندا نموونەیەکی گونجاوە لە رێگاچارەی کۆمەڵگا تەوەر لە بیرۆکەی دەوڵەت و لەسەر ئەم خاڵە کە چۆن بێ سەرەو بەرەیی دەتوانێ کاریگەر بێ لەسەر کارکرد و تایبەتمەندییەکانی دەوڵەت لە جیهانی روو لە گەشە، پێ دادەگرێ. (Nord Linger, 1987)

لە لایەکی دیکەوە بیرۆکەی بە کەڵکی هەمزە عەللاوی[2] سەبارەت بە ((دەوڵەتانی گەشەکردووی دەرەکی)) زۆرتر لە روانگەی دەوڵەت تەوەر کەوتووەتە بەرباس و خاوەنی دوورە دیمەنێکە کە بە شێوەی بەربڵاو بەراورد دەکرێ. عەللاوی لەسەر ((تایبەتمەندیی مێژوویی کۆمەڵگاکانی دوای کۆلۆنیالیزم)) کە لە مێژووی کۆلۆنیالیزمی ئەوان وەگیراوە و لە ئاکامدا لەسەر تایبەتمەندیی ئەو دەوڵەتانەی کە پاش ئەو قۆناغە دروست بوون، پێی دادەگرت.

ناوبراو پێی وابوو کە چەمکناسی و تێگەیشتنی ((دەوڵەتی پاش کۆلۆنیالیزم)) لە دەوڵەتە پێکهاتووەکان لە ئەورووپا کە بەرهەمی شۆڕشە بورژوازییەکان بوون، زۆر جیاوازە.

عەللاوی، بە پێداگرتن لەسەر ئاسەواری سیاسی و ئابووری پێکهاتەکانی دەسەڵات و دامەزراوەکانی بە میرات بەجێ ماو لە قۆناغی کۆلۆنیالیزم پاش ئەوە بوو کە بیرۆکەی چینایەتی مارکس لە لێکدانەوەی کۆمەڵگاکان پاش کۆلۆنیالیزم بباتە ژێر پرسیارەوە. سەرەڕای ئەم روانگەیە، ناوبراو هەوڵی دەدا هەتا باسەکانی خۆی لە چوارچێوەی بەربڵاوتر لە بیرۆکەی چینایەتی مارکس، بگونجێنێ.

هەرچەند کە بیرۆکەی ناوبراو زۆرتر پشتی بە بەڵگەکانی پاکستان و بەنگلادیش بەستبوو بەڵام وەك بیرۆکەی میردال دەتوانین بۆ ئەفریقاش کەڵکی لێوەربگرین. (Saul, 1974).

(1) The Overdeveloped States.
(2) Hamza Alavi.





عەللاوی لەسەر ئەو بڕوایە بوو کە بە پێچەوانەی دەوڵەتە مۆدێرنەکانی ئەورووپی کە ڕەنگە سەرهەڵدانیان نێوخۆیی بووە، دەوڵەتە داگیرکراوەکان ریشەیان لە کۆمەڵگای مێترۆ پۆلیناندا[1] هەیە نەك کۆمەڵگاکانی ژێر کۆنترۆڵی کۆلۆنیالیزم. ئەم تایبەتمەندییە، دیاردەیەکی بەرچاوی ئەم دەوڵەتانە.

دەوڵەتە داگیرکراوەکان و دەوڵەتەکانی دوای ئەوان (دەوڵەتانی دوای کۆلۆنیالیزم) بەو جۆرەی کە لە بیرۆکەکانی مارکس و ڤیبەر شیکراوەتەوە، بەرهەمی پێکهاتەی چینایەتی و کۆمەڵایەتی و سیاسەتە نێوخۆییەکان و کارکردنی ئابووریی کۆمەڵگا نێوخۆیی نییە. بە کورتی دەبێ بڵێین کە بە پێچەوانەی دەوڵەتە مۆدێرنەکانی ئەورووپی کە بیرۆکەکانی مارکس و ڤیبەر لەسەر بنەمای ئەوان دامەزراوە، دەوڵەتانی پاش کۆلۆنیالیزم بەرهەمی مێژوویی گەشەسەندنی کۆمەڵگای خۆیان نین، بە پێچەوانەوە، ئەم دەوڵەتانە بەرهەمی هێزەکانی دەرەوەی کۆمەڵگای خۆیانن. دامەزراوەکان و سیاسەتەکانی ئەم دەوڵەتانە، بەهۆی دەسەڵاتەکانی مێترۆپۆلیتان و لە چوارچێوەی ئامانجەکانیان، کە بریتییە لە ئاسانکاریی بۆ دەستڕاگەیشتن بە بەرژەوەندی تیجاریی، پێکهاتوون. ناوبراو پێی وایە کە ((پێکهاتە گەورەکان))[2] کە لە کۆمەڵگای داگیرکراودا هەن لەو ڕووە و کە لە پێکهاتەکانی کۆمەڵگای کۆلۆنیالیزم وەرگیراون لە بەراورد لەگەڵ ((پێکهاتەکانی)) نێوخۆیی خودی کۆمەڵگای داگیرکراو زۆر گەشەکردووتر بووە، بەڵام هاوکات لەگەڵ سەربەخۆیی، کۆڵەکەکانی پێکهاتە گەورەکان لە خودی پێکهاتەکانی جیادەبنەوە. (Alavi, 1972)

لە قۆناغی کۆلۆنیالیزم، دەزگا سەربازی-بوروکراتیکەکان کە کۆنترۆڵی چینە کۆمەڵایەتییەکانی نێوخۆییان گرتبووە ئەستۆ، ناوکی سەرەکی دەوڵەتیان پێکدەهێنا. هەر ئەم دەزگا سەربازی-بوروکراتیکانە بوون کە لە دەوڵەتە نوێیەکاندا پاش کۆلۆنیالیزم توخمی سەرەکی کۆنترۆڵ و یاسامەند کردنی چالاکییەکانی چینە کۆمەڵایەتییەکانیان پێکدەهێنا.

عەللاوی پێی وایە کە لە پاکستان، ئەم دەزگایانە لە کاتی سەربەخۆیی، ڕۆڵی کاریگەری لە کۆنترۆڵی دەسەڵاتی دەوڵەتیدا هەبووە، هەرچەند کە هەندێك جار لە ژێر ناوی سیاسەتە دیموکراتیکەکان وەك ((دیموکراسی بنەڕەتی)) ئەیوب خان، کەڵکیان لێوەردەگرت. سەرەڕای ئەمەش، دەسەڵاتی دەوڵەتی سەربازی-بوروکراتیك، لە کاتی سەربەخۆیی بە چوونە سەری چاودێرییەکان لە ڕێگای ژمارەیەکی زۆر لە ڕێکخراوە گشتییەکان پەرەی ئەستاند.

(1) Metropolitan.
(2) Super Structure.



وەك ڕوانگەی میردال لە ((دەوڵەتی نەرم))، دەوڵەتی ((گەشەکردووی دەرەکی)) پاش کۆلۆنیالیزم لە پاکستان نە لە چوارچێوەی چەمکی چینایەتی مارکس دەگونجێ و نە لە پێکهاتە و سەرچاوەی بیرۆکەی ناوبراو یەك دەگرێتەوە. لە ئاکامدا دەبێ بڵێین کە چەمکی دەوڵەت ((گەشەکردووی دەرەکی)) وێکچوونێکی زۆر کەمی لەگەڵ مۆدێلەکانی چینایەتی مارکسیستی و خوێندنەوەکانی ڤیبەر لە دەسەڵاتی دەوڵەتدا هەیە.

لە لایەك ئەم چەمکە لەگەڵ مۆدێلی پاتریمونیالی ڤیبەر کە لەودا بوروکراسی وەك پێکهاتەی ئیداریی تایبەت بە ڕێبەری دەسەڵاتدارە، یەك ناگرێتەوە. لە لایەکی دیکەوە چەمکی دەوڵەت ((گەشەکردووی دەرەکی)) هیچ یەك لە تایبەتمەندییەکانی دەوڵەتی مۆدێرنی ڤیبەر بە تایبەتی پێوەندی نێوان سیاسەت و بوروکراسیشی نییە.

هەرچەند کە چەمکی ((دەوڵەتی گەشەکردووی دەرەکی)) داهێنانێکی سەرنجڕاکێش لە دارشتنی تیۆریی مارکسیستی لە دەوڵەتدا بووە، بەڵام ڕەنگە بتوانین بڵێین کە گرینگترین تایبەتمەندیی ئەو پێوەندی بە پێداگری لەسەر میراتی سەربازی، بوروکراتیك و ڕێکخراوە بەجێماوەکانی قۆناغی کۆلۆنیالیزم هەیە، کە تایبەتمەندیی و کارکردی گەشەسەندنی دەوڵەت پاش کۆلۆنیالیزم پێناسە دەکا.

بە کورتی، دەبێ بڵێین کە وەك بیرۆکەی ((دەوڵەتی نەرم))ی میردال، چەمکی ((گەشەکردووی دەرەکی))، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، ئاماژە بە هێزە سیاسییە نێوخۆیی و دەرەکییەکان کە پێکهێنەری دەوڵەتە نوێیەکان بوون و لە توانایی گەشەخوازی ئەم دەوڵەتانەدا ڕۆڵی گرینگیان گێڕاوە، دەکا.

لەگەڵ ئەمەشدا بیرۆکەی دەوڵەت ((گەشەکردووی دەرەکی)) نیشاندەری گرینگی لێکدانەوەی بەراورد کردنێکە لە نێوان سیاسەتەکانی دەوڵەتی کۆلۆنیالیزم و میراتی بەجێماوی. (Young, 1994)

ڕۆڵی ژاپۆن لە ڕێکخستنی توانایی و پێکهاتەی دەوڵەتی کۆریا لە سەردەمی داگیرکردنی ئەم وڵاتە لە لایەن ژاپۆنەوە لە نیوەی یەکەمی سەدەی ٢٠، بە باشی نیشاندەری ئەولەوییەتی سیاسەتە لە پێکهێنانی دەوڵەتی کۆلۆنیالیزم و پاش کۆلۆنیالیزم. (Kohli, 1993) ژاپۆن بە شێوەیەکی کاریگەر کۆڵەکەکانی دەوڵەتی گەشەخوازی لە کۆریا دامەزراند. هەڵوێستێکی ئەوتۆ لە تەواوی قۆناغی کۆلۆنیالیزم تایبەت بە ژاپۆن بووە. ژاپۆنییەکان بە هێنانی کارناسان و شێوازەکانی بەڕێوەبەری گەشەخوازی کە لە ئەزموونەکانی خودی خۆیان وەرگیرابوو، بووە هۆی گۆڕانکاریی خوارەوە لە کۆریا:





((گۆڕینی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی گەندەڵ و ناکارامە بۆ پێکهاتەیەکی بەهێز و کاریگەر کە هاوکات توانایی کۆنترۆڵ و گۆڕانی کۆمەڵگای کۆریای هەبوو)). (Kohli, 1993)

ئەم بابەتە پرسێکە کە بە دژواری دەتوانین سەبارەت بە کۆلۆنیالیزمی بەریتانیا لە هیند و فەرەنسا لە هیند و چین باس بکەین. بەڵام بابەتێك کە ئەم نمونەیە ئاماژەی پێ دەکا ئەمەیە کە هەندێك لە دەوڵەتانی ((گەشەکردووی دەرەکی)) (کە تایبەتمەندیی بەرچاوی ئەوان دەرەکی بوونی سەرچاوەی پێکهێنانی ئەوانە) دەتوانن کە رۆڵی گەشەخوازی لە بەراورد لەگەڵ دەوڵەتی پاش کۆلۆنیالیزم پاکستان بگێڕن.

دیارە جیاوازی نێوان ئەم دەوڵەتانە دەبێ لە روانگەی سیاسی و بە لە بەرچاو گرتنی ئەنگێزەکان و بەرژەوەندی دەسەڵاتی ئیمپراتۆری تاوتوێ بکرێ. بۆ وێنە دەتوانین ئاماژە بە سیاسەتە جیاوازەکانی ژاپۆن و کۆریا و تایلەند لە بەراورد لەگەڵ سیاسەتەکانی کۆلۆنیالیزمی بەریتانیا لە باشووری ئاسیا بکەین.

## دەوڵەت و گەشەسەندن لە ئەفریقا: گەڕان بە دوای تیۆرییەکدا

لە حاڵی حازردا، کۆدەنگییەکی جیهانی لە پێوەندی لەگەڵ گەشەنەکردوویی ئەفریقا لە ئارادایە کە بابەتگەلێکی وەك هەژاری، نایەکسانی، کەموکوڕی و وێرانبوونی ژێرخانەکان، بێکاری بەربڵاو، گەندەڵی و ناسەقامگیری سیاسی بەربڵاو لە خۆ دەگرێ. (World bank, 1989)

ئەگەرچی لە کۆتایی دەیەی ٩٠دا هێماگەلێك لە باشبوونی هەڵدانی GNP دەبینرێ، بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە لە زۆربەی وڵاتانی ئەفریقایی رەوشی پێشوو هەروا زاڵە.

رابردووی مافی مرۆڤ جێگای نیگەرانییە و دیاردەی سەربازی و حکوومەتی دەسەڵاتداری تاك حیزبی هەروا فەرمانڕەوایە. تەنانەت رەوتەکانی ئەم دواییانەی دیموکراتیزاسیۆن کە لە لایەن هەندێك لەم وڵاتانە گیرابوونە پێش رواڵەتی و بێ بنەمان، کە دەتوانین پێی بڵێین ((دیموکراسی درۆزنانە))[1]. (Diamond, 1999)

لە حاڵی حازردا هیچ ناوچەیەك وەك ئەفریقا ناتوانین ببینینەوە کە پرسیارگەلی ئەوتۆ سەبارەت بەوان راست بێ، بۆچی لە ئەفریقا سیاسەت زاڵمانەیە؟ بۆچی پێکهێنانی دەوڵەت لە ئەفریقا ((نارێك و پێك))[2]ە؟ بۆچی کارکردی گەشەخوازیی دەوڵەتەکان زۆر لاوازە؟

(1) Peseudo-Democracy.
(2) Disordered.



دۆزینەوەی وەڵامێك بۆ ئەم پرسیارانە و دەستراگەیشتن بە بیرۆکەی لۆژیکانە سەبارەت بە پێوەندیی نێوان سیاسەت، کۆمەڵگا، دەوڵەت و کارکردی گەشەخوازانەی ئەو زۆر دژوارە. (Lonsdale, 1981, Ergas, 1981) ئێرنێست گێلنەر[1] کە یەکێك لە لێکۆڵەرانی پرسی ئەفریقایە، پێی وایە کە ((زۆر تیۆریی دەتوانێ لە پێوەندی لەگەڵ ئەفریقا ببتە بەرباس، بەڵام لە ئەفریقا هیچ بەڵگەیەك بۆ سەلماندنی ئەم تیۆرییانە نەدیتراوەتەوە)). (Lonsdale, 1981, p.140)

ئێستا بە سەرنجدان بە جۆراوجۆریی بیرۆکەکان لە پێوەندی لەگەڵ ئەفریقا، چۆن دەبێ ئەم ((هاوسەنگییە وێکنەچووە)) لە پێوەندیی دەوڵەت-کۆمەڵگا لە ئەفریقا دیاری بکەین. زۆربوونی ئەم دەستەواژانەی کە لە پێناسەی رەوشی دەوڵەتانی ئەفریقایی بەکاردەبرێن نیشاندەری جۆراوجۆری رێگاچارەکان و هەمە چەشنی ئەم روانگانەیە. (Chazon, 1992, p.40)

ئەم دەستەواژانە بریتین لە: دەوڵەتانی ناڕاست[2]، ((دەوڵەتانی گەشەنەکردوو))[3]، دەوڵەتی پریبندال[4]، دەوڵەتی شکست خواردوو[5]، دەوڵەتی بە میرات بەجێماو[6] و ((دەوڵەتی بە میرات بەجێماوی نوێ)).

لە ئاکامدا دەبێ بڵێین کە ئاماژەکردن بە یەك یان چەند بیرۆکەی تایبەت بۆ تەواوی دەوڵەتە ئەفریقاییەکانی خوارووی بیابان[7] نالۆژیکی و هەڵەیە، چونکە جیاوازی زۆر لە نێوان دەوڵەتانی ئەم ناوچەیەدا هەیە. (وەك بوتسوانیا، نایجریا، ئۆگاندا).

بەبێ دەمارگرژی بەرامبەر بە بابەتەکانی پێشوو، دەبێ بڵێین دۆزینەوەی هۆکاری ئەوەی کە ((بۆچی پێشکەشکردنی پێناسەیەکی باوەڕپێکراو سەبارەت بە رەوشی دەوڵەت لە ئەفریقا زۆر دژوارە))، زۆریش دژوار نییە. چونکە ژمارەیەك لە پێشمەرجەکانی پێویست بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی مۆدێرن، بە جۆرێك لە زۆربەی کۆمەڵگاکانی ئەفریقایی خوارووی بیاباندا هەیە. کەوابوو روونە کە لە ئەفریقاش دەوڵەت هەیە و جێگای لێکدانەوەیە.

(1).Ernest Gellner.
(2)Fictitious State
(3) Under Developed State.
(4) Prebendal State.
(5) Collapsed State.
(6) Patrimonial State.
(7) Sub-Saharan.





**((ڕەوشی ئەفریقا))**

زۆربەی دەوڵەتە ئەفریقاییەکان لەڕووی مێژووییەوە نوێ و لەڕووی پێکهاتەییەوە ناسەقامگیرن. دەوڵەتانی کۆلۆنیالیزمی سەدەی ١٩، لەسەر بنەمای دەسەلاّت یان پێکهاتەی بەهێزی دەوڵەتی پێشوو دامەزراون. سنووری دەوڵەتە ئەفریقاییەکان لەگەڵ ڕەوشی کۆمەلاّیەتی، فەرهەنگی، ئابووری یان سیاسی و هەروەها قەومی-زمانی و مەزهەبی یەك ناگرێتەوە. ئەم جۆرە سنوورانە بوونەتە هۆی پێکهاتنی زۆر کۆمەڵگا کە لەواندا جیاوازیی بەرچاوی قەومی و فەرهەنگی دەبینرێ. لەگەڵ ئەمەشدا پێکهاتەی بنەڕەتی فەرمی و فەرهەنگی بوروکراتیك لە دەوڵەتانی ئەفریقایی لە لایەن دەوڵەتانی کۆلۆنیالیزم سەپێندراوە.

هەروەها یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندیی زۆربەی ولاّتانی سەربەخۆی ئەفریقایی، ئۆگریی ڕواڵەتی ئەوانە بە یاسای بنەڕەتی. بە جۆرێك کە تەنانەت کاتێك کە شێوازە دیموکراتیکەکان جێگای خۆی دەدا بە حکوومەتی تاك حیزبی یان سەربازی، جارێکی دیکە دروشمەکانی دەسەلاّتی یاسا و هەڵسوکەوت بە پێی یاسای بنەڕەتی لەواندا دەبینرێ. تایبەتمەندییەکی دیکە دەوڵەتانی ئەفریقایی بەتایبەت لە سەردەمی سەربەخۆیی بە دواوە، نزم بوونی ڕێژەی سەرمایەی نێوخۆییە. (Berman, 1984)

بە کورتی، کۆمەڵگای ئەفریقایی لە سەردەمی سەربەخۆیی بە تایبەتدیگەلێك وەك سنووری دەستکرد، سیاسەتی زۆر لاوازی دەوڵەتی، پێکهاتەی سنووردار، کۆمەڵگای لاوازی مەدەنی، نوخبەی لاوازی سیاسی و بەڕێوەبەری و بوروکراسییەك کە وەرگیراوە لە پێوانەکان و شێوازە دەرەکییەکان کە بە خێرایی بە هۆی گەندەڵی و خزم خزمێنە[1] خەوشدار بووە، پێناسە دەکرێ.

بە سەرنجدان بەوەی کە چینە جیاوازەکان لەم کۆمەڵگایە روون و ئاشکرا نین یان لەگەڵ بەربەست بەرەو روون، چۆن دەتوانین بڵێین کە نوخبە سیاسییەکان و بروکراتیکی نوێ لایەنگری بەرژەوەندی کام یەك لە چینەکانن؟ ئایا لە نێوانیاندا پۆلین بەندی هەیە؟

ئەگەر بەم جۆرەیە، کۆڵەکەکانی دەسەلاّتی ئەوانە چییە؟ ئایا بە سەرنجدان بە نەبوونی شێوازێکی بوروکراتیکی سەقامگیری نێوخۆیی، دەتوانین بڵێین کە ئەوان خاوەنی توانایی و ئامانجی سەربەخۆیی گەشەخوازین؟

(1) Clientelism.



نەبوونی چینێکی دیاریکراو لە ئەفریقا بووەتە هۆی ئەوەی کە گۆران هایدێن[1] دەوڵەتانی ئەفریقایی وەك دەوڵەتانێك پێناسە بکاك کە خاوەنی ریشەی پێکهاتەیی لە کۆمەڵگادا نین. (Hydanm 1985) بە گشتی دوو ڕێگاچارە بۆ وەلاّمدانەوە بە پرسیارەکانی پێوەندیدار بە ڕەوشی دەوڵەت لە ئەفریقادا هەیە. ڕێگای یەکەم ئاماژە بە دەوڵەتی بورژوازیی بوروکراتیك دەکا، کە لە هەوڵی لێکدانەوەی دەسەلاّتی دەوڵەت و چین لە چوارچێوەی بەربلاّوتری بیرۆکەی مارکس دایە.

ڕێگای دووەم تایبەتە بە ((دەوڵەتی گەشە نەکردوو))[2] کە لە روانگەی ڤیبەرەوە دەخرێتە بەرباس و لێکۆڵینەوە.

## مارکس و شکستی دەوڵەت[3] لە ئەفریقا

لە روانگەی مارکسیستی تێگەیشتنی دروست لە دەسەلاّتی دەوڵەت، پێویستی بە ناسینی جۆرەکانی دەسەلاّتی چینایەتی لە هەر کۆمەڵگایەکی تایبەتیدا، دەکا. چونکە ئەم دووە بە هیچ جۆرێك لە یەکتر جیا ناکرێنەوە. بە سەرنجدان بە بوونی چینی ناسەقامگیر و نادیار بوونی پێوەندیی گرینگی چینایەتی لە زۆربەی بەشەکانی خوارووی ئەفریقا بەتایبەتی نەبوونی پێوەندیی لە نێوان چینی بورژوازی و چینی کرێکار، گرینگترین کێشە لە داڕشتنی تیۆریی دەوڵەت لە ئەفریقا، لە روانگە مارکسیستی، چۆنیەتی داڕشتنی چەمکی چین یان چینەکانی دەسەلاّتدار و کۆڵەکانی چینایەتی دەوڵەتە. ئەم پرسە داوێنگیری تیۆرییەکانی دیکەی چینایەتی غەیرە مارکسیستیش بووەتەوە. ڕەنگە بتوانین، لێکدانەوەی ریچارد سکلار لە دەسەلاّتی چینایەتی لە ئەفریقا وەك گرینگترین ڕێگا چارەی ئەم پرسە چاو لێبکەین. ناوبراو پێی وایە کە پێوەندیی چینایەتی لە ئەفریقا لەسەر بنەمای پێوەندی دەسەلاّتە نەك بەرهەمهێنان. (Sklar, 1979)

گرینگترین سەرچاوەی ئەم دەسەلاّتە، دەوڵەت بووە و کۆنترۆڵی دەوڵەت، ئامرازێکە کە بە هۆی ئەوەوە نوخبە بوروکراتیك و سیاسییەکان، توانیویانە دەسەلاّت و سەروەت بسەلمێنن و بەم جۆرە خۆیان وەك چینی دەسەلاّتدار سەقامگیر کردووە.

(1) Goran Hyden.
(2) Under Developed State.
(3) State Failure.





به گشتی دەبێ بڵێین کە ((چینی دەسەڵاتدار لە ئەفریقای پاش کۆلۆینالیزم، لە ڕێگای کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوە دەوڵەتییەکان پێکهاتوون)). (Boonem 1994: 134)

ئەم لایەنە کە خاڵی سەرەکی پێداگرتنە لەسەر کۆنترۆڵی سەرچاوە دەوڵەتییەکان بە جێگای گرتنە دەستی سەرچاوەکانی بەرهەمهێنەر و ئابووری وەك تایبەتمەندیی چینی دەسەڵاتدار، بە باشی لە لێکۆڵینەوەکانی عیسا شیوجی[1] لە پێوەندی لەگەڵ ڕەوشی تانزانیا لە دەیەی ٧٠، دەبینرێ. ناوبراو دەیویست هەتا لە ڕێگای ڕوانگەی مارکسیستییەوە چینەکانی دەوڵەت و بوروکراسی شیبکاتەوە. بەڵام نەبوونی چینی بورژوازیی ڕاستەقینە و لاوازیی چینی بورژوازی بچووك کە بەرهەمی دوای کۆلۆنیالیزم بوو، بووە هۆی ئەوەی کە ناوبراو بەم ئاکامە بگا کە لەم کۆمەڵگایانەدا چینەکان ڕۆڵی تایبەتییان لە گەشەسەندندا نییە، بەڵکو ڕۆڵی سەرەکی، دەوڵەت دەیگرێتە ئەستۆ. شیوجی پێی وابوو کە کۆنترۆڵی دەوڵەت لەم وڵاتانە لەلایەن چینێکی لاوازی بورژوازی، بەم مانایەیە کە دەوڵەت لەم کۆمەڵگایانە وەك ئامرازێك لە دەستی ئەو چینانەن کە دەیانەوێ ببنە ((چینی دەسەڵاتدار)). (Shivji, 1976: 33)

لەم وڵاتانە، نوخبە سیاسی و بوروکراتیکەکانی نێو دەوڵەت (نوخبە دەسەڵاتدارەکان))، زۆربەی لایەنەکانی تیجاری و بازرگانی و زەوییە بەربڵاوەکانی کشتوکاڵیان لەبەردەست دایە و لە ڕێگای کۆنترۆڵی دەوڵەت، خۆیان وەك چینی دەسەڵاتداری کۆمەڵگا، سەقامگیر کردووە.

ماکس ڤیبەر لە ئەفریقا: ((دەوڵەتی گەشەنەکردوو))، ((پارتریمونیالیزم))، پاتریمونیالیزمی نوێ و پریندالیزم.

ڕەوشی گشتی سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگاکانی ئەفریقایی دوای کۆلۆنالیزم کە لە بەشی پێشوودا ئاماژەم پێکرد، زۆرێك لە تایبەتمەندییەکان و بارودۆخی پێویست بۆ دەستەبەرکردنی دەوڵەتی مۆدێرن لە ڕوانگەی ڤیبەرەوە وەك یەکخستنی سەر زەوی، سیستەمی دەسەڵاتی یاسایی-عەقڵانی، کارمەندەکانی پابەند بە یاسا و ڕێوشوێنەکان و پاوانکردنی کەڵك وەرگرتن لە زۆر، ناخاتەڕوو.

((جێگیرکردنی دەسەڵات یەکێك لە مەرجەکانی پێویست نەك تەواو بۆ دەوڵەتی مۆدێرنە کە تایبەتمەندیی سەرەکی ئەو جیایی دامەزراوە دەوڵەتییەکانە لە کۆمەڵگادا. لەوەی کە دەوڵەتە ئەفریقاییەکان پاش کۆلۆنیالیزم، نەیانتوانی دابەشکردنێکی ئەوتۆ لە کۆمەڵگای ژێر

(1) Issa Shivji.



دەسەڵاتی خۆیان پێکبێنن، ناتوانن هەڵوێستی بێ لایەنانەی سیاسی لە کۆمەڵگا کە ڕەواییان پێ دەبەخشێ، بگرنەبەر. (Chubal and Daloz, 199)

بەڵام زۆربەی تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی ئەم دەوڵەتانە بە تایبەتی نێوەڕۆکی بوروکراسی و پێوەندی ئەوان لەگەڵ نوخبە سیاسییەکان، تارادەیەکی زۆر لەگەڵ ئەوەی ڤیبەر سەبارەت بە دەسەڵاتی نەریتی و دەوڵەت بەتایبەتی شێوازی پاتریمونیالی دەوڵەت باسی کردووە، وێکچوون.

لە حاڵێکدا هەندێك لە لێکۆڵەران وەك شیوجی، موورای[1] و هتد... لە شیکردنەوەی پێکهێنانی دەوڵەت لە ئەفریقا کەڵك لە ڕوانگە چینایەتییەکان وەردەگرن، هەندێکی دیکەش وەك زولبێرگ[2] هەوڵ دەدا ئەم بابەتە لە ڕوانگەی ڤیبەرەوە تاوتوێ بکا.

لە ڕوانگەی ئەم تیۆریسییەنانەوە زۆربەی دەوڵەتە ئەفریقاییەکان، لە ڕوانگەی چینایەتییەوە لێکۆڵینەوەیان لەسەر ناکرێ. لە لایەکی دیکەوە ئەم دەوڵەتانە لەگەڵ بیرۆکەی دەوڵەتی مۆدێرنی ڤیبەر یەك ناگرێتەوە، بەڵام پێیان وایە کە ئەم دەوڵەتانە دەتوانن لە ڕێگای چەمکەکانی بیرۆکەی ((دەسەڵاتی پاتریمونیال))ی ڤیبەر، تاوتوێ بکرێن. بەم پێیە، دەزگای دەوڵەتی و بوروکراسی بەستراوە بەو، وەك دامەزراوەیەکی تایبەتی و بەستراوە بە دەسەڵاتدار سەیر دەکرێ. (Weber, 1964, p.347)

ئەگەر دەوڵەتی پاتریمونیال وەك لایەنێك دابنێین، لوتکەی پایریمونیال بە پێی ڕوانگەی ڤیبەر ((سوڵتانیزم))ە. دیارە دەوڵەتگەلێکی ئەوتۆ بەهۆی حکوومەتی تاکەکەس، ڕەنگە نەتوانین پێی بڵێین دەوڵەت، بەڵکو تەنیا دەتوانین ئەوانە بە ((دەوڵەتی تایبەتی)) کەسانێك بزانین کە خاوەنی دەسەڵاتی پێویستن بۆ حکوومەت کردن. (Roth, 1968, p.88-111).

لە لایەکی دیکەوە، دەوڵەتانی نیوپاتریمونیاڵ هەن، کە لەواندا سەرەڕای بوونی ڕواڵەتی یاسای بنەڕەتی و شێوازەکانی یاسایی-عەقڵانی، لە کردەوەدا هەمان سیاسەتەکانی پاتریمونیال لە پشتی پەردەوە بەڕێوە دەچن. (Medard, 1982: 181)

هەروەك براتۆن[3] دەڵێ، تایبەتمەندییە سەرەتاییەکانی پێکهاتەی حکوومەتەکانی نیوپاتریمونیالی لە ئەفریقا بریتین لە: جێگیربوونی دەسەڵاتی سیاسی لە تاکەکەسێکدا[4]، کەڵك وەرگرتنی بە بەرنامە لە ئۆگریی تاکەکەس بە مەبەستی هاندانی لاینگرانی لە ڕێگای

(1) Murray.
(2) Zolberg.
(3) Bratton.
(4) Presidentialism.





بەخشینی پۆست و دەستەبەندیی و کەڵك وەرگرتنی سیستماتیك لە سەرچاوە دەوڵەتی و گشتییەکان لە ڕێگای ئامانجی تاکەکەس. (Bratton, 1997, p.61-8)

کەوابوو، بە پێچەوانەی ئەو گریمانانەی لە ڕێگاچارەی مارکسیستیدا هەیە، دەسەڵاتی سیاسی لە ئەفریقا، بە هۆی سەروەتەوە نییە، بەڵکو سەروەت بە هۆی کۆنترۆڵی دەسەڵاتی سیاسی و لە ئاکامدا کۆنترۆڵی دەوڵەتە. هەر بۆیە کەسانێك کە کۆنترۆڵی دەوڵەتیان بە دەستەوەیە، هەوڵ دەدەن هەتا بیپارێزن.

هەروەك ((مێرارد))[1] دەڵێ، ((سەرچاوەی سیاسی دەبێتە هۆی دەستڕاگەیشتن بە سەرچاوەی ئابووری)). دەوڵەت وەك کێکێك وایە، کە هەر کەس چاوچنۆکانە بە دوای پارچەیەکی دان. ڕەوایی دەسەڵاتداران لەم دەوڵەتانە، زۆر لە خوارەوەیە. کەوابوو ئەوان بۆ پاراستنی کۆنترۆڵی دەوڵەت، ناچارن پشت بە سوپا و لایەنگرانی خۆیان ببەستن. بە گشتی دەبێ بڵێین کە ناوەندی سەرەکی سیاسەتی پاتریمونیال و نیو پاتریمونیال، ((تایبەتی کردنی بابەتە گشتییەکانە)). (Medard, 1982: 185)

لەم جۆرە دەوڵەتانە، دەستڕاگەیشتن بە پیشە، دەرەتانەکان، داهات و هتد... تارادەیەکی زۆر بەوە بەستراوەتەوە کە چ کەسێك پشتیوانیت لێ دەکا و ئەوەی ئەو چ بەشێك لە دەسەڵاتی بەدەستەوەیە و هەتا چ ئاستێك لە بڕیاردانی دامەزراوەکان کاریگەرە.

دەوڵەتی نایجریا یەکێك لە نموونە بەرچاوەکانی ئەم پێناسەیە، کە ژۆزێف[2] پێی دەڵێ (Prebendalized). (Joseph, 1983).

پێناسەی ژۆزێف لە دەوڵەت (Prebendalized) لە بیرۆکەی (Praebend) وەرگیراوە کە ڤیبەر لە پێوەندی لەگەڵ چەمکی پاتریمونیالیزم کەڵکی لێوەردەگرت.

لە ڕوانگەی ڤیبەر ((پرینبدالیزم)) کاتێك ڕوو دەدا کە بە دەستەوە گرتنی بەڕێوەبەریی ئیدارەیەك، دەبێتە هۆی دەستڕاگەیشتنی بەڕێوەبەر بە هەندێك بەرتیل و ئیمتیاز. (Weber, 1965, 207)

دەتوانین ئەم ڕاستییە لە نایجریادا ببینین، چونکە پڕکردنەوەی پۆستە دەوڵەتییەکان دەبێتە هۆی دەستڕاگەیشتنی بەڕێوەبەران بە بەرتیل و ئیمتیازاتێك کە پاساو نادرێ. هەروەك ژۆزێف سەبارەت بە نایجریا دەڵێ، ئیداراتی دەوڵەتی لە پێناوی بەرژەوەندی تایبەتی بەڕیوەبەران و

(1) Merdard.
(2) Joseph.



لایەنگرانیان چالاکن و ئەرکی سەرەکییان لە ئەولەوییەتی دوایی دادەنێن و بەو جۆرەی کە لە فەسڵی یەکەم ئاماژەم پێکرد، ڕەوتی سیاسەت، دژبەرییەکان، دانوستان و ڕێککەوتن لە پێوەندی لەگەڵ کەڵك وەرگرتن و دابەشکردنی سەرچاوەکانی لەخۆ دەگرێ.

سەرەڕای ئەو دەستەواژانەی لە پێوەندی لەگەڵ پێناسەی دەوڵەتانی ڕوو لە گەشە ئاماژە پێکراوە دەتوانین ئاماژە بە دەستەواژەی دیکەش بکەین کە بریتین لە ((دەوڵەتی لاواز))[1]، ((دەوڵەتی تالانچی))[2] و ئەو دەوڵەتانەی کە توانای پێویستیان بۆ ((حکوومەتی دڵخواز))[3] نییە. هەر یەك لەم سەر دێڕانە، بۆ پێناسەی ناکامی یان لەسەرخۆیی ڕەوتی گەشەسەندن لە وڵاتان، بەکاربراون.

ئەم چەمکانە، نەتەنیا وەبیرهێنەرەوەی گرینگی ڕۆڵی سیاسەت لە خوێندنەوەکانی تایبەت بە گەشەسەندنە، بەڵکو نیشاندەری ئەم بابەتەیە کە لە حاڵێکدا گەشەسەندنی ئابووری و کۆمەڵایەتی دەتوانێ بوار بۆ چارەسەری کێشە سیاسییەکان بڕەخسێنێ، سیاسەتیش دەتوانێ هۆکارێکی سەرەکی بێ لە چارەسەری پرسەکانی پێوەندیدار بە گەشەسەندن.

**((دەوڵەتگەلی لاواز و تالانچی))**

لە کۆی ئەو خوێندنەوانەی لە دەیەی ٨٠دا دەستی پێکراوە، هەندێك لە زانایانی سیاسی هەوڵیانداوە کە بە ڕوانینێکی وردتر تایبەتمەندی و توانایی دەوڵەتەکان لە جیهانی سێهەم تاوتوێ بکەن.

باسی سەرەکی لێکۆڵینەوەی ئەنجام دراو ئەمەیە کە، ناتوانین دەوڵەت لە جیهانی سێهەمدا وەك دیاردەیەکی باوەڕپێکراو سەیر بکەین یان ئەوان وەك کۆمەڵێك دامەزراوە لەگەڵ دەوڵەتانی ڕۆژئاوایی بەراوردیان بکەین. بە پێچەوانەوە تایبەتمەندی و توانایی دەوڵەتەکان لە جیهانی سێهەم بە خێرایی لە گۆڕان دایە و ئەم دیاردەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئاسەواری قۆناغی کۆلۆنیالیزم، پێوەندیی مێژوویی و لە حاڵی گۆڕانی ئەواندا لەگەڵ کۆمەڵگای ژێر دەسەڵات بە تایبەتی ((ئەو هێزە کۆمەڵایەتییانەی لە نێوخۆی کۆمەڵگادا ڕێکخراون)). (Migdal, Kohli and shut 1994).

(1) Weak State.
(2) Predatory State.
(3)Good Governance.





شایانی باسە کە دەوڵەتانی جیهانی سێهەم (لە ڕاستیدا تەواوی دەوڵەتەکان) بە شێوەی سیاسی پێکهاتوون و بە شێوازی سیاسی ماونەتەوە و بە هەمان شێوازیش گۆڕدراون و لەبەر ئەمەش پێم وایە کە گەشەسەندنی ئەوانیش سیاسییە. هەرچەند کە ئەم بابەتە لە بیرۆکەی تیۆریسییەنەکانی پێشووش هەبوون، بەڵام تیۆرییە نوێیەکان لە هەوڵی ئەوەدان هەتا بە پێشکەشکردنی بنەمای زانستی و چەمکی گونجاو پێناسەی بکەن.

بەڵام خاڵی جێگای سەرنج ئەوەیە کە ئەو بەڵگانەی لە خوێندنەوەکانی ئەم دواییانە بە دەست هاتوون- لە بەڕازیل هەتا هیند و لە میسر هەتا چین- نێوەڕۆکی باسی سەرەکی ئەم کتێبەیە: ((تێگەیشتنی قووڵ لە گەشەسەندن یان نەبوونی، پێویستی بە تێگەیشتنی دەوڵەتە و ناسینی دەوڵەتیش، بۆ خۆی پێویستی بە ناسینی دروست لە هێزە کۆمەڵایەتییەکان —کە هەمان سیاسەتە— هەیە)).

## دەوڵەتی لاواز

میگدال[١] هەم لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە بە تەنیایی بەڕێوەی بردبوو و هەم لە بەدواداچوونێکدا کە بە هاوکاریی کوهلی وشۆ[٢] لە پێوەندیی لەگەڵ دەوڵەتانی بەهێز و لاواز بەڕێوەیان بردووە، بە وردبینییەکی تایبەتییەوە پێوەندیی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگایان تاوتوێ کردووە و پێی وایە کە ((دووره دیمەنی دەوڵەت لە کۆمەڵگادا))[٣] ئامرازێکە بۆ تێگەیشتنی تواناییەکانی دەوڵەت. (Migdal, 1994).

دەوڵەتانی لاواز ئەو دەوڵەتانەن کە توانایی کەمیان بۆ کاریگەریی بەسەر کۆمەڵگا، بە یاسایی کردنی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەکان بە شێوەی ڕوون و دیاریکراو، هەیە. (Migdal, 1988, p.4) پێچەوانەی تایبەتمەندییەکانی سەرەوە دەتوانین بۆ دەوڵەتانی بەهێز لەبەرچاو بگرین.

دیارە بنەمای جیاوازیی دەوڵەتی لاواز لە دەوڵەتی بەهێز، بەستراوەتەوە بە ڕێژەی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی لە لایەن دەوڵەت لە کۆمەڵگادا. هەوڵدان بۆ کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی لەم کۆمەڵگایانەدا، لە ڕاستیدا ململانێی نێوان دەوڵەت وەك یاریزانی سەرەکی و ڕێکخراوەکانی دیکە و یاریزانە کۆمەڵایەتییەکانە کە لە بەرامبەر کۆنترۆڵی دەوڵەت بەرگریی دەکەن.

(1) Migdal.
(2) Kohli and Shue.
(3) State-in- Society Perspective.



ململانێیەکی ئەوتۆ لە ڕاستیدا، خەباتێکی سیاسییە کە بەردەوام وەك هۆکاری بنەڕەتی لە بەهێزکردن و لاوازکردنی دەوڵەت، ڕۆڵی هەبووە.

میگداڵ پێی وایە کە زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێهەم لە بەرامبەر کۆمەڵگای بەهێز یان هێزە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم کۆمەڵگایانە کە لە بەرامبەر کۆنترۆڵی کۆمەلایەتی دەوڵەت بەرگری دەکەن، لاوازن. ئەم دەوڵەتانە نەیانتوانیوە ((دەسەڵات))ی خۆیان بەسەر ژمارەیەکی زۆر لە ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان بسەپێنن.

ئەم ڕێکخراوانە بریتین لە لایەنێکی بەربڵاو لە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان وەك خاوەن زەوییەکان[١]، وەرزێری دەوڵەمەند[٢]، گرووپە تیجارییەکان[٣]، یەکیەتییەکانی کرێکاری و بزووتنەوەکانی مەزهەبی و کۆمەڵایەتی کە ئەم دەرەتانە بە پێکهاتەی فیدراڵی دەوڵەت، نوخبە خۆجێی و ناوچەییەکان دەدا هەتا بە بەشداری لە کاروباری سیاسی لە بەرامبەر کۆنترۆڵی ناوەندیی و هەمە لایەنەی دەوڵەت، بەرگری بکا. (Migdal Kohli, Shue, 1994).

خاڵی سەرەکی لە پێوەندی لەگەڵ ئەم ڕێکخراوانە و تاکەکان، ئەمەیە کە دەسەڵاتی سیاسی و خۆجێیی ئەوان دەبێتە لەمپەرێك لەبەردەم بەکارهێنانی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی دەوڵەتی ناوەندی و ئەم بابەتە تایبەتمەندییەکی دیار و بەرچاوی دەوڵەتی لاوازە.

## دەوڵەتەکانی تاڵانچی

((ئەگەرچی چەمکی)) دەوڵەتەکانی تاڵانچی بە باشی تیۆریزە نەکراوە، بەڵام تایبەتمەندییەکانی ئەم دیاردەیە زۆر لەمێژە، دەستنیشان کراوە. پاراتو بەم جۆرە ئەم چەمکە پێناسە دەکا ((کەڵك وەرگرتنی تایبەتی لە دارایی کەسانی دیکە بە شێوەی یاسایی یان نایاسایی. ناوبراو پێی وایە کە ئەم پرسە، بەردەوام لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا هەبووە. (Parato, 1996: 114-111).

ئەم ڕەوتە ڕەنگە بە شێوەی زۆرملێی یان بە کەڵك وەرگرتن لە ((شێوازەکانی فریودەرانە))[٤] کە بەو پێیە، کەمایەتیەك لە تاکەکان، زۆرینە دەچەوسێنێتەوە، ڕوو بدا. (Ibid, p.115).

(1) Land Lords.
(2) Rich-Peasants.
(3) Business Groups.
(4) Underhand-Methods.





لەم ڕەوتەدا، کەمایەتی بە کەڵك وەرگرتن لە دەوڵەت وەك داینەمۆیەك بۆ دەستدرێژییەکانی، زۆرینە دەکاتە قوربانیی مەبەستەکانی خۆی. ئەم جۆرە هەڵسوکەوتە تاڵانچییانە، بە ناچار کۆمەڵگا بەرەو فەوتان و لەنێو چوون پاڵ پێوەدەنێ و ئاسەواری وێرانکەر لەسەر ئابووری دادەنێ.

پارەتو ئەم جۆرە هەڵسوکەوتانە، وەك کردەوەی سیاسی چاو لێدەکا، کە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە و بە هۆی هاوکاریی هەموو هێزە چالاکەکان لە کۆمەڵگا پێکهاتووە. (Ibid, p.116-117).

مارگارێت لیڤی[1] یەکێك لەو کەسانە بوو کە هەوڵێکی زۆریدا بۆ تیۆریزەکردنی چەمکی ((دەوڵەتی تاڵانچی)). هەرچەند کە بەڵگە مێژووییەکانی ناوبراو لە جیهانی سێهەم وەرنەگیراون، بەڵام بە گشتی تیۆریی ناوبراو یارمەتییەکی باشی بە تێگەیشتن و ناسینی ئامانجی سیاسی و تایبەتمەندییەکانی دەوڵەتی تاڵانچی کردووە.

بە پێی ئەم تیۆرییە، تەواوی دەوڵەتەکان بە پلەی جۆراوجۆر تاڵانچی دێنە ئەژمار. چونکە تەواوی دەسەڵاتداران هەتا ئەو جێگایە پێیان دەکرێ لە هەوڵی ئەوەدان، لە ڕێگای چەوساندنەوەی خەڵك، داراییەکانی خۆیان زیاد بکەن و لەو ڕێگایەوە سەروەت و دەسەڵاتی تایبەتی خۆیان ببەنە سەرەوە. (Levi, 198, p.3)

هۆکارێك کە بووەتە هۆی جیاوازیی ئاستی تاڵانچی بوونی دەوڵەتەکان، بەربەستە سیاسییەکانە کە لە لایەك ئاکامی کارکردی گرووپە سیاسی-کۆمەڵایەتییەکانە کە کۆنترۆڵی سەرچاوەکانیان بە دەستەوەیە و لە لایەکی دیکەوە بە هۆی شێوازی حکوومەت، سیستەمی هەڵبژاردن، دەسەڵاتی دەزگای بەڕێوەبەریی و یاسادانان و پێکهاتەی دەوڵەتە (فیدراڵ یان یونیتاری) و هتد... (Nozick, 1974, p.17) بە کورتی دەبێ بڵێین کە جیاوازیی ڕێژەی تاڵانچی بوونی دەوڵەتەکان، بەستراوەتەوە بە ڕێژەی کۆنترۆڵی دەسەڵاتداران لەسەر سەرچاوەی سیاسی، ئابووری و هێز.

بە واتایەکی دیکە حکوومەتی تاڵانچی لە شێواز و ڕێژەدا، ئاکامی ڕاستەوخۆی کارکردی سیاسەتە. پێویست بە وەبیرهێنانەوەیە، کە دەوڵەتە تاڵانچییەکان لە ڕاستیدا، جۆری سەرەڕۆییانەی دەوڵەتی پاتریمۆنیاڵە. فیلیپین، بەتایبەت لە سەردەمی حکوومەتی ٣٠ ساڵەی

(1) Margaret Levi.



مارکۆس، نموونەی دیار و بەرچاوە کە نیشانی دەدا، چۆن سیستەمێکی سیاسی پاتریمۆنیاڵ دەتوانێ لە سیستەمێکی تاڵانچی نزیك ببێتەوە.

دەوڵەتە تاڵانچییەکان، زۆر بە کەمی لەگەڵ چەمکەکانی ڤیبەر و مارکس یەك دەگرێتەوە. لە لایەك، ئەم دەوڵەتانە خاوەنی تایبەتمەندیی ((بوونی چینێکی دەسەڵاتداری کاپیتالیستی یان کرێکاری)) کە لە هەوڵی کەڵك وەرگرتن لە دەوڵەت بۆ پاراستن و بردنە سەری سەرچاوەی چینی خۆیان بن، نییە، لە لایەکی دیکەوە ناتوانین پێیان بڵێین حکوومەتی بوروکراتیك. ئەم دەوڵەتانە، زۆرجار دەرخەری ((حکوومەتی تایبەتی دەسەڵاتخواز))ە.

پاتریمۆنیالیزم بە باشترین شێوە، هەوڵدانی دەسەڵاتداران بۆ کۆنترۆڵی سەرچاوەکان، شی دەکاتەوە. ئەم دەسەڵاتدارانە بە دەگمەن، ئامانجی گەشەخوازیی ڕاستەقینە لە سیاسەتەکانی خۆیان لەبەرچاو دەگرن. چونکە بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدان هەتا لە ڕێگای کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی گشتی، سەروەتی خۆیان زیاد بکەن. لە بارودۆخی لەدەستداندا، سەقامگیری و ڕێکخستن و هەماهەنگی حکوومەتی بوروکراتیك بایەخێکی نییە، چونکە دەرەتانێك بۆ پێشبینی داهاتوو لە ئارادا نییە و ناسەقامگیریی سیاسی دەبێتە شێوازێك. (Huntington, 1963, p.398-9)





# دەرئەنجام

ئەم فەسڵە هەوڵ دەدا هەتا نیشانی بدا سەرەڕای کەمتەرخەمی گشتی ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان و دەوڵەتە سەرەکییەکانی دابینکەری قەرز بە گرینگی رۆڵی سیاسەت، دەسەڵات و دەوڵەت لە رەوتی گەشەسەندن لە قۆناغی دوای جەنگ، رەوتێکی فیکریی بچووك بەڵام بەردەوام و گرینگ کە بڕوای بە گرینگی لێکدانەوەی سیاسی سەبارەت بە گەشەسەندن بووە، هەبووە.

لە روانگەی جۆراوجۆری تیۆریی، سیاسی و ناوچەیی، ئەم لێکدانەوانە پێ لەسەر رۆڵی سەرەکی هێزە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان لە پێکهێنانی تایبەتمەندیی و توانایی گەشەخوازیی دەوڵەتی، دادەگرن.

روانگەکانی مارکس و ڤیبەر لەڕووی تێگەیشتنەوە یارمەتییەکی باشی بە شیکردنەوەی ئەم رەوتانە کردووە. بەڵام لە هەمان کاتدا، هەندێك لەم هەوڵانە، بە دژواری لەگەڵ چەمکە سەرەتاییەکانی تیۆرییەکانی مارکس و ڤیبەر یەك دەگرێتەوە. زۆربەی ئەم لێکدانەوانە، بە پێداگرتنی لە رادەبەدەر لەسەر هۆکارێکی تایبەت وەك هۆکاری مێژوویی، فەرهەنگی، هۆکاری کۆلۆنیالیزم و هتد... رۆڵی هۆکارەکانی دیکەی ئەم رەوتە لەبەرچاو نەگرتووە. سەرەڕای بوونی روانگەی جیاواز و خوێندنەوەی زۆر لەم پێوەندییەدا، دوای ئەوەی کە میردال بە ئاماژە بە ((دەوڵەتی نەرم)) بۆ یەکەمین جار کاریگەریی دەوڵەتی لە گەشەسەندن تاوتوێ کرد، لانیکەم ٢٥ ساڵ درێژەی کێشا هەتا دەوڵەت و سیاسەت وەك گۆڕدراوە گرینگەکان لە رەوتی گەشەسەندن، چووە ئەدەبیاتی گەشەسەندنەوە. لەگەڵ ئەمەشدا سەرەڕای بایەخدان بەم گۆڕدراوانە لە گەشەسەندن، بۆ ماوەیەکی زۆر ئەم رۆڵە کەم رەنگ مابووەوە، هەتا ئەوەی کە بانکی جیهانی لە ساڵی ١٩٨٩ لە تاوتوێ کردنی ریشەکانی گەشەنەکردوویی ئەفریقا، بە تایبەت ((دۆڕاویی حکوومەت))[1] وەك گرینگترین هۆکاری ئەم بابەتە باس کردووە.

(1) Failure of Governance.



بانکی جیهانی پێی وایە کە رێگاچارەی پرسی ئاڵۆزی گەشەسەندنی ئەفریقا تارادەیەکی زۆر، دەستەبەرکردنی نموونەی ((حکوومەتگەریی دڵخواز))[1]ە.

بەڵام پرسیارێك لە لێرەدا دێتە گۆڕێ ئەمەیە کە ((حکوومەت چییە و چ شتێك دڵخوازی دەکا؟ چ شتێك دەبێتە هۆی ئەوەی کە سەرەڕای کەمتەرخەمی درێژخایەن، ئەم چەمکە سەرلەنوێ وەك بگۆڕێکی گرینگ بێتە بەرباس؟ ئایا حکوومەت جیا لە سیاسەت دەبێ؟ ئەمانە پرسیارگەلێکن کە لە فەسڵی دواییدا تاوتوێیان دەکەم)).

(1) Good Governance.





# فەسڵی پێنجەم

## حکوومەت[1] و گەشەسەندن: لە پەراوێزخستنی سیاسەت

**پێشەکی:**

پێکهێنانی حکوومەتی دڵخواز کە یەکێك لە ئامانجە سەرەتاییەکانی سیاسەتەکانی گەشەسەندن و گەیاندنی یارمەتی رۆژئاوایە، بە درێژایی دەیەی ٩٠ی زایینی لە لایەن وڵاتانی رۆژئاوایی و دامەزراوە نێونەتەوەییەکان بایەخی پێدرا. (Moor and Robinson, 1994)

خاڵی وەرچەرخانی ئەم بابەتە دەتوانین لە بەیاننامەی بانکی جیهانی لە پێوەندی لەگەڵ ئەفریقادا ببینین: ((گرینگترین کۆسپی گەشەسەندنی ئەفریقا، قەیرانی بەڕێوەبردنی حکوومەتە، مەبەست لە بەڕێوەبردنی حکوومەت بریتییە لە بەکاربردنی دەسەڵاتی سیاسی لە پێناوی بەڕێوەبردنی کاروباری نەتەوەییەك (World bank 1986 p.60).

بە سەرنجدان بە پێناسەی پێشکەشکراوی سەرەوە لە بەڕێوەبردنی حکوومەت، روونە کە ئەم چەمکە لێرەدا بە شێوەیەکی بەرچاو لە چەمکی حکوومەت[2] بەربڵاوترە. دیار دەبێ ئاگاداربین کە ئەم روانگە باس هەڵگرەی بانکی جیهانی لەبەر چەند هۆکارێك بووە کە بە هەندێکیان لەوانە لاوازیی کۆمەڵگای مەدەنی، نەبوونی گرووپەکانی ئۆپۆزیسیۆنی سیاسی، بە میراتی کردنی حکوومەت لە رێگای پێکهێنانی تۆڕی لاینگران، سەرهەڵدانی دەوڵەتەکانی سەرەڕۆ و نەبوونی فەرهەنگی وەڵامدەر[3] لە فەسڵی پێشوودا ئاماژەم کردووە.

رەنگە لە یەکەم روانیندا روانگەی بانك، وەك رێگاچارەیەك بێتە بەرچاو کە لەودا پرسە سیاسییەکان لە روانگەکانی گەشەخوازی سەرنجی پێ دەدرێ. بەڵام بە سەرنجدان بە چەندین هۆکار کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد و بە تایبەت بە هۆی پێشگیری یاسایی بانکی جیهانی لە پێوەندی لەگەڵ دەستێوەردانی سیاسەت لە پرۆگرامەکانی ئەم بانگەشەیە لەبەرچاو ناگیرێ.

(1) Governance.
(2) Government.
(3) Accountability.



لەگەڵ ئەمەشدا لەڕووی مێژوویشەوە ئەم پرسە لە سەردەمی سەرهەڵدانی بانکی جیهانی لە ساڵی ١٩٤٤ لە کۆنفرانسی برێتۆن وودز[1] خرایە بەرباس و بڕیار درا کە بانك لە تاوتوێ کردنی داواکاریی قەرز لە لایەن وڵاتانی داواکارەوە، نابێ لە ژێر کاریگەری تێبینیی سیاسیدا بێ (Shihata, 1991, p.72).

هەرچەند کە روانگەی بانکی جیهانی لە پێوەندی لەگەڵ بەڕێوەبردنی حکوومەت و دەوڵەت بە درێژایی دەیەی ٩٠ی زایینی لە راگەیەندراوەکانیدا جێگای لێوردبوونەوەیە، بەڵام دەبێ ئاگاداربین کە بایەخدان بە بابەتی بەڕێوەبردنی حکوومەت هیچ کات لە نیگەرانی قووڵی بانك کە باشترکردنی شێوازی بەڕێوەبەری نەریتی کەرتی گشتی بوو، گۆڕانێکی بنەڕەتیی پێکنەهێنا. (World Bank, 1994).

بە کورتی دەبێ بڵێین ئەگەرچی ئەو روانگانەی کە لە حاڵی دروست بووندا بوون بڕوایان بە بابەتی بازاڕی ئازاد و بەڕێوەبەریی کراوە[2] لە پێوەندی لەگەڵ گەشەسەندندا هەبوو بەڵام ئەوەی کە بانك لە پێوەندی لەگەڵ حکوومەتی دڵخواز بایەخی پێدەدا پێکهێنانی بەڕێوەبەرییەکی دروستی گەشەسەندن و گرینگی رۆڵی بەڕێوەبەریی بووە. (World Bank, 1991)

هەرچەند هیچ کەس ناتوانێ حاشا لە گرینگی دوو فاکتۆری بەڕێوەبەریی کراوە و کێبەرکێیی وەك رەوشێکی پێویست و بنەڕەتی گەشەسەندن بکا، لەگەڵ ئەمەشدا لە روانگەکانی جێگای باس لەم فەسڵە کە لە بیرۆکەکانی کەسانێك وەك ئەلێکساندێر پۆپ[3] رەنگی داوەتەوە ((روانینی گەشەخوازانە بە چەمکی حکوومەتی دڵخواز لەگەڵ بەڕێوەبەریی کراوە)) وەك هەڵەیەکی تەکنیکی چاوی لێ دەکرێ چونکە لەم لایەنەوە، گەشەسەندن ئاکامی بەڕێوەبەرییەکی کاریگەر و دروستە و هۆکاری سیاسی، کاریگەرییەکی بەرچاوی لە پێوەندی لەگەڵ گەشەسەندندا نییە.

وەك پارادۆکس، لەم فەسڵەدا بۆ رەتی ئەم بیرۆکەیە باسێك پێشکەش دەکەم کە بە پێچەوانەی روانگەی سەرەوە، روانینی بەڕێوەبەری لە گەشەسەندن و بەهێزکردن و قایمکردنی هەڵەیەکی بنەڕەتییە و هەروەك چۆن لە فەسڵی سەرەتایی ئەم کتێبەدا ئاماژەی پێکراوە بە پێچەوانەی بیرۆکەی بانك، گەشەسەندن لە بنەڕەتدا رەوتێکی سیاسییە. لەم فەسڵەدا ریشەکان و بوارەکانی گرینگ بوونی دەوڵەت تاوتوێ دەکەم هەتا لەگەڵ ئاماژەکردن بە

(1) Bretton Woods.
(2) pen Administration.
(3) Alexander Pope.





هەندێك پێناسە لە پێوەندی لەگەڵ حکوومەت، ئەم ڕاستییە بسەلمێنم کە بەبێ ئیرادەیەکی سیاسی تایبەت لە پێناوی دەستڕاگەیشتن بە گەشەسەندنی بەردەوام و کاریگەر دەرەتانی دەستەبەرکردنی نابێ. بە واتایەکی دیکە ئەمە سیاسەتە کە دەتوانێ ڕۆڵی بنەڕەتی لە دەستەبەرکردنی گەشەسەندندا بگێڕێ.

### هێنانە بەرباسی پرسێك

بە درێژایی دەیەکانی ڕابردوو سێ هۆکاری گرینگ لە پێناسەی سیاسەتەکانی گەشەسەندن و گەیاندنی یارمەتیی ڕۆژئاوا ڕۆڵی هەبووە.

هۆکاری یەکەم بە هۆی پێکهێنانی سووڕانێکی بنەڕەتییە لە کۆی بیرۆکەکانی پێوەندیدار بە ڕۆڵی دەوڵەت لە ڕەوتی گەشەسەندن کە وەك شۆڕشی نیولیبراڵ[1] باسی لێوە دەکەن. ئەم سووڕانە کە (پاش جەنگی جیهانی دووەم) پێکهات، باوەڕی بە کەڵك وەرگرتن لە یارمەتییەکانی ڕۆژئاوا بە مەبەستی پێکهێنانی ئابووریی کراوە و کێبەرکێ و بازاڕی هاوبەشە. (World bank, 1991) ئەم بابەتە لە وتاری چالکر وەزیری پێشووی گەشەسەندنی دەوڵەتی بەریتانیا لە ساڵی ١٩٩١، دەبینرێ.

((بابەتی گرینگ بریتییە لە پێکهێنانی هێزەکانی بازاڕ و کێبەرکێ بە مەبەستی گەرەنتی زیاتر لە کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەکان. لەگەڵ ئەمەشدا، دەوڵەتەکان دەبێ بوار بۆ چالاك کردنی کەرتی تایبەتی برەخسێنن هەتا ئەوان بتوانن ڕۆڵی خۆیان وەك داینەمۆی پێشکەوتن بگێڕن)). (Chalker, 1991).

ئەم ڕوانگەیە بە درێژایی دەیەکانی ٨٠ و ٩٠ زایینی بە شێوەی ڕەوشی نوێی ئابووری لە سیاسەتی هاوسەنگ کردنی پێکهاتەیی و دابینکردنی قەرز دەرکەوت. سەرەڕای هۆکاری سەرەوە دوو هۆکاری دیکە لە دەیەی ٩٠ی زایینی بەم سیاسەتە زیادبوو و بە گشتی ئەوانەی کە وەك هۆکار و ڕەوشی سیاسی باس دەکران بریتین لە:

١- هەنگاونان بەرەو پێکهێنانی دیموکراسی و باشکردنی ڕەوشی مافی مرۆڤ.
٢- پێداگرتن لەسەر ئەوەی کە پێی دەڵێن حکوومەتی دڵخواز.

بە سەرنجدان بەم هۆکارانە، ڕوانگەی نوێ پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ، لە کۆمەڵگایەك کە لەودا تایبەتمەندییەکانی وەك بازاڕی ئازاد، بەڕێوەبەری کێبەرکێی و سیاسەتەکانی لیبراڵ

(1) Neo-Liberal Revolution.



دیموکراسی (دیموکراسی سەرمایەداری) پێکهاتوون، نەتەنیا بە گەشەسەندن گەیشتوون بەڵکو بووەتە گەرنتییەك بۆ ئاشتی نێوانیان. چونکە کۆمەڵگایەك بەم تایبەتمەندییانە لە پێوەندی لەگەڵ یەکتردا ناچار نییە پەنا بۆ شەڕ ببا. (Doyle 1983, Short, 1997).

چالکر دەڵێ:

((ئێمە لە تەواوی کەرەستەکانی فشار کە لەبەر دەستمان دایە لە پێناوی هاندان بۆ ڕێزلێنان لە مافی مرۆڤ، پێکهێنانی بازاڕی ئازاد، گرتنەپێشی سیاسەتی ژیرانەی ئابووری و بەڕێوەبەری گشتی کارلێهاتوو کەڵك وەردەگرین)). (Chalker, 1991).

لەم بەشەدا لە پێوەندی لەگەڵ چۆنیەتی کاریگەری ئازادی ئابووری لەسەر هەڵدانی ئابووری باسێك پێشکەش ناکرێ. لەگەڵ ئەمەشدا ناتوانین حاشا لەم ڕاستییە بکەین کە دەستڕاگەیشتن بە هەڵدانی ئابووری بە پێکهێنانی ڕەوشی بازاڕی ئازاد لە زۆربەی وڵاتان، لەگەڵ کەمکردنەوەی ئاستی ستانداردەکانی ژیان وەك بارهێنان، خۆشگوزەرانی و چوونە سەری بێ عەدالەتی بەرەوڕوو بووە.

لەم بەشەدا ئاماژە بەم بابەتە دەکەم کە بۆ هەڵدان و گەشەسەندن گرتنە پێشی سیاسەتی دیموکراتیك پێویستە و لە فەسڵەکانی دواییدا زیاتر شی دەکەمەوە. بەڵام مەبەست لە حکوومەتی دڵخواز چییە؟ چ کاریگەرییەکی لەسەر ڕەوتی گەشەسەندن هەیە؟.

هەرچەند حاشاکردن لە ڕۆڵی تایبەتمەندیی ((حکومەتی دڵخواز)) لە ڕەوتی سەرکەوتووی گەشەسەندن مەحاڵە، بەڵام پێموایە کە ڕوانگەی ئێستا سەبارەت بە حکوومەتی دڵخواز، لە ئاستێکی نزم دایە. ئەم بۆچوونە کە هەندێك پێیان وایە بەردەوام بەربەستێکی بەڕێوەبەری لە بابەتە ئاڵۆز و ئاساییەکانی کۆمەڵگا و ڕێکخراوەکانی مرۆییدا هەیە و پێوەندیی دەدەنەوە بە پرسی گەشەسەندن، بە تەواوی بێ کەڵکە. هەروەك یەکێك لە ڕاوێژکارانی پێشووی بانکی جیهانی دەڵێ:

((پرستیژ و توانایی بانك بە شێوەی نەریتی بەستراوەتەوە بە ڕەوشی تەکنۆکراسییەك کە پێوەندیی بە کارامەیی ئابوورییەوە هەیە)). ئەم بابەتە بە تایبەت لە ڕێگاچارەی بانکی جیهانی بەرامبەر بە حکوومەت جێگای سەرنجە کە لەو وەك تواناییەکی ئیداریی سەربەخۆ و خودموختار، جیا لە جیهانی شپرزەی هێزە کۆمەڵایەتییەکان، سیاسەتەکان و پێکهاتەی سیاسی و ئامانجی دەوڵەتێك، باس دەکرێ. لە هەندێك لە وڵاتانی گرینگی ئەورووپایی کە حکوومەتی دڵخواز وەك بەشێك لە ئامانجێکی بەربڵاوتر کە پێی دەڵێن حکوومەتی دیموکراتیك، لەبەرچاو دەگیرێ، چەندین بابەت پێکەوە گرێیان خواردووە.





١- باش تێگەیشتنی ئەم راستییە کە گرتنە پێشی سیاسەتە دیموکراتیکەکان، مەرجی پێویست و تەواوی حکومەتی دڵخوازە، ئەگەرچی رەنگە لەگەڵ راستیدا مەودای زۆربێ.

٢- تەنانەت ئەگەر بابەتەکە لە گریمانەیەك وەرگیرابێ پرسیارێك کە جێگای سەرنجە ئەمەیە کە ئایا رەوشی پێکهێنەری دیموکراسی لە ولاتانی روو لە گەشە بە مەبەستی پتەوکردن و لە ئاکامدا پاراستن و بردنە سەری ئاستی چالاکییەکانی حکومەتی دڵخواز لە ئارادایە؟ (Cills and Rocamora, 1992, p.504-11).

بە پێچەوانەی ئەم رێگا چارەیە و بە پێی ئەوەی کە ئەم دواییانە پێی گەیشتووین، شیدەکەمەوە کە توانایەکی گشتی کاریگەر لە پێناوی پێکهێنانی بەرێوەبەرییەکی سەرکەوتوو لە بواری گەشەسەندن، کارکردی حکومەتی دڵخواز نییە، بەڵکو جۆری سیاسەتەکان و جۆری دەوڵەتە کە دەتوانێ بە تەنیایی پێکهێنەر و هۆکاری بەردەوامی بێ.

هەروەك لە فەسڵی دواییدا باسی دەکەین بوونی جۆرێکی تایبەتی لە دەوڵەت کە پێی دەڵێین ((دەوڵەتی گەشەخواز))[1]، {چ ئەم دەوڵەتە دیموکراتیك بێ} یان هۆکاری سەرەکی زۆربەی سەرکەوتنەکانی گەشەسەندنی ئابووری لە سی ساڵ دوای سەدەی بیستەم لە ولاتانی جیهانی سێهەمدا بووە. بەجۆرێك کە کاریگەریی پۆزەتیڤی لە کەمکردنەوەی بێ عەدالەتی و نایەکسانی لەم ولاتانەدا بووە. ئەم دەوڵەتانە کاریگەرییەکی سەرەکییان لە بردنە سەری دەرەتانی خزمەتگوزاری بۆ زۆربەی هاوولاتییان لە قۆناغێکی تایبەتیدا بووە کە ئاکامەکەی پێکهێنانی سیاسەتی دیموکراتیکی بەردەوام[2] بووە. بە کورتی، دەبێ بڵێین ئەوەی دیاریکەری هێز و دەسەلاتی حکومەتێکی دڵخوازە پێکهاتە و تایبەتمەندیی دەوڵەتێکە نەك بەهێزکردنی دیواری سالاری و پێکهێنانی دامەزراوەی بەربلاو.

بە سەرنجدان بەوەی کە خوێندنەوە و پێناسەی جۆراوجۆر لە چەمکی ((حکومەتی دڵخواز)) هەیە، لەم بەشەدا ئاماژە بە دوو خوێندنەوەی گرینگ دەکەم.

١- پێناسەی یەکەم کە زۆر سنووردارە، لە روانگەی بانکی جیهانی لە بەرێوەبردنی حکومەتی دەبینرێ. بە جۆرێك کە بانکی بە کەڵك وەرگرتن لە دەستەواژەکانی بەرێوەبەریی، حکومەتی دڵخوازی راڤە و شیکردووەتەوە.

(1) Developmental State.
(2) Sustained Democratic Politics.



٢- گرووپێکی دیکە لە پێناسەکان کە لایەنێکی بەربڵاوتر لەخۆ دەگرێ لە پێوەندی لەگەڵ دەوڵەتانی رۆژئاوایی، ((رێکخراوی هاوکاری ئابووری و گەشەسەندن))[1] و پرۆگرامی ئاوەدانکردنەوە و پەرەپێدانی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانە[2]، کە زۆرتر لایەنی سیاسی هەیە.

لەم پێناسەدا هەرچەند پێ لەسەر بەرێوەبەری دڵخوازیش داگیراوە بەڵام بە شێوەیەکی تایبەتی تەئکید لەسەر سیاسەتی دیموکراتیك و بەشداربوون دەکا. سەرەرای ئەم روانگەیە تەئکیدی زیاتر لەسەر چەندین خاڵ لەوانە حکومەتی یاسا، خۆگونجاندنی فەرهەنگی[3]، کۆمەلایەتی و تاکەکەسی کراوە.

شایانی باسە کە پێداگرتن لەسەر حکومەتی دڵخواز وەك رەوشی یارمەتی بە ولاتانی داواکاری قەرز، بیرۆکەیەکی نوێ لە سیاسەتی گەیاندنی یارمەتی رۆژئاوا نییە. (Stokke, 1995, p.21)

پێداگرتن لەسەر ئەم سیاسەتانە زیاتر لە هەر شوێنێك لە گەلالەی شکست خواردووی سەرۆك کۆمار کێنێدی، لە پێوەندی لەگەڵ پێشکەوتنی ئەمەریکای لاتین لە ساڵی ١٩٦١دا دەبینرێ. بۆ نموونە کاتێك لە تەمووزی ١٩٦٢ لە پیرۆ کودەتا بەرێوەچوو، کێنێدی پێوەندی دیپلۆماتیك و یارمەتییەکانی خۆی لەگەڵ ئەو ولاتە پچراند و دەستپێکردنەوەی پێوەندی نێوان دوو ولاتی بەستەوە بە گەرانەوەی دیموکراسی.

دیارە لە کردەوەدا، لە زۆر حالەتدا پشتیوانی لە دیموکراسی و حکومەتی دڵخواز بە هۆی تێبینی سیاسەتی دەرەوە و بەرژەوەندی ئابووری دەوڵەتانی رۆژئاوایی و رێکخراوە گەورەکانی نێونەتەوەیی وەك بانکی جیهانی IMF و هتد... دەکەوێتە ژێر کاریگەرییەوە. لە راستیدا، سەرەرای دژایەتی زۆری نێوان پێوانەکانی جێگای سەرنجی ولاتانی رۆژئاوایی و رێکخراوە گەورەکانی نێونەتەوەیی، ئەم ولاتانە زۆرجار بە سەرنجدان بە بەرژەوەندی نەتەوەیی و رێککەوتنی سیاسی پشتیوانییان لە حکومەتە دیکتاتۆرەکان کردووە.

تەنانەت ولاتانی رۆژئاوایی یارمەتییەکی زۆری سیاسی، ئابووری و سەربازییان بە دەوڵەتە دیکتاتۆرەکان لەوانە ئارژەنتین، ئیلسالوادۆر، کۆریای باکوور، هتد... کردووە. بەگشتی دەبێ بڵێین بابەتی بلاوبوونەوەی دیموکراسی و حکومەتی دڵخواز بە درێژایی شەری سارد بەهۆی دژایەتی لەگەڵ بەرژەوەندی نەتەوەیی رۆژئاوا رێککەوتنی لەسەر کرابوو. (Barya, 1993, p.18)

(1) OECD.
(2) UNDP.
(3) Tolerance.





## ویستگەکان و بوارەکانی سەرهەڵدانی بیرۆکەی حکوومەتی دڵخواز

لە پێوەندی لەگەڵ ئەم پرسیارە کە بۆچی حکوومەتە رۆژئاواییەکان گۆڕانکاریی بەربلاویان لە گەیاندنی یارمەتی خۆیان ئەنجام داوە و بۆچی ئەم دەوڵەتانە لە دەیەی ٩٠ی زایینی ئۆگرییان بە پێکهێنانی دیموکراسی و حکوومەتی دڵخواز پەیدا کرد هۆکاری زۆری هەیە کە پێمواپە دەتوانین لە چوار خاڵدا کورتی بکەینەوە:

١- ئەزموونی هاوسەنگکردنی پێکهاتەیی لە دەیەی ٨٠ی زایینی.
٢- زاڵبوونی نیولیبرالیزمی دەوڵەتی لە رۆژئاوا.
٣- رووخانی رژێمە کۆمۆنیستییەکان.
٤- پەرەئەساندنی بزووتنەوەکانی لایەنگری دیموکراسی لە وڵاتانی روو لە گەشە بە تایبەتی ئەورووپایی رۆژهەڵات.

## ئەزموونی هاوسەنگ کردنی پێکهاتەیی[1] لە دەیەی ٨٠ی زایینی

هاوسەنگ کردنی پێکهاتەیی بە مانا گشتییەکەی بریتییە لە کۆی کردەوەی ئابووری و بنەڕەتی کە وڵاتانی روو لە گەشە دەبێ لە بەرامبەر وەرگرتنی قەرز لە وڵاتانی رۆژئاوایی، سەندووقی نێونەتەوەی دراو و بانکی جیهانی بەڕێوەیبەرن. (Mosley, 1991, ch.1) مەبەستی هاوسەنگ کردنی پێکهاتەیی، شکاندنی دەسەڵاتی پارادایی گەشەخوازی دەوڵەت تەوەر دوای جەنگ و زاڵبوون بەسەر کێشەکانی دابەزینی گەشەسەندن لە رێگای بڵاوکردنەوە و بردنە سەری ئاستی بازاڕی کێبەرکێ و ئازاد لە ژێر چاودێری دەوڵەتەکاندا بووە. بە وتەی یەکێك لە لایەنگران ((بازاڕ وەك داینەمۆی بزوێنەری گەشەسەندن: میکانیزمی بازاڕی ناتەواو و خەوشدار))[2] لە بەراورد لەگەڵ ((میکانیزمی داڕشتنی بەرنامەی ناتەواو))[3] لە کردەوەدا کارایی زۆرتری هەیە. بە واتایەکی دیکە بازاڕە ناتەواوەکان لە دەوڵەتانی کارلێنەهاتوو و خەوشدار باشترن. (Lal, 1983, p.106)

گەڵاڵەی گشتی هاوسەنگ کردنی پێکهاتەیی زۆرجار بریتییە لە دوو قۆناغی گرینگ کە ئەم دوو قۆناغە بە زۆری لە لایەن بانکی جیهانی و سەندووقی نێونەتەوەیی دراو لە پێوەندی لەگەڵ یەکتر بەڕێوەدەبرێ.

(1) Structural Adjustment.
(2) Imperfect Market Mechanism.
(3) Imperfect Planning Mechanism.



١- قۆناغی سەقامگیرکردن.
٢- قۆناغی هاوسەنگ کردن.

مەبەست لە قۆناغی سەقامگیرکردن بریتییە لە کەمکردنەوەی خێرای بەهای دراو و بە گشتی کەمکردنەوەی لە رادەبەدەری هەزینە گشتییەکان.

قۆناغی هاوسەنگ کردن کە بە دوای قۆناغی سەقامگیرکردندا بەڕێوەدەچێ دەگەرێ بە دوای راگواستنی پێکهاتە ئابوورییەکان لە رێگای گۆڕینی رێژەی چاودێریی یاسایی، بە تایبەتی کردن، تێکەوپێچانی بوروکراسییە گەورەکان و کەمکردنەوەی یارمەتییەکان و بەکارهێنانی هەزینەگەلێ ژیرانە بە مەبەستی کەڵك وەرگرتنی زیاتر بە تایبەتی لە بواری هەناردەدا.

بەڵام گرفتێك کە لەم پێوەندییەدا هەیە ئەمەیە کە کاتێك خەڵك شێوازەکانی کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەکان دەگۆڕن، پێوەندیی نێوان ئەوانیش دەگۆڕدرێ. (Stretoon, 1976, p.3).

لە ئاکامی هاوسەنگ کردنی پێکهاتەیی لە وڵاتانی گەشە بێگومان گۆڕانکاری زۆر لە بەکاربردن، بەرهەمهێنان و دابەشکردنی سەرچاوەکان روودەدا و لەبەر ئەم هۆیە وەك بابەتی سیاسی چاو لێدەکرێ کە بە ناچار براوە و دۆڕاوی زۆری بە دوادا دێ. (Haggard, 1989).

ئەو گرووپانەی کە لە ئاکامی هاوسەنگ کردنی پێکهاتەیی زیانیان پێگەیشتووە و وەك دۆڕاو سەیر دەکرێن بریتین لە:

١- بوروکراتەکان: بە هۆی سنووردارکردنی خزمەتگوزاری مەدەنی، لە دەستدانی دەسەڵات و ئیمتیازی لاوەکی بەتایبەتی کردن.
٢- کرێکارانی کەرتی گشتی: بە هۆی بە تایبەتی کردن و لە دەستدانی پیشە.
٣- کرێکارانی کەرتی تایبەتی: بە هۆی دابەزینی لە رادەبەدەری مووچە و خزمەتگوزاری لە بواری خۆشگوزەرانی.
٤- حیزبەکان: بە هۆی لەدەستدانی دەسەڵاتی کاریگەر.
٥- وەرزێران و بەرهەمهێنەران: بە هۆی نەهێشتنی سوبسیدەکان*.

ئەم گرووپانە بە هۆی هەندێك حاڵەت لەوانە هاتنە خوارەوەی رێژەی خزمەتگوزاریی گشتی، کەمبوونەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت کە لە لایەن حیزبێك ئیدارە دەکرێ، کێبەرکێ زیاتر، نەهێشتنی سوبسیدەکان و تیجارەتی ئازادتر زیان دەبینن. دیارە لە نێو ئەم گرووپانەدا،

* سوبسید: پاڵپشتی حکوومەت بۆ ئابووری ناوخۆ.





کاریگەرییەك کە لە سەرتوێژی هەژار لە ڕێگای چوونە سەری لە ڕادەبەدەری دەرمان، کەرەستەی سەرەتایی خۆراك و هەزینەی پەرەوەردەکردن هەیە زۆر زیاترە. ئەو شتانەی کە لە سەرەوە ئاماژەی پێکرا پێ لەسەر سیاسی بوونی هاوسەنگ کردنی پێکهاتەیی دادەگرێ چونکە بەبێ گۆڕانی ڕەوشەکە و گۆڕانی هاوپەیمانی و پێکهێنانی هاوپەیمانی نوێ لە کۆمەڵگا، هیچ گۆڕانێك لە کۆمەڵگا ڕوونادا. کەوابوو ئەوەی لە ماوەی دەیەی ٨٠ی زایینی دەرکەوت، ئەم ڕاستییە بوو کە بەڕێوەبردنی هاوسەنگ کردنی پێکهاتەیی ئاکامی بەڵێنی سیاسی، توانایی و لێوەشاوەیی لەگەڵ کارلێهاتوویی ئیداری و سەربەخۆیی دەوڵەتە. (Healey, 1992, p.155)

بۆ وێنە پرۆگرامەکانی هاوسەنگ کردن لەو وڵاتانە بەڕێوەچوون کە خاوەنی دەوڵەتێکی بەهێز، سەربەخۆ و ئازادن لە هەردوو جۆری دیموکراتیك یان نادیموکراتیك. شیلی، کاستاریکا، تورکیا و ئەندۆنزیا نموونەکانی ئەم دەوڵەتانەن. (Nelson, 1989).

لەو وڵاتانەی کە دەوڵەت بە شێوەی ئازاد و سەربەخۆ پێکهاتوون، بەڵام توانایی و دەسەڵاتەکەی لەگەڵ ئەو نەگونجاوە، پرۆگرامەکانی هاوسەنگ کردن یان بەڕێوە ناچێ یان بە شێوەی ناتەواو بەڕێوە دەچێ. لەم جۆرە وڵاتانە دەتوانین ئاماژە بە زامبیا، هیند، فیلیپین، جامائیکا و زائیر بکەین.

وادێتە بەر چاو کە لە ڕوانینی باو، گرینگی دەوڵەتی بەهێز لە نێو چووە، چونکە ئەم ڕوانینە لە ڕێگای چاکسازی سیاسی و ئابووری، بە دوای کەمبوونەوەی ڕێژەیی پانتایی و ڕێژەی دەسەڵاتی دەوڵەت بووە. ئەزموونی هاوسەنگ کردن لە دەیەی ٨٠ی زایینی، دامەزراوە نێونەتەوەییەکان و دەوڵەتەکانی دابینکەری قەرز لەگەڵ ئەم ڕاستییە کە زۆربەی دەوڵەتانی ڕوو لە گەشە گەندەڵ و کارلێنەهاتوون، بەرەوڕوو کردووە.

ئەم بابەتە بە خێرایی بووە ڕاستییەك کە ((کەشی سیاسی))[1] یەکەمین کۆسپی سەرەکییە بۆ گۆڕانکاریی ئابووری. ئەم ڕاستییە بە تایبەت سەبارەت بە ئەفریقا دەگونجا و تاڕادەیەك بانکی بەرەو دەستنیشانکردنی حکوومەتە هەژارەکان وەك هۆکاری قەیرانی ئەفریقا پاڵ پێوە دەنا. (World Bank, 1989).

لە دەقی ڕاپۆرتی بانکی جیهانی، لە پێوەندی لەگەڵ هۆکارە سیاسییەکان و بوارەکانی سەرهەڵدانی قەیرانی حکوومەت لەو وڵاتانە بە کورتی ئاماژەی پێکراوە. بە واتایەکی دیکە ڕاپۆرت بە کورتی دەوڵەت و سیاسەتەکانی گەشەسەندنی تاوتوێ کردووە و لە بەرامبەردا زۆرتر

(1) Political Environment.



بایەخی بە پرسە ئیداری و بەڕێوەبەرییەکان داوە و لە زۆربەی بەیاننامەکاندا، بانك پابەندبوونی خۆی بە ڕوانگەیەکی ناسیاسی و ستراتیژی تەکنیکی بە حکوومەتێك کە بەرەو باشی هەنگاو دەنێ ڕاگەیاندووە.

بەڵام ئەمەش فێڵێك بوو. چونکە ڕوانگەی ناسیاسی و لەبەرچاوگرتنی ڕاسپاردەی بەڕێوەبەری، پێویستی بە گۆڕانکاری قووڵی سیاسی بووەو نەتەنیا نەیدەتوانی ببێتە هۆکارێك بۆ پێکهێنانی ڕوانگەیەکی بەڕێوەبەری، بەڵکو بووە هۆی پێکهێنانی ڕوانگەیەکی سیاسی و ئابووری. لە ئاکامدا ئەوەی جێگای سەرنج بوو، دەوڵەتێکی بەڕێوەبەر و کارلێهاتوو و بە دوور لە کێشە ئابوورییەکانی پێشوو بوو. کاتێك ئەم دەوڵەتە لە بوارەکانی ژێرخانەوە سەرمایەکانی وەگەڕ دەخست و لایەنەکانی بەڕێوەبەری و ژێرخانەکانی فەرهەنگی، کۆمەڵایەتی و پێکهاتەیی لەبەرچاو دەگرت، گرینگترین ڕۆڵی ئەو هاندانی هێزەکانی بازاڕ بە هەڵسوکەوتی بێ لایەنانە، کراوە و وەڵامدەر بوو.

ئەگەرچی لە ساڵی ١٩٩٧ ڕوانگەی بانك لە پێوەندی لەگەڵ دەوڵەت گەیشتە ئاستێکی باش و ڕۆڵی ئەو لە گەشەسەندن زیاتر هەست پێدەکرا، لەگەڵ ئەمەشدا بانك خاوەنی ڕۆڵێکی ناڕاستەوخۆ و بە واتایەك ڕۆڵی ئاسانکاری و کاتالیزۆری هەبوو. بە تەواوی ئەم تایبەتمەندییانەوە بانك لەسەر بیرۆکەی خۆی کە گرینگی دان بە کەرتی تایبەتی دەرەوە و نێوخۆ لە بازاڕەکانی ئازاد و ڕژێمەکانی تیجاری بوو، مایەوە و هیچ گۆڕانکارییەکی پێك نەهێنا. (World Develeopment Report, 1997).

## کاریگەریی سیاسی پێکهاتوو لە شۆڕشی نیوکلاسیکدا

ئەگەرچی بانکی جیهانی و سندووقی نێونەتەوەیی دراو (IMF) خاوەنی ڕوانگەی گەشەخوازی سەربەخۆ لە یەکترن و سیاسەت و داهێنانی تایبەت بە خۆیان هەیە بەڵام لە ڕووی سیاسییەوە هەردووی ئەم ڕێکخراوانە لە ژێر کاریگەری سیاسەتەکانی ئەندامانی خۆیانن کە وڵاتە گەورەکان لە نێو ئەواندا ڕۆڵی تایبەت و بەرچاویان هەیە.

پێکهاتەی دەسەڵات و دەنگدان لەم ڕێکخراو و دامەزراوانە، بە سەرنجدان بە ڕێژەی وەگەڕخستنی سەرمایە و بەڵێنی وڵاتانی ئەندام پێکدێ. بۆ نموونە وڵاتگەلێك وەك ئەمەریکا، بەریتانیا، ژاپۆن، ئەڵمانیا و فەرەنسا نفوزێکی بەرچاویان لە بەراورد لەگەڵ وڵاتانی دیکە هەیە. (Toy, 1987).





هەرچەند باسی پێوەندیدار بەم بیرۆکانە لە بانکی جیهانی و سندووقی نێونەتەوەیی دراو (IMF) لە حاڵی پەرەئەستاندندا بوو، بیرۆکەیەکی نوێ لە ژێر کاریگەری کۆنترۆڵ و ڕێککەوتنی بیرۆکەی نیولیبرالیزم لە چوارچێوەی سیاسەت و ئابووری لە کۆتایی دەیەی ٧٠ی زایینی لە وڵاتەکانی وەك ئەمەریکا و بەریتانیا پێکهات.

نیولیبرالیزم تەنیا بیرۆکەیەکی ئابووری نییە و لەگەڵ ئەوەشدا پرسە سیاسییەکانیش لەخۆ دەگرێ و خاوەنی بیرۆکەی کارکردی زۆر بەهێزە لەم چوارچێوانەدا.

لەڕووی چەمکەوە بیرۆکەی نیولیبرالیزم، بایەخ دەدا بە ئازادی سیاسی و ئابووری کە وەك پێویستی ژیانی دڵخواز چاو لێدەکا. ئەم بیرۆکەیە سەرەڕای پارێزگاری کردن لە ئاشتی و دیسیپلین، بە سنووردارکردنی مافی تاکەکان لە لایەن دەوڵەتەوە بەبێ لە بەرچاوگرتنی ڕەگەز و ئایینی تاکەکان دژایەتی دەکا.

نیولیبراڵەکان بەتایبەت لیبراڵە پارێزگارەکان لەوانە نوزیك[1] پێی وایە کە دەستێوەردانی دەوڵەت لە ئابووری و سەپاندنی سەلیقەی دەوڵەتی بەسەر مافی ڕەوا و ئازادییەکانی تاك و دەستێوەردان لە مافی هەڵبژاردنی خەڵك دەبێتە هۆی زیان گەیاندن بە چالاکییەکانی بازاڕی ئازاد و لە ئاکامدا زەبر بە گەشەسەندنی ئابووری دەگا. سەرەڕای رادەربڕینی سیاسەتوانان لە پێوەندی لەگەڵ قازانجەکانی تاکگەرایی و دەوڵەتانی بچووك[2]، کردەوەی زانایانی سیاسی لە بوژانەوەی ئابووری سیاسی یان سیاسەتی ئابووری بە پێکهێنانی ئۆگرییەکی نوێ لە پێوەندی لەگەڵ حکوومەت و دەوڵەت و ڕەوتی گەشەسەندن یارمەتی داوە. (Staniland, 1985).

نیولیبراڵەکان بە گەورەبوونی دەوڵەت لە وڵاتانی روو لە گەشە دژایەتی دەکەن و لەڕووی تیۆرییەوە گەورەبوونی دەوڵەت و چوونە سەری ڕەوتی دەستێوەردەرانە و کۆنترۆڵی لە رادەبەدەر لەگەڵ داڕشتنی ڕێوشوێنی ئابووری بە هۆکاری پێشگیری لە هەڵدانی ئابووری و بڵاوبوونەوەی بازاڕی پێشکەوتوو و هۆکاری پێکهێنانی دەرەتانی لەبار لە پێناوی بەرتیل خۆری و گەندەڵی دەزانن. یەکێك لە خوێندنەوە کلاسیکەکانی بەرێوەچوو لە بواری سەرهەڵدانی ئەم نەریتە، لێکۆڵینەوەیەکە کە رابێرت بیتس[3] لەژێر سەردێری بازاڕەکان و دەوڵەتەکان لە ئەفریقا گەرم لە ساڵی ١٩٨١ ئەنجامیداوە، ناوبراو لەم لێکۆڵینەوەدا ئەم پرسیارەی لێکداوەتەوە کە بۆچی

(1) Nozick.
(2) Minimal State.
(3) Bates.



سیاسەتە کشتوکاڵییەکان بە شێوەیەکی کارەساتبار لە ئەفریقای پاش کۆلۆنیالیزم سەرەڕای بوونی بوارەکانی گەشەسەندن تووشی شکست بوون؟

خوێندنەوەکانی بیتس دەبێ لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەکانی ئەنجامدراو لە لایەن مارگارێت لوی سەرنجی پێبدرێ کە پێش لە ناوبراو لە پێوەندی لەگەڵ کۆڵەکەکانی دەوڵەتی تالانچی بەرێوە چووبوو.

لە روانگەی بیتسەوە ڕێبەرانی سیاسی لە ئەفریقا بە مەبەستی نزم راگرتنی بەهای خۆراك بە مەبەستی پشتیوانی سیاسی لە هاووڵاتییان کە حکوومەت بەستراوە بەوان بوو، لە کەرەستە سیاسییەکان کەڵکیان وەردەگرت کە دەبووە هۆی ئەوەی کە وەرزیران و بەرهەمهێنەران زیانی گەورەیان لێبکەوێ.

سەرەڕای ئەوەی کە لوی لە نامەی خۆیدا ئاماژەی بە ئۆگری دەسەڵاتداران بۆ وەرگرتنی باجی زۆر دەکا، بیتس پێی وابوو کە دەوڵەتانی ئەفریقایی کە پاش قۆناغی کۆلۆنیالیزم پێکهاتوون لە دەسەڵاتی فراوانی خۆیان بەتایبەت لە گۆڕەپانی بازاڕە پێکهاتووەکان لە وڵاتانی وەك غانا وەك ئامرازێك بە مەبەستی وەرگرتنی باج لە وەرزێران کەڵکیان وەردەگرت. ئەم دەوڵەتانە، ئەم کارەیان لە ڕێگای کڕینی بەروبوومی کشتوکاڵی بە نرخێکی هەرزان و فرۆشتنی چەند بەرامبەر بە دەرەوەی وڵات و دزینی زێدە بایییەکەی، بەرێوە دەبرد و لە قازانج و باجی وەدەست هاتوو بە مەبەستی پێشکەوتنی بەرژەوەندی بوروکراسی، نوخبەکان و لە هەندێك حاڵەتدا بەرژەوەندی پیشەسازی کەڵکیان وەردەگرت.

بە کورتی دەبێ بڵێین کە شیکردنەوەی لە رادەبەدەر سیاسی لە پێوەندی لەگەڵ دابەزینی ئاستی کشتوکاڵ لە ئەفریقا، نیشان دەدا کە چۆن دەستێوەردانەکانی دەوڵەتێك لە ئابووری لە ڕێگای داڕشتنی ڕێوشوێن و خاوەنداریێتی دەوڵەتی، دەبێتە هۆی پێکهێنانی دەرفەتی دەستێوەردەرانەی سیاسی سیاسەتوانان لە بازاڕ و پێکهێنانی بوروکراسی و لە ئاکامدا دەستەبەرکردنی ئامانج و خواستەکانیان. لە حاڵێکدا بوونی بازاڕی کێبەرکێ، ئەم سیاسەتانەی دەستەبەر نەدەکرد و ئەگەر ئەم شێوازە بەردەوام بوایە بە شێوەی کلاسیك دەبووە شێوازێکی تالانچی. (Ibid, p.4)

لەڕووی سیاسییەوە، ئەگەر رۆڵی دەوڵەت لە ژیانی ئابووری کەم بێتەوە، لە لایەك دەبێتە هۆی بچووك بوونی دەوڵەت و کەم بوونەوەی بەرتیل خۆری و لەلایەکی دیکەوە ئازادی زۆرتر و سەرهەڵدانی کەرتی تایبەتی چالاك بە مەبەستی بەرهەمهێنان، زۆرتر دەبێ.





لەم ڕێگاچارەیەدا بە کردەوە، باشبوونی ڕەوشی حکوومەتی، نەتەنیا بە مانای بچووك بوونی پێکهاتەی دەوڵەتە بەڵکو پەرەئەستاندنی هێزەکانی بازاڕیشی لە گەڵدادێ.

بیرۆکەی سیاسی نیولیبراڵ لیبراوانە تەئکید دەکا کە سیاسەتە دیموکراتیکەکان و بوروکراسی کارلێهاتوو و وەڵامدەر ئەگەرچی بۆ ئابوورییەکی بازاڕی ئازادی بەرەو هەڵدان بەس نییە، بەڵام یەکێ لە پێویستییەکانە کەوابوو ئەم دووە تەواوکەری یەکترن. (Friedman, 1980, p.21)

نیولیبرالەکان هەروەها گەورەیی پێکهاتەی دەوڵەت و چوونە سەری دەستێوەردانی دەوڵەت لە ژیانی ئابووری نەتەنیا لەڕووی بەڕێوەبەرییەوە ناکارامەی دەبینن، بەڵکو دژی سەربەخۆیی و کۆمەڵگای چالاکی مەدەنی کە لە کۆڵەکەکانی دیموکراسی کارامەیە، دەزانن.

کەوابوو تیۆریسییەنەکانی نیولیبراڵ زۆربەیان لەسەر ئەو بڕوایەن کە دابەزینە لاوازەکانی گەشەسەندن و شکستی سیاسەتەکانی هاوسەنگ کردن، ئاکامی ڕاستەوخۆی حکوومەتی دیکتاتۆر و نەبوونی بەڕێوەبەرییەکی دروستە کە هەموویان بە هۆی جێگیربوونی لە ڕادەبەدەری دەسەڵاتی سیاسی و ئابووری لە دەوڵەت دایە کە لەگەڵ حکوومەتی دڵخوازی بەرپرس و وەڵامدەر لە ئابوورییەکی ئازاددا دژایەتی هەیە. (Lal, 1983, p.103-9)

ئەم جێگیربوونەی دەسەڵات، لەبەرچاو نەگرتن و بێ توانایی دەوڵەت لە دامەزراندن و سەقامگیرکردنی لیبرالیزمی سیاسی نیشان دەدا.

بە سەرنجدان، بە هۆکارەکانی ئاماژەپێکراو، بیرۆکەی نیولیبراڵ لە کۆتایی دەیەی ٧٠ی زایینی، دەوڵەتانی ڕۆژئاوایی و دامەزراوە نێونەتەوەییەکانی ناچارکرد هەتا بە بردنە سەری ئاستی لیبرالیزمی ئابووری بەرەو پێکهێنانی حکووومەتی دڵخواز و حکوومەتی دیموکراتیك هەنگاو بنێن و وەك مەرجی سەرەکی یارمەتییەکانی گەشەسەندنی خۆیان بە وڵاتانی دیکە چاو لێبکەن.

## ڕووخانی کۆمۆنیزم[1]

ڕووخانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات، ڕژێمە کۆمۆنیستییەکان و دەوڵەتانی سۆسیالیستی، یەکێکی دیکە لە هۆکاری سەرەکییەکانی ئۆگری ڕۆژئاوا بووە لە پێکهێنان و بردنە سەری ئاستی حکوومەتی دڵخواز.

ڕەوشی نوێی نێونەتەوەیی کە پاش ساڵی ١٩٩٠ هاتە ئاراوە، بەو مانایە بوو کە وڵاتانی ڕۆژئاوایی لە ڕەوشی نوێدا دەیانتوانی بە ڕوونی خواستە سیاسییەکانیان لە یارمەتیدان بە

(1) The Collapse of communism.



وڵاتانی دیکە بەبێ ترس ((لە دەستدانی هاوپەیمانانی جیهانی سێهەم خۆیان و پەیوەست بوونیان بە جەمسەری کۆمۆنیزم)) بەکاربێنن.

سەرەڕای ئەمەش، لەنێوچوونی کۆمۆنیزمی دەوڵەتی سەدەی بیستەم دروستی بیرۆکەی نیولیبرالیزمی نیشاندەدا. چونکە ئەم بیرۆکەیە دژواربوونی بوروکراتیك و سیستەمە بە کۆمەڵە نادیموکراتیکەکانی لە پێکهێنانی هەڵدانی بەرچاوی ئابووری و پێکهێنانی گۆڕانکاری، لاواز لێکدەدایەوە.

گەندەڵی، کەڵکی خراپ وەرگرتن لە بەڕێوەبەریی ئابووری و کارلێنەهاتوویی، هەموویان ئاکامی ڕاستەوخۆی بوروکراسی کارلێنەهاتوو و بەشدار نەبوونی گشتییە. لیبرالیزمی سیاسی، ناکۆجێیی ئیداری، کەمکردنەوەی کۆنترۆڵەکانی بوروکراتیك و بردنە سەری ئاستی حکوومەتی دڵخواز لە مۆدێلی ڕۆژئاوایی وەك مەرجی پێویستی گەشەسەندن و لیبرالیزمی ئابووری دێنە ئەژمار.

سەرکەوتن بە هۆی شکستی کۆمۆنیزم، بووە هۆی ئەوەی کە ڕۆژئاوا بە دڵنیایی زیاترەوە بە مەبەستەکانی بگا و ئەم دڵنیاییە بە خێرایی و بە ڕاشکاوانە لە ناوەڕۆکی ڕێککەوتننامەکانی بانکی ئەورووپایی کە بە مەبەستی نۆژەنکردنەوە و گەشەسەندن و گۆڕانی پێکهاتەی ئەورووپای ڕۆژهەڵات و ئابووریی سۆڤییەتی پێشوو لە ساڵی ١٩٩١ پێکهات، ڕەنگی دایەوە.

لەم ناوەڕۆکە پێوەندییەکی ڕاستەوخۆ لە نێوان لیبرالیزمی ئابووری و سیاسی وەك جەوهەری حکوومەتی دڵخواز و ئامانجی بانك بە مەبەستی گەشەسەندن پێکهات. کەوابوو لە بەراورد لەگەڵ بانکی جیهانی کە بەردەوام بەهۆی ماددەکانی نووسراو لە پێڕەوی نیوخۆ و ڕێککەوتننامەکان لە بڕیارەکان و سیاسەتەکانی خۆیدا لەگەڵ کێشەی جیددی بەرەوڕوو بوو، بانکی جیهانی کە پاش ڕووخانی کۆمۆنیزم پێکهات لەوەی کە هەردوو لایەنی سیاسی و ئابووری بە شێوەی ئاشکرا و ڕاشکاوانە ئامانجەکانی خۆیان لەبەرچاو گرتبوو، بە هیچ جۆر لە لایەن بانکی جیهانییەوە کێشەی بۆ نەهاتووەتە پێش. ئەم ئامانجە ڕاشکاوانەیەی بانکی ئەورووپایی نۆژەنکردنەوە و گەشەسەندن[1] بریتییە لە دیموکراسی چەند حیزبی، پلۆرالیزم و ئابووری بازاڕ. (EBRD, 1991, Article, 1).

(1) European Bank for Reconstruction and Development (EBRD).





### پەرەئەستاندنی بزووتنەوەکانی لایەنگری دیموکراسی

لە کۆتاییدا، سەرهەڵدانی بزووتنەوەکانی لایەنگری دیموکراسی لە ئەمەریکای لاتین، فیلیپین و ئەورووپای رۆژهەڵات لە دەیەی ٨٠ی زایینی کە بووە هۆی بزواندنی بزووتنەوەکانی هاوچەشن لە شوێنەکانی دیکەی جیهان لە هۆکارەکانی دیکەی جێگای سەرنجی رۆژئاوا بە حکوومەتی دڵخواز بوو.

لە ئەفریقا لە نێوان ساڵەکانی ١٩٨٩ هەتا ١٩٩٢ فشارە نێوخۆیی و دەرەکییەکان بووە هۆی ئەوەی کە هەنگاوگەلێك لە پێوەندی لەگەڵ ناکۆجێی کردنی زۆربەی وڵاتانی ئەفریقایی لەوانە نایجیریا، زائیر و ئانگۆلا سەرەڕای بەرگری توندی رژێمە دەسەڵاتدارەکان هەڵبگیرێ.

دیموکراسیخوازی لە ئاسیا جگە لە چەند وڵاتێك وەك چین و میانمار کە لە لایەن دەسەڵاتدارانەوە سەرکوت کرا یان لە پاکستان بە هۆی روودانی کودەتا خەوشداربوو، لە وڵاتانی دیکەی وەك فیلیپین، تایوان، بەنگلادیش و تەنانەت نیپاڵ گەشەیەکی بەرچاوی هەبووە.

وڵاتانی رۆژئاوایی بزووتنەوەکانی دیموکراسیخوازییان بە رەوا و یاسایی دەزانی و لەم رێگایەوە پشتیوانییان لە خواستەکانی ئەوان بە مەبەستی دەستەبەرکردنی حکوومەتی دڵخواز دەکرد. لە حاڵێکدا رۆژئاوا سەرکەوتن و ئۆگری راستەقینەی خۆی لە سەرهەڵدانی لیبڕاڵ دیموکراسی دەزانی، هەندێك لە تیۆریسییەنە رەشبینەکان (ئەگەر نەڵێین ریالیست) پێشبینییان کردبوو کە روانگەیەکی نوێ لە چوارچێوەی سەرمایەداری جیهانی سەرهەڵدەدا کە دەستەبەرکردنی پێش لە روودانی ئەم رووداوانە بە هۆی رەوشی دوو جەمسەری زاڵ بەسەر سیستەمی نێونەتەوەییدا مەحاڵ بوو. (Gills and Recamora, 1992)

دەبێ بڵێین کە پێداگرتنی رۆژئاوا لەسەر حکوومەتی دڵخواز و دیموکراسی وەك دۆزینەوەی دەرمانێکی نوێ بۆ نەخۆشییەکی کوشندە بە رێکەوت و لە ناکاو نەبوو، بەڵکوو بەرهەمی پرۆسەیەکی درێژخایەن بوو.

رەوشێك کە بووە هۆی هاتنە بەرباسی بابەتەکانی پێوەندیدار بە حکوومەتی دڵخواز لە پرۆگرامی وڵاتانی رۆژئاوایی، بە جۆرێك پێوەندی بە سەرچاوەی سیاسییەوە بووە. لە راستیدا پێناسەکانی پێوەندیدار بە حکوومەتی دڵخواز لە ژێر کاریگەری هۆکاری سیاسی هاتوونەتە بەرباس. کەوابوو پێش تاوتوێکردنی ئەو پێناسانەی لە پێوەندی لەگەڵ حکوومەتی دڵخواز پێشکەش کراون، خراپ نییە ئاماژەیەکی کورت بە چۆنیەتی سەرهەڵدانی حکوومەتی دڵخواز بکەین.



### سەرهەڵدانی حکوومەتی دڵخواز

هەروەك پێشتر ئاماژەی پێکرا، ئەندێشەی نوێی حکوومەتی دڵخواز یەکەمین جار لە راپۆرتی بانکی جیهانی سەبارەت بە ئەفریقا لە ساڵی ١٩٨٩ هاتە بەرباس بە جۆرێك کە بانك لە شیکردنەوە و راڤەکردنی کێشەکان و کۆسپەکانی گەشەسەندنی ئەفریقا پێی لەسەر بەڕێوەبەریی حکوومەت دادەگرت.

ئەم چەمکە لە نێوان ساڵەکانی ١٩٨٩ هەتا ١٩٩١ بە کەڵك وەرگرتن لە وشەی دیکە لە چوارچێوەی حکوومەت، دیموکراسی و گەشەسەندن لە ناوەندە جۆراوجۆرەکانی وەك OECD، دەوڵەتەکانی فەرەنسا، ئەمەریکا و بەریتانیا، کۆمیسیۆنی کۆمەڵگای ئەورووپا، یەکیەتی ئەفریقا، بانکی جیهانی و UNDP کەڵکی لێوەردەگیرا. پێکهێنانی و بردنە سەری ئاستی حکوومەتی دڵخواز و دیموکراسی لە لایەن رێکخراوە ناوچەیی و نێونەتەوەییەکانەوە لەوانە رێکخراوی یەکگرتنی ئەفریقا، یەکیەتی ئەفریقا و هتد... پشتیوانی لێکرا.

بەڵام پرسیارێك کە دێتە پێش ئەمەیە کە مەبەست و ئامانجی ئەم رێکخراو و دەوڵەتانە لە حکوومەتی دڵخواز چ بووە؟

### ماناکانی حکوومەتی دڵخواز

رێکخراوەکانی ئاماژەپێکراو خاوەنی روانگەگەلی هاوبەش لە پێوەندیی نێوان حکوومەت، دەوڵەت و گەشەسەندن نییە.

لە حاڵێکدا هەندێك لەوانە پێ لەسەر دیموکراسی و پشتیوانی لە مافی مرۆڤ دادەگرن، هەندێکی دیکە لەسەر رۆڵی بەڕێوەبەری دڵخواز و ئەوەی کە لە بانکی جیهانیدا پێی دەڵێن بەڕێوەبەرییەکی کارامە، وەك هۆکاری سەرەکی گەشەسەندن تەئکید لەسەر دەکەن. بەڵام هیچ یەك لەم رێکخراوانە لە پێوەندی لەگەڵ پێشکەشکردنی جۆرێك دەوڵەت کە بتوانێ حکوومەتی دڵخواز بۆ خۆی پێکی بێنێ، سەرکەوتوو نەبوون.

تەنانەت دامەزراوەکانی وەك UNDP، OECD و وڵاتانی رۆژئاوایی کە پێیان لەسەر رۆڵی دیموکراسی وەك هۆکاری سەرەکی و سیاسی پێکهێنەر و پارێزەری حکوومەتی دڵخواز داگرتووە، لە پێوەندی لەگەڵ ئەو تێبینی و پێداویستییانەی کە دەتوانێ دیموکراسی جێگای پەسند پێکبێنێ و بەهێزی بکا، جیاوازی بیروبۆچوون هەیە، یان لانیکەم، ئەم رێکخراو و وڵاتانە لێکۆڵینەوەیەکی کاریگەریان لە پێوەندی لەگەڵ ئەو وڵاتانەی کە حکوومەتی بەناو





دڵخوازیان قەبووڵ کراوە، بەڕێوەنەبردووە هەتا نیشانی بدەن ئایا لەم وڵاتانەدا ڕەوشی لەبار بۆ دەستەبەرکردنی حکوومەتی دڵخواز لە ئارادایە یان نە؟

شایانی باسە خواستەکانی چەمکی حکوومەتی دڵخواز لە وڵاتانی جیهانی سێهەم یان سیاسەتەکانی گەیاندنی یارمەتی بە مەبەستی گەشەسەندن نییە.

ئەم چەمکە لە دەیەی ٨٠ی زایینی لە وڵاتانی گەشەکردوو لە ڕەوتی گۆڕانکاری ڕێکخراوەییدا لە ((بەڕێوەبەری گشتی نەریتی))[1] بوو بە ((بەڕێوەبەری نوێی گشتی))[2]. (Dunleary, 1994)

چەمکی حکوومەتی دڵخواز لە بەکارهێنانی ئەمڕۆیی خۆیدا لە وڵاتانی گەشەکردوو خاوەنی واتا و پێناسەی جۆراوجۆرن کە ئاماژە بە ٥ نموونەی گرینگی دەکەین:

١- حکوومەت لە مانای ((دەوڵەتی بچووك)) وشەیەکی گشتی و هەمەلایەنە کە لە پێوەندی لەگەڵ کەمکردنەوەی دەستێوەردانی گشتی لە ئابووری و بەکارهێنانی بازاڕی ئازاد و نیمچە بازاڕەکان بە مەبەستی ڕاگواستنی خزمەتگوزاری گشتی، بەکاردەبرێ.

٢- حکوومەت بریتییە لە خوێندنەوەیەك کە لەودا بە جێگای بایەخدان بە ڕێکخراو و دامەزراوە دەوڵەتییەکان بایەخ دەدا بە کەرتە نادەوڵەتی و تایبەتییەکان و لە هەوڵی پێکهێنانی تایبەتمەندییەکانی وەك وەڵامدەربوون و ڕێکخستن دایە.

٣- حکوومەت زۆرجار وەك بەڕێوەبەری نوێی گشتی چاوی لێکراوە کە لە بەڕێوەبەری گشتی پێشوو جیای دەکاتەوە کە بریتییە لە بەکارهێنان و ڕاگواستنی بنەماکانی بەڕێوەبەری کەرتی تایبەتی بۆ کەرتی گشتی و بەم دوایییانەش وەك پێشکەشکاری پێکهاتە بزوێنەرەکان لەوانە بازاڕە نێوخۆییەکان و کێبەڕکێ بە مەبەستی دابینکردنی پێداویستییە گشتییەکان سەیر کراوە. ئەم ڕوانگەیە لە بەریتانیا لە بۆچوونی گەشەخوازی حیزبی کرێکاری نوێ پاش سەرکەوتن لە هەڵبژاردنی ١٩٩٧ پێکهات. (Short, 1997)

٤- حکوومەت وەك سیستەمێکی سایبرنتیکی کۆمەڵایەتی[3] لێکدەدرێتەوە کە دەوڵەتی ناوەندی و دەوڵەتە خۆجێییەکان و ڕێکخراوەکانی کەرتی تایبەتی بە هاوکاری لەگەڵ یەکتر و لە ڕێگای دانوستان و هاوکاری لە کۆمەڵگادا کاروبارەکان ڕادەپەڕێنن.

(1) Public Adminisration.
(2) New Public Manaement.
(3) Socio-Cybernetic System.



٥- حکوومەت وەك ڕایەڵەکانی خۆبونیاتنەر[1] بریتییە لە پێکهاتەی نوێی هاوکاریی بەربڵاوی کۆمەڵایەتی و تێکەڵکردنی دامەزراوە تایبەتی و گشتییەکان بۆ پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری باشتر، هاوکات لەگەڵ کەمکردنەوەی ڕۆڵی دامەزراوە دەوڵەتییەکان و بردنە سەری ڕۆڵی کەرتی تایبەتی و دامەزراوە نادەوڵەتییەکان.

ئەگەرچی پێناسەکانی ئاماژەپێکراوی سەرەوە خاوەنی زۆر خاڵی هاوبەشن بەڵام هیچ یەك لەوانە بە دروستی شیکردنەوەیەکی گونجاو و هەمە لایەنەیان پێشکەش نەکردووە. ئەگەرچی خاڵی هاوبەش و وێکچوو لە هەندێك لە بیرۆکەکانی باسکراو لە پێوەندی لەگەڵ حکوومەتی دڵخواز هەیە، بەڵام یەك دەنگییەکی گرینگ سەبارەت بە چەمك و تایبەتمەندییەکانی حکوومەتی دڵخواز لە ڕەوتەکانی گەشەسەندن وەك ئەوەی لە وڵاتانی پێشەسازی ڕوویدا، ڕووی نەداوە.

بە تاوتوێکردنی ئەو پێناسە جۆراوجۆرانە لە پێوەندی لەگەڵ چەمکی حکوومەتی دڵخواز پێشکەشکراون، دەتوانین لە ٣٠ دەستەدا پۆلین بەندی بکەین. (Frisch, 1994, p.11-16).

### حکوومەتی دڵخواز لە ڕوانگەی تیۆریی ڕژێمەکانەوە

لە ڕووی ڕوانگەی سیستەمەوە چەمکی ((بەڕێوەبردنی حکوومەت))[2] زۆر بەربڵاوترە لە چەمکی ((حکوومەت)). حکوومەت چاودێرە بەسەر پێکهاتە فەرمییەکان و پێگەی جێگیربووی دەسەڵات و توانایی بڕیاردانی دەوڵەتی مۆدێرن. لە حاڵێکدا ((بەڕێوەبردنی حکوومەت)) ئاماژە بە چۆنیەتی دابەشکردنی دەسەڵاتی سیاسی، ئابووری دەکا. (Lofchie, 1989, p.121)

لە ڕوانگەیەکی ئەوتۆدا، بەڕێوەبردنی حکوومەت لە ڕاستیدا لایەنی داڕشتنی پرۆگرامی حکوومەتە و بنەمای سەرەکی پێکهاتەی سیاسی و ئابووری و پێوەندیی نێوان بەشەکانی حکوومەت پێکدێنێ. بە کورتی ئەم چەمکە ئاماژە بە سیستەمێك لە پێوەندی سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتی دەکا کە بە پێی کۆمەڵێك لە بنەماکان یان ئەو ڕژێمانەی کە ئەندامان لەسەر ڕێککەوتوون، چاودێری دەکرێ. ئەم بنەما و ڕژێمانە بە باشترین شێوە لە لایەن کراسنێر پێناسە کراوە ((ڕژێمەکان کۆمەڵێك لە بنەماکان، شێوازەکان و ئەساسی بڕیاردانن کە چاوەڕوانی یاریزانان لە دەوروبەری ئەوان لە یەکتر نزیك دەبنەوە)). (Krasner, 1985, p.4)

(1) Self-Organizing Networks.
(2) Governance.





بەم جۆرە ئەگەر بمانەوێ بە دوور لە پرس و دەستەواژە تیۆریکەکان قسە بکەین، حکوومەتی دڵخواز بە مانای بنەمای ڕژێمێکی سەرمایەداری دیموکراتیکە کە چاودێرە بەسەر پێوەندی نێوان بەشەکانی دەوڵەتێکی بچووك. (House of Commons Debates, 1990)

وەزیری پێشووی دەرەوەی بەریتانیا، دوگلاس هێرد[1]، ئەم ڕوانگەیەی بەمجۆرە باسکردووە: ((بازاڕەکانی ئازاد، تیجارەتی ئازاد و خاوەندارێتی تایبەتی باشترین شێوازن کە مرۆڤ دەتوانێ لە ڕێگای ئەوانەوە ئاستی ژیان و خۆشگوزەرانی خۆی بباتە سەرەوە. (Hurd, 1990, p.4).

### حکوومەتی دڵخواز وەك سیاسەتەکانی بەشداریکردن و حکوومەتی دیموکراتیك

ئەم مانایە، بە شێوەیەکی ئاشکرا تەئکید لەسەر ئابووری بازاڕی ئازاد لە حکوومەت دەکا. لەگەڵ ئەمەشدا بە ڕاشکاوی پێ لەسەر ئەم خاڵە دادەگرێ کە ڕەوایی و دەسەڵاتی دەوڵەتێك بەهۆی ڕێژەی بەشداریکردنەوەیە. ئەم چەمکەی پێڕەوی لە ئەندێشەی لیبراڵ لەسەر بنەمای جیایی دەزگای یاسادانان، بەڕێوەبەری و قەزایی دەکا و گرینگی بە بابەتەکانی وەك پلورالیزم و هەروەها دەسەڵاتی نوێنەرانی هەڵبژێردراو و توانای کاریگەری ئەوان لەسەر دەزگای بەڕێوەبەری دەدا.

ئەم بابەتانە نەتەنیا ڕوانگەی زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاواییە بەڵکو لە پرۆگرام و پێڕەوی نێوخۆیی یەکیەتی ئەورووپا و ((کۆمیتەی یارمەتی بە گەشەسەندن))[2] کە پێ لەسەر ڕۆڵی گرینگی دیموکراسی و گەشەسەندنی بەشداریخوازانە، وەك توخمی سەرەکی گەشەسەندن دادەگرن، جێگای سەرنجە.

لە پێوەندی لەگەڵ مەرجی وەدەست هێنانی گەشەسەندنی بەشداریخوازانە، UNDP ئاماژە بە چەندین مەرج لەوانە بەشداری گشتی، وەڵامدەربوون، شەفافسازی و حکوومەتەکانی دیموکراتیك و کارامە دەکا.

لەم پێوەندییەدا UNDP پێی وایە تایبەتمەندییەکانی وەك پێکهێنانی یەکسانی، خۆگونجاندن، ئامادەکردنی سەرچاوەکان بۆ مەبەستە کۆمەڵایەتییەکان، کەڵك وەرگرتنی کاریگەر لە سەرچاوەکان، پێکهێنانی یەکسانی ڕەگەزی و یاسایی بە جێگای کۆنترۆڵی توند، کاریگەری لە دەستێوەردانی هەموو لایەنەکانی حکوومەت لە بڕیاردان وەرگرتووە و لە ڕاستیدا

(1) Douglas Hurd.
(2) Development Asistance Committee.



سیستەمەکانی حکوومەتی دڵخوازیان بەشداریخوازانە لێکداوەتەوە و ئەم بنەمایەیان وەك کۆڵەکەی ڕەوایی سیستەمێکی دیموکراتیك دەزانێ. (UNDP, 1997, p.19-20)

زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاوایی ڕایانگەیاندووە کە ئەوان نەتەنیا پشتیوانی لە هەوڵەکانی پێکهێنانی دیموکراسی دەکەن بەڵکو یارمەتی گەشەسەندنی خۆیان بە وڵاتانی داواکار بەستووەتەوە بە دیموکراتیزەکردنی ئەم وڵاتانە.

ئەگەرچی کە وەزیرانی دەرەوەی پێشووی بەریتانیا بە جۆرێك ئاماژەیان بەم بابەتە کردووە بەڵام ئەوەی کە هێرد وتوویەتی خاوەنی ڕاشکاوی و شەفافییەتی زۆرترە. ناوبراو پێی وایە کە: ((بەو جۆرەی لەڕووی ئەخلاقییەوە ئەم سیاسەتە جێگای پەسندە لە کردەوەدا بەم مانایەیە کە دەبێ بە ئاشکرا ڕابگەیەنین کە یارمەتی وڵاتانی دیموکراتیك و هەر جۆرە چاکسازییەك کە لە پێناوی وەڵامدەربوون و دیموکراسی بەڕێوەبچێ، دەدەین و پشتیوانییان لێدەکەین)). (Hurd, 199, p.4)

### حکوومەتی دڵخواز لە پلەی بەڕێوەبەری دروست و کارامە

ئەم پۆلین بەندییە کە جیا لە تێبینی سیاسییە و سنووردارترین خوێندنەوە لە چەمکی حکوومەتی دڵخواز دەگرێتەخۆ، لە ڕوانگەکانی بانکی جیهانی لەم پێوەندییەدا وەرگیراوە. بەو جۆرەی کە لە ڕێککەوتننامەکانی بانکی جیهانی بە ڕوونی ئەم بابەتە ڕاگەیەندراوە:

١- بانك نابێ لە ژێر کاریگەری دەسەڵاتی سیاسی ئەندامانی خۆیدا بێ.
٢- بانك نابێ دەست بخاتە کاروباری سیاسەتی نێوخۆیی ئەندامانی خۆی.
٣- بانك لە پلەی یارمەتیدەرێك نابێ لەو یارمەتییە وەك ئامرازێکی فشار بۆ کارتێکردن لەسەر هەڵسوکەوتی سیاسی وەرگری قەرز کەڵك وەربگرێ.
٤- بەگشتی نابێ بانك بایەخ بدا بە هۆکارە سیاسییەکانی کاتێکەر لەسەر دابینکردنی قەرز.

بە کورتی دەبێ بانك لە بڕیارەکانی خۆیدا بایەخ بە پرەنسیپی باش، وەڵامدەربوون و سەقامگیریی دەوڵەتی داواکاری قەرز بدا و پێوانەی دیاریکردنی حکوومەتی دڵخواز بە پێی ئەم هۆکارانە بێ. لەم پێناوەدا بانك دەبێ بە جێگای پرسەکان و تێبینییە سیاسییەکان بایەخ بدا بە شێوازی بەڕێوەبەری کاروباری ئابووری و بەرژەوەندیی کۆمەڵایەتی گەشەسەندن و توانایی دەوڵەتەکان لە گەڵاڵەکردن و داڕشتنی پرۆگرام و بەڕێوەبردنی سیاسەتەکانی کردەکی.





بە سەرنجدان بەم روانگە سنووردارەی بەڕێوەبەری، حکوومەتی دڵخواز بریتییە لە حکوومەتێك كە خاوەنی تایبەتمەندییەكانی وەك پێشكەشكردنی خزمەتگوزاری گشتی، وەڵامدەربوون، سەربەخۆیی و کارامە بوون، دوور لە ستەم و سەرکوت و لە خزمەتی خەڵكدا بێ. ئەم سیاسەتە لەسەر چوار بابەتی گرینگی بەڕێوەبەری هەمە لایەنە بە گشتی و بە تایبەتی بەڕێوەبەریی کەرتی تایبەتی چڕبووەتەوە و لە دەسەڵات و پڕۆگرامەكانی بانك پێی لەسەر داگیراوە. ئەم چوار بابەتە بریتییە لە:

١- وەڵامدەر بوون: واتە بەرپرسی راگرتنی دەسەڵاتدارانی دەوڵەت بەرامبەر بە هەڵسوكەوتەكانیان.

٢- چوارچێوەی یاسایی بۆ گەشەسەندن: واتە پێكهاتە و كۆمەڵێك لە یاسا كە ببێتە هۆی شەفافییەت، دارشتنی بەرنامە بۆ داهاتوو، سەقامگیریی كەرتی تایبەتی و هەروەها سیستەمی دادوەری.

٣- گەیاندنی زانیاری: بریتییە لە دابینكردنی زانیاریی دروست و لە هەمان كاتدا دەستراگەیشتن بەو زانیارییانە لە پێوەندی لەگەڵ رەوشی ئابووری، بوودجەكان، بازاڕ و ئامانجەكانی دەوڵەت بۆ كەرتی تایبەتی.

٤- شەفافسازی: لە بنەرتدا پێویستی شەفافسازی بردنە سەری ئاستی وەڵامدەری دەوڵەتە، هەوڵدان بۆ لەنێوبردنی گەندەڵی و راوێژكردنی دەوڵەت لەگەڵ كەرتی تایبەتی لە بواری گەڵاڵەكردنی سیاسەتەكانی گەشەخوازی.

دەبێ قەبووڵی بكەین كە لێكدانەوەی حكوومەتی دڵخواز وەك رژێمێك، رێگاچارەیەكی گونجاو بۆ نەهێشتنی كێشە ئاڵۆزەكانی بەڕێوەبەری گەشەسەندن نییە و بە پێچەوانە حكوومەتی دڵخواز لە باشترین و كاملترین مانای خۆیدا وەك بەشێكی گرینگ لە سیاسەتەكانی لە حاڵی سەرهەڵدانی سیستەمی نوێی جیهانییە و بە روونی مۆدێلی پێكهاتەیی لە بیركراوە و سیاسەتە ئابووری و كۆمەڵایەتییەكان كە هەموو ئەندێشەكانی حكوومەتی دڵخواز لە سەری دامەزراوە شتێك نییە جگە لە بیرۆكەی لیبراڵ دیموكراسی رۆژئاوایی كە خاڵی سەرەكی تیۆری مۆدێرنیزاسیۆنە.

بە پێی راگەیەندراوی بانكی جیهانی، مەزەندەكردنی ئەوەی كە بانك تا چ ئاستێك لە پێوەندی لەگەڵ بابەتی حكوومەتی دڵخواز سەركەوتوو بووە، زۆر دژوارە چونكە بەڕێوەبردنی حكوومەت لەڕووی بانكی جیهانییەوە چەمكێكی بەرفراوانە. بەڵام لە نێو ئەو پڕۆژانەی كە



بانك لە پێوەندی لەگەڵ بەڕێوەبردنی حكوومەت گرتوویەتە ئەستۆ، دەتوانین ئاماژە بە نموونەكانی خوارەوە بكەین.

وەگەرخستنی خێرای رەوتی قەزایی لە شیلی، بەراوردكردنی شێوازەكانی خزمەتگوزاری مەدەنی لە زامبیا، یارمەتیدان بە بەتایبەتی كردنی لە ئەرژەنتین، باشكردنی رەوتی بانكی تایبەتی و گشتی لە ئەندۆنزیا، چاكسازیی یاسایی بۆ پشتیوانی كردن لە پەرەپێدانی كەرتی تایبەتی لە ئابووری كۆمارە تازە سەربەخۆوەكانی سۆڤییەتی پێشوو، بەهێزكردنی مافی خاوەندارێتی بۆ گەشەسەندنی كەرتی تایبەتی و بردنە سەری دەسەڵاتی ژنان لە ئەفریقا و هتد... لەو وڵاتانەی كە بانك ئەم جۆرە كردەوانەی ئەنجامداوە، دەوڵەتە تاكەكانی پێشكەشكار وەك بەریتانیا شاهیدی نموونەگەلی بە كردەوەی حكوومەتی دڵخواز بوون و كەوابوو هەوڵیان دەدا هەتا لە بەرەوپێشبردنی پێوانەكانی حكوومەتی دڵخواز لەوانە رەوتەكانی بەشداری كردن، رەوایی دەوڵەتەكان، بردنە سەری ئاستی مافی مرۆڤ و هتد... رۆڵی گرینگی بگێڕن.

وڵاتانی رۆژئاوایی، لە رێگای پڕۆگرامەكانی گەیاندنی یارمەتی خۆیان و لە تەنیشت دامەزراوەكانی كەرتی تایبەتی وەك دامەزراوەی وێست مینیستێر[1] بۆ دیموكراسی لە بەریتانیا، دامەزراوەی نەتەوەیی بۆ دیموكراسی لە ئەمەریكا[2] و ناوەندی نێونەتەوەیی لیبراڵ لە سوید هەوڵیانداوە هەتا لە رێگای پشتیوانی خۆیان لە نوێنەرانی هەڵبژێردراو، یارمەتیدان بە دیاریكردنی چوارچێوەی یاساكانی هەڵبژاردن و یارمەتیدان بە وڵاتان لە بەڕێوەبردنی هەڵبژاردنەكان، هەوڵدان بۆ زیادكردنی حیزبە سیاسییەكان و بەهێزكردنی سیاسەتی گشتی و فێركردنی گشتی، یارمەتی بە چوونە سەری ئاستی دیموكراسی لەم وڵاتانەدا بكەن.

كێشەیەك كە لەم پێوەندییەدا هەیە سەرهەڵدانی دامەزراوە بەربڵاوەكانن كە هیچ قازانجێكیان بۆ توێژی هەژار نییە. لە حاڵێكدا گرینگی پێكهێنانی حكوومەتی دڵخواز و هەوڵدان بە مەبەستی پشتیوانی لەو وڵاتانەی كە لەم بوارەدا بەرەو پێش دەچن، هەروا بەهێز ماوەتەوە. هەندێك لە وڵاتان وەك بەریتانیا لە پێوەندی لەگەڵ رێگاچارەی كێشەی سەرەوە ئاماژە بەم پرسە دەكەن كە ئەم بابەتە دەتوانرێ لە رێگای هاوكاری نێوان حكوومەتی ناوەندی، حكوومەتی خۆجێیی، حكوومەتی شاری و بەرهەمهێنەرانی كەرتی تایبەتی و رێكخراوە نادەوڵەتییەكان نەهێڵن.

(1) West Minister Foundation.
(2) National End owment for Democracy.





## دەرئەنجام

سەرەڕای بوونی هەوراز و نشێو و سوود و زیانەکانی لیبراڵ دیموکراسی کە بناغەکانی حکومەتی دڵخوازی دامەزراندووە، چ کەسێك ئەگەری ئەوەی هەیە لەگەڵ حکومەتی دڵخواز تەنانەت لە چەمکی سنوورداری بەڕێوەبەری ئەو دژایەتی بکا؟ کەوابوو جێگای خۆیەتی کە لە هەوڵەکانی روو لە گەشەی وڵاتانی رۆژئاوایی و دامەزراوەکانی گەشەسەندن لە پێوەندی لەگەڵ بایەخدان بە حکومەتی دڵخواز پێشوازی بکرێ.

ئایا ئەم بابەتە ئەوەندە گرینگ نییە کە هەر کۆمەڵگایەك چ لیبراڵ و چ سۆسیالیست لە خزمەتگوزاری گشتی باشتر (کە تایبەتمەندییەکانی بریتییە لە کێبەرکێ، کارلێهاتوویی، دڵنیایی، رێك و پێك بوون، وەڵامدەربوون و سیستەمی دادوەریی خێرا و سەربەخۆ و عادیلانە)) سوودمەند بێ؟

کەوابوو بۆ گەیشتن بەم مەبەستە، لانیکەم بایەخدان بە چەمکی سنوورداری بەڕێوەبەری حکومەتی دڵخواز پێویستە و نابێ چاوپۆشی لێبکرێ.

تەنانەت لە بارودۆخی دڵساردکەرەوەی جیهانی سێهەم، پێکهێنانی حکومەتی دڵخواز لە مانای سنوورداری ئیداری و بەڕێوەبەری لە حکومەتەکانی ئێستا باشتر و بە کەڵکترە.

دیارە دەبێ بڵێین کە جۆری هەڵسوکەوتی بەڕێوەچوو بە مەبەستی پێکهێنانی حکومەتی دڵخواز بە شێوەی فراوانتر نیهادسازی و تواناسازی گرینگە. زۆربەی نوسخە پێشکەشکراوەکانی حکومەتی دڵخواز، کاڵ و کرچ بوون و دوورە دیمەنێکی روونی نەبووە. بەبێ لەبەرچاوگرتنی سیاسەت، هیچ رێژەیەك لە نیهادسازی یان فێرکردن بەو جۆرەی کە دەبێ، نابێتە هۆی پێکهاتنی چوارچێوەو رژێمێکی حکومەتی دڵخواز. (World Band, 1991)

سەرەڕای ئەمەش، داهێنانە ئاڵۆزەکانی رێکخراوەیی و خزمەتگوزاری باشی گشتی ئەگەر لە لایەن دەوڵەتەوە پشتگیری لێنەکرێ و لە چوارچێوەی سیاسەتەکانی دەوڵەتدا نەبێ، سەرکوت دەکرێ و لە بەرامبەریدا خۆراناگرێ. تەنانەت پێکهێنانی دیموکراسی پەرلەمانی لە فیلیپین پاش ساڵی ١٩٨٦ هیچ گەرنتییەکی بۆ پێکهێنانی حکومەتی دڵخواز نەبووە و یان چاوەڕوانی



پێکهێنانی حکومەتی دڵخواز و گەشەکردوو لە وڵاتانێك وەك هائیتی، میانمار و زائیر بەبێ پێکهێنانی گۆڕانکاری بنەڕەتی سیاسی کە پێویستی حکومەتێکی دڵخوازە هەڵەیە. نەبوونی پرۆگرامێك بە مەبەستی چاکسازی خزمەتگوزاری مەدەنی لە غانا نموونەیەکی دیکەیە لەم پێوەندییەدا. ئەم پرۆگرامانەی کە لە ساڵەکانی ١٩٨٦ هەتا ١٩٩٢ وەك بەشێك لە بەرنامەی چاکسازی خزمەتگوزاری مەدەنی لەلایەن دەوڵەتی بەریتانیاوە پشتیوانی لێ دەکرا، لە هەوڵی پێکهێنانی خزمەتگوزارییەکی مەدەنی گشتی، کارلێهاتوو و لۆژیکدا بوو کە لەڕووی مێژووییەوە کۆن چاوی لێدەکا.

پرۆگرامی چاکسازی ئاماژەپێکراو بە سەرنجدان بە بەراوردی ئیدارەی دەرەوەی وڵاتانی خاوەن بەرژەوەندی هاوبەش تەنیا سەرکەوتنێکی زۆر کەمی بە دواوە بووە. ئەم ئاکامە نیشانی دەدا کە ئەم چاکسازییە لە دەرەوە رێنوێنی دەکرێ و بەڕێوەچوون و نیشاندەری پابەند نەبوونی زۆربەی نوخبەکانی غانا بوو. بە کورتی تەنانەت بەرگری کەمی سیاسی دەوڵەتەکان دەیتوانی ئاکامی پرۆژەکە بە شێوەی دراماتیك بێ کەڵك بکا.

دژ کردەوەی سەرۆك کۆماری پێشووی سریلانکا لە وەڵامی پرسیاری لێکۆڵەرێك لە پێوەندی لەگەڵ ئەوەی بۆچی چاکسازی مەدەنی جێبەجێ نەکرا؟ پشتگیرییەکە بۆ بۆچوونەکەم سەبارەت بە رۆڵی سیاسەت وەك سەرەکیترین و گرینگترین هۆکار لە پێکهێنانی حکومەتی دڵخواز. چونکە ناوبراو لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا ئاماژە دەکا کە:

سەرەڕای شەڕێکی نێوخۆیی قەومی لە باکووری وڵات و شەڕێکی نوێی لە حاڵی پەرەسەندن لە باشووری وڵات و هەڕەشەکانی وڵاتی دراوسێی هیند چۆن دەتوانین بیر لە بەڕێوەبردنی چاکسازی بکەین؟ (Turner, 1997, p.235)

زیمبابۆی دوایین نموونەیە کە لەم پێوەندییەدا جێگای سەرنجە. ئەم وڵاتە پاش ئازادبوونی لە حکومەتی کەمینەی سپی پێست لە ١٩٨١، سیستەمێکی خزمەتگوزاری مەدەنی کارامە بەڵام رەگەزپەرستی بە میرات بۆ بەجێما. بە درێژایی دەیەیەك لە دەسپێکردنی چالاکی دەوڵەتی نوێ، پێکهاتە تازەکان بووە هۆی زیادبوونی گەندەڵی لە نوخبەکاندا کە ئاکامی گۆڕانکاری سیاسی پاش ئازادی و سەرهەڵدانی هێزە نوێیەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە پرۆسەی سیاسیدا بوو.

لەم فەسڵەدا ویستم بیسەلمێنم، ریشەکان و هۆکارە کاریگەرەکان لەسەر حکومەتی دڵخواز لایەنی سیاسی هەیە و سەرکەوتن و شکست لە پێکهێنانی حکومەتی دڵخواز بەستراوەتەوە بە هۆکارە سیاسییەکان.

فێرکردن، نیهادسازی، بردنە سەری تواناییەکان، هەموو لە پێناوی باشکردنی بارودۆخە و بێگومان هەریەك لە وڵاتەکان و تەنانەت هەریەك لە دامەزراوەکان دەتوانن لە بوونیان سوودمەند بن. بەڵام پێویستە هەتا ئەم راستییە تاوتوێ بکرێ کە ئایا ئەم هەڵوێستانە هیچ کاریگەرییەکی لەسەر فەرهەنگی سیاسی گشتی و رەوتی سیاسی بەتایبەت لەو وڵاتانەی کە بوودجەی پێویستیان بۆ ئەم کارە نییە، هەیە؟

بۆ نموونە، وەزارەتی گەشەسەندنی نێونەتەوەیی بەریتانیا[1] لە ساڵەکانی **١٩٩٨-١٩٩٩** تەنیا نزیکەی **٢٩** ملیۆن پۆند بۆ پڕۆژەکانی تایبەت بە پێکهێنانی حکوومەتی دڵخواز و باشکردنی رەوشی مافی مرۆڤ وەك یەکێك لە ئامانجە سەرەتاییەکانی خۆی لە سەرتاسەری جیهاندا تەرخان کردووە. تەنانەت زۆربەی ئەم بوودجەیە بە شێوەیەکی بەرچاو بۆ ئەو پڕۆژانە تەرخان کرابوون کە ئەگەرچی لەودا حکوومەتی دڵخواز و مافی مرۆڤ لەبەرچاو گیرا بوون بەڵام وەك ئامانجی سەرەکی ئەو پڕۆگرامە نەبوو. (DFID, 1999).

سەرەڕای بوونی ژمارەیەکی زۆر لە وڵاتانی داواکاری یارمەتی، کاریگەری ئەم رێژەیە لە بوودجە، سروشتییە کە ناتوانێ زۆرگرینگ بێ و ئەو بەراوردانەی لەم پێوەندییەدا کراون ئەم باسە دەسەلمێنێ.

دامەزراوەی وێست مینیستێر بۆ دیموکراسی، بە بوودجەی ساڵانەی زۆر کەم نزیکەی ٤ میلۆن پۆند کە لە بەشی دەرەوە وەردەگیرێ و بۆ کاروباری پێوەندیدار بە پێکهێنانی حکوومەتی دیموکراسی تەرخان دەکرێ، سروشتییە کە ناتوانێ لەو پێوەندییەدا رۆڵی گرینگ بگێڕێ.

سەرەڕای ئەمەش، لێکۆڵینەوەکانی بەڕێوەچوو سەبارەت بە **٢٩** وڵات کە لە پڕۆگرامەکانی یارمەتی وڵاتانی بەریتانیا، سوید، ئەمەریکا و یەکیەتی ئەورووپا لە ساڵەکانی **١٩٩٠-١٩٩٥** بە مەرجی پێکهێنانی دیموکراسی و رێزلێنان لە مافی سیاسی و مەدەنی هەڵکەوتوون، نیشان دەدا کە گەمارۆکانی پێوەندیدار بە یارمەتیدان تەنیا لە هەندێك حاڵەتی زۆر کەمدا کاریگەر بووە. (Carford, 1997, p.103)

بەگشتی دەبێ بڵێین کە بەبێ بوونی مەرجی پێویست کە بریتییە لە ئیرادەی سیاسی و توانایی سیاسی لە وڵاتانی وەرگری یارمەتی، کردەوەیەکی ئەوتۆ ناتوانێ کاریگەری گرینگ لەسەر حکوومەتی وڵاتانێك وەك ئەندۆنزیا، نایجریا یان فەرهەنگە سەرکوتکەرەکان لە وڵاتێك وەك کینیا و هیند دابنێ.

ئەگەرچی زاڵبوون بەسەر کێشە لە حاڵی گەشەی هەژاری، نەخوێندەواری و نەخۆشی وەك بەشێك لە ئامانجی راستەقینە چاو لێدەکرێ بەڵام هەوڵدان بۆ پێکهێنانی حکوومەتی دڵخواز

(1) Department for International Development.



لەو وڵاتانەی کە ئیرادە سیاسییەکەی وەرگری ئەم گۆڕانکارییانە نییە و دەسەڵاتی هێزە کۆمەڵایەتییە بە نفوزەکان بە ئاسانی دەتوانن وەلایان بنێن و بە ئاسانی دامەزراوە و یاسا فەرمییەکان لەبەر چاو نەگرن، بە ئامانج ناگا.

ئەم بابەتە بەتایبەت سەبارەت بەو وڵاتانەی کە سیاسەتەکانیان لەسەر بنەمای جێگیرکردنی دەسەڵات، دۆستایەتی، ئازادی کردەوە و کێبەڕکێ لە ناوەنددا نییە هەتا ئامانجی گەشەخوازیی چ لە رێگای پێکهێنانی رەوشی هەڵدانی ئابووری و چ رێکخستنی راستەوخۆ یان بەهۆی تێکەڵاوێك لە هەردووی ئەمانە دەستەبەر بکرێ، هەست پێکراوتر دەبێ.

پرسیارێك کە دێتە گۆڕێ ئەمەیە کە چ شتێك دەتوانێ حکوومەتی دڵخواز بهێڵێتەوە؟

هەروەك پێشتر ئاماژەم پێکرد پاشگرێکی تایبەتی بە چەمکی حکوومەتی دڵخواز هەیە کە بریتییە لە ((حکوومەتی دڵخوازی دیموکراتیك)) کەوابوو ئەمە دیموکراسییە کە دەتوانێ رۆڵی کەرەستەیەکی راگر بگێڕێ کە حکوومەتی دڵخواز لە جێگاکەدا سەقامگیر بکا.

هەرچەند بانکی جیهانی نەیتوانی ئەم رەوشە پێك بێنێ بەڵام وڵاتانی رۆژئاوایی و رێکخراوەکانی دیکە هەروەك تا ئێستا لە هەندێك حاڵەتدا سەرکەوتوو بوون، دەتوانن ئەم رەوشە پێك بێنن.

ئاکامەکەی ئەوەیە کە دیموکراسی وەك رەوتێکی سیاسی دەتوانێ حکوومەتی دڵخواز نیهادینە بکاو دەوڵەت و کارمەندەکانی بە وەڵامدەری بهێڵێتەوە و باشترین و بەرزترین ستاندەری خزمەتگوزاری گشتی پێشکەش و مافی مرۆڤ گەرەنتی بکەن.

بە سەرنجدان بەم راستییە چ کەسێك ئەگەری ئەوەی هەیە دژایەتی لەگەڵدا بکا؟ ئایا جگە لە نەیارانی چاکەکان کەسێك دەتوانێ دژی دیموکراسی بێ؟

چ کەسێك ئەگەری ئەوەی هەیە دژایەتی ئامانجی روو لە هەڵدانی بەهاکانی دیموکراسی و ئازادییە مەدەنییەکان، حکوومەتی یاسا، حکوومەتی دڵخواز و پێکهێنانی کۆمەڵگای مەدەنی ئاسایش و چالاك بکا؟

ئاوڕدانەوەیەك بە دەوروبەری جیهان نیشانی دەدا کە لە کۆتایی دەیەی ٨٠ و ٩٠ی زایینی، جارێکیتر دیموکراسی لە هەموو شوێنێك کەوتبووە گەڕ. بەڵام پرسیارێك کە لێرەدا دێتە گۆڕێ ئەمەیە کە ئایا ئەم دیموکراسییە بەردەوام دەبێ؟ ئایا دیموکراسی لە بارودۆخی زاڵ بەسەر ولاتانی جیهانی سێهەم ئەگەری دەستەبەرکردنی هەیە؟ لە پێوەندی لەگەڵ ئەم پرسیارانە لە فەسڵی دواییدا ئاماژەی پێدەکەم.





# فەسڵی شەشەم

## سیاسەتی حکوومەتە دیموکراتیکەکان لە جیهانی سێهەمدا

### پێشەکی

گرینگترین ئەسڵی فیکریی نیوئۆرتۆدۆکس کە لە دەیەی ٩٠ دروست بوو و تەواوی سیاسەتەکانی گەیاندنی یارمەتی دەوڵەتی رۆژئاوا و بیرۆکەکانی گەشەسەندنی خستبووە ژێر کاریگەری خۆیەوە، ئەم بانگەشەیە بوو کە ((دیموکراسی)) و ((حکوومەتی دڵخواز)) نەتەنیا دڵخوازی گەشەسەندنە، بەڵکو رەوشێکی پێویست بۆ دەستەبەرکردنی گەشەسەندن لە تەواوی کۆمەڵگاکانیشدا هەیە.

حکوومەتی دڵخوازی دیموکراتیك کە لە تێکەڵکردنی دوو وشە ((حکوومەتی دڵخواز)) و ((دیموکراسی)) پێك هاتووە، بە گشتی ئاماژە بە جۆرێك لە رژێمی سیاسی دەکا کە بە پێی مۆدێلی نوێنەرایەتی دروست بووە و خاوەنی حکوومەتی لیبراڵ دیموکراتیکی لاینگری مافی هاووڵاتییان و مافی مرۆڤە و لەگەڵ ئەوەشدا خاوەنی دەوڵەتێکی ساڵم، کارامە و وەڵامدەرە لە بەرامبەر بیروڕای گشتیدا. (Chalker, 1991)

سیستەمە سیاسییەکان بەم تایبەتمەندییانەوە، بۆ ئابووریيە کێبەرکێیەکانی و لەسەر بنەمای بازاڕی ئازاد، زۆر بە کەڵك و کارامەن. لاینگرانی بیرۆکەی نیوئۆرتۆدۆکس دەڵێن کە سیستەمەکانی سەرمایەداری دیموکراتیك بەم تایبەتمەندییانەوە، جیهانێکی ئاشتیخواز، دوور لە جەنگ و بەختەوەر پێك دێنن، چونکە ئەم جۆرە سیستەمانە بە باشترین شێوە دەتوانێ بوارەکانی هەڵدانی ئابووری برەخسێنێ و هیچکات لەگەڵ یەکتر تووشی شەڕ نابن (Doyle, 1983) بە گشتی ئەم بیرۆکەیە لەسەر ئەم گریمانە بنەڕەتییە و زۆرجار نەگوتراوە دامەزراوە کە: هەرچەند ئەم شێوازە سەرچاوەی رۆژئاوایی هەیە، بەڵام بە شێوەیەکی بەرفراوان پێوەندی بە پرسەکانی گەشەسەندن لە تەواوی فەرهەنگەکان و کۆمەڵگاکان لە جیهاندا هەیە. بە واتایەکی دیکە، دیموکراسی و ((حکوومەتی دڵخواز)) بە تەواوی پێکەوە بەستراون و پێکەوەش رەوشی پێویست بۆ گەشەسەندن پێك دێنن.



دیارە ئەم جۆرە بۆچوون و بیرۆکانە زۆریش نوێ نین. ئەم بیرۆکانە لە راستیدا رەنگدانەوە و شیکردنەوەی لایەنە جۆراوجۆرەکانی بیرۆکەی مۆدێرنیزاسیۆنە لە دەیەی ٦٠دا، کە پێی وابوو لیبڕالیزمی سیاسی و ئابووری رۆژئاوا وێنەی کۆمەڵگای دڵخوازە. (Lipset, 1960, p.403) و بووەتە هۆی دروست بوون و هاوگەرایی بەربڵاوی مێژوویی نێوان شێوازە جیاوازەکانی گەشەسەندن. (Lerner 1958, Rostow 1960, Almond 1960, Eisenstadt 1966, Kerret Al 1973).

دیارە شایانی وەبیرهێنانەوەیە کە لە جیهانی پاش جەنگ و لە ژێر رێبەرایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان، جیهانی رۆژئاوا زۆر لە مێژە کە بە شێوەی فەرمی پابەندە بە گەشەسەندن و دیموکراسی و مافی مرۆڤ کە بووەتە یەکێك لە ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوەی خۆی. (White Head, 1986) لە راستیدا ئەم بابەتە لە سەرەتادا لە چوارچێوەی پرۆگرامی یارمەتی ترومەن بۆ یۆنان و تورکیا لە ساڵی ١٩٤٧ بەڕێوەچوو کە بەشێك لە سیاسەتی گشتی پەرپێدانی رژێمە دیموکراتیکەکان لە بەرامبەر مەترسی کۆمۆنیزمدا بوو. (Packenham, 1973, p.49-25) دواتریش لە سەرەتای دەیەی ١٩٦٠ سەرۆك کۆمار کەنەدی هەوڵیدا هەتا ئەم سیاسەتە لە ئەمەریکای لاتین لە رێگای پرۆگرامی ((یەکیەتی بۆ پێشکەوتن))[1] پیادە بکا. (Furlong, 1980).

بەڵام دەبێ ئەوەمان لەبەرچاو بێ کە تەنانەت لەم پرگرامەدا هەڵدانی ئابووری-کۆمەڵایەتی وەك مەرجی پێویست بۆ پێکهێنانی سیاسەتە دیموکراتیکەکان لەبەرچاو گیرابوون و پێیان وابوو کە دیموکراتیزاسیۆن بەبێ گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی و ئابووری لەبار و گونجاو، شانسی زۆر کەمی بۆ سەرکەوتن هەیە.

بەڵام بە کردەوە ((بەڵێنی دیموکراتیك)) تەنیا لە قسەدا مایەوە و لە بواری پراکتیکدا هیچ رەنگدانەوەیەکی نەبوو. (Furlong, 1980, p.18) پاش ئەوەی کە، لە ناوەڕاستی دەیەی ٦٠ شەپۆلێك لە حکوومەتە سەربازییەکان لە ئەمەریکای لاتین هاتنە سەرکار، ئامانجی سیاسی ئەم یەکیەتییەش (یەکیەتی بۆ پێشکەوتن) لەگەڵ شکست رووبەڕوو بوو. (ژمارەی دیموکراسییەکان لە ئەمەریکای لاتین لە دەیەی ٨٠ زۆر کەمترە لە، ژمارەی ئەو لە دەیەی ٦٠) سەرەڕای ئەمەش بە بەهێزبوونی شەڕی سارد و زیادبوونی نیگەرانی لە بڵاوبوونەوەی کۆمۆنیزم، وادێتە بەرچاو کە ویلایەتە یەکگرتووەکان و وڵاتانی رۆژئاوایی بەرامبەر بە

(1) Alliance for Progress.





ناکارامەیی و گەندەڵییەکانی حکوومەتە نادیموکراتیکەکان لە وڵاتانی روو لە گەشە، کەمتەرخەم بوون. دیارە گەیاندنی یارمەتی و پشتیوانی لە دەوڵەتەکان هەتا ئەو ئاستە بەردەوام بوو کە دەوڵەتەکان بەرامبەر بە بەرژەوەندی ویلایەتە یەکگرتووەکان هەروا وەفادار بن.

لە پاساوی یارمەتییەکانی ئەمەریکا بۆ ئەم جۆرە رژێمانە کە سەرەڕای وەفادارییان بە ویلایەتە یەکگرتووەکان خاوەنی حکوومەتی نادیموکراتیکن، یەکێك لە سەرۆك کۆمارەکانی ئەمەریکا لە وتەیەکدا، گرینگترین خاڵی سیاسی لەم یارمەتیدانەی باس کرد: ((رەنگە ئەوان حەرامزادە![1] بن، بەڵام لانیکەم حەرامزادەیەکن کە بە ئێمە وەفادارن)).

لە راستیدا لەسەرتاسەری دەیەکانی ٧٠ و ٨٠ یارمەتییەکانی دەوڵەتی بە مەبەستی گەشەسەندن))[2] -لە تەنیشت یارمەتی سەربازی- ئازادانە و بەبێ هیچ لەمپەرێك دەنێردران بۆ رژێمە نادیموکراتیکەکان وەك ئیلسالوادۆر، هیندوراس، زئیر، کینیا، پاکستان و فیلیپینی ژێر دەسەڵاتی مارکۆس، جێگای سەرنجە کە زۆربەی ئەوانە رابردوویەکی زۆر خراپیان لە پێوەندی لەگەڵ مافی مرۆڤدا هەیە.

کۆی ((یارمەتییەکانی دەوڵەتی بۆ گەشەسەندن)) کە لەو ساڵانەدا بۆ وڵاتانی ئاماژەپێکراو دەنێردران، بە پێی ژمێریارییەکان و بە پێی رێژەیەك لە بەرهەمی ناپاڵفتەی نەتەوەیی ئەو وڵاتانە، تەنانەت لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٦ بەم شێوەی خوارەوە بوو.

ئیلسالوادۆر ٩,٢٪ لە GNP، پاکستان ٢,٩٪ لە GNP و فیلیپین ٣,٢٪ لە GNP.
(OECD, 1984, Humana, 1987, 1992 World Banl 1998, Table: 22)

کەوابوو ئەگەرچی بەڵێنی رۆژئاوا بۆ گەشەسەندنی دیموکراسی و باشکردنی مافی مرۆڤ پرسێکی نوێ نییە، بەڵام ئاشکرایە کە دەوڵەتە رۆژئاواییەکان لەم پێوەندییەدا زۆر بە پارێزەوە هەڵسوکەوتیان کردووە و باسەکان لەم پێوەندییەدا زۆرتر لەژێر کاریگەری تێبینییەکانی بەرژەوەندی نەتەوەیی کە لە چوارچێوەی ئاسایشی جیهانی و ناوچەییدا دەردەکەوێ- و بەرژەوەندی ئابووری ئەواندا بووە.

بابەتی سەرەکی کە زۆرجار بە سانایی لەژێر پەردەی تیۆرییەکانی هەڵکێشان و وتە فەرمییەکان شاردراونەتەوە، ئەمەیە کە لە باشترین حاڵەتدا ((بڵاوبوونەوەی دیموکراسی)) وەك ئامانجێکی سیاسەتی دەرەوە هیچ کات لە نێوان ئامانجەکانی دیکەدا، گرینگی زۆرتری نەبووە.

(1) Son of the Bitch.
(2) ODA: Official Development Assistance.



(White Head 1986, p.44). ئەم لێکدانەوەیە جارێکی دیکە لە سەرەتای دەیەی ٩٠، بەهۆی لێکۆڵینەوەیەك کە لە پێوەندی لەگەڵ کاریگەری رەوشی سیاسی لە یارمەتییەکانی دەرەوە بەڕێوە چووبوو، سەڵمێندرا. ئەم لێکۆڵینەوەیە نیشانیدا کە نموونەیەکی دیار و ئاشکرا سەبارەت بە پێڕەوی کردنی دوو هۆکاری مافی مرۆڤ و دیموکراسی لە پرسە گرینگەکانی دیکەی سیاسەتی دەرەوە بە تایبەتی بەرژەوەندی ئابووریدا هەیە. (Crawford, 1997, p.71). لەگەڵ ئەمانەشدا بابەتێك کە لە دەیەی ١٩٩٠دا، نوێ دەهاتە بەرچاو و پێیان لەسەر دادەگرت، هێنانە بەرباسی ئەم پرسە بوو کە دیموکراسی مەرجی پێویست و سەرتایی گەشەسەندنە، نە ئاکام و دەستکەوتەکانی.

بەجۆرە رەوانگەی جارێکی دیکە سەرنجی دایە بانگەشە سەرەتاییەکانی خۆی لە تیۆری مۆدێرنیزاسۆن، کە پێی وابوو بۆ پێکهێنانی دیموکراسی سەقامگیر، گەشەسەندنی ئابووری و کۆمەڵایەتی سەرەتایی پێویستە، راستییەك کە لە زۆربەی وڵاتانی گەشەکردووی ئێستا — نەهەمووی ئەوانە— رووی داوە. لەم وڵاتانەدا گەشەسەندن و بڵاوبوونەوەی پیشەسازی بە شێوەی ئاسایی پێش لە رەوتی دیموکراتیزاسیۆن دروست بوون.

سەرەڕای ئەمەش، بە پێچەوانەی ئاکامی زۆری لێکۆڵینەوەکانی بەڕێوەچوو سەبارەت بە گەشەسەندن لە لایەن زانایانی سیاسی قوتابخانە جۆراوجۆرەکان ( Hyden 1985, Huntington 1987, Standbrook 1990). روانگەی نوێ پێی وایە کە هیچ کات گرژی یا بە گژداچوونەی بەردەوام لە نێوان ئامانجە جۆراوجۆرەکانی گەشەسەندن وەك هەڵدان، دیموکراسی، سەقامگیری، عەداڵەت و سەربەخۆیی نەبووە.

لە بەیاننامەکان و سیاسەتەکانی راگەیاندنی زۆربەی حکوومەتە رۆژئاواییەکان لە دەیەی ٩٠یش ئەم پرسە روون بوو کە ئەوان هیچ پێشمەرجێکیان بۆ دیموکراسی بەردەوام لەبەرچاو نەگرتووە و پێیان وابوو کە دیموکراسی دەتوانێ تاڕادەیەك لە هەر قۆناغێك لە رەوتی گەشەسەندن لە هەر کۆمەڵگایەکدا نیهادینەبێ و ببێتە هۆی بەهێزبوونی رەوتی گەشەسەندن. ئەم گریمانەیە لە دەیەی ٩٠، بە پێداگری هەرچی زۆرتری وڵاتانی رۆژئاوایی لەسەر دیموکراتیزاسیۆن و باشکردنی مافی مرۆڤ لە وڵاتانی وەرگری قەرز، وەك پێشمەرجی پێویست بۆ گەیاندنی یارمەتی بەم وڵاتانە، بە ئاشکرا تەئکیدیان لەسەر دەکرد.

لەم رووەوە، گرینگترین پرس ئەمە نییە کە ئایا سیاسەتە دیموکراتیکەکان وەك بەشێك لە چەمکی بەربڵاوی ((حکوومەتی دڵخوازی دیموکراتیك)) دەبێتە هۆی پێشکەوتن و گەشەسەندن





لە وڵاتانی جیهانی سێهەم و ناوچەکانی دیکە یان نە؟ بەڵکو پرسیاری سەرەکیتر ئەمەیە کە ئایا ((شەپۆلی سێهەم))ی دیموکراتیزاسیۆن (Huntington, 1991) بەردەوام دەبێ و بە ئاکام دەگا یان نە؟

لەم فەسڵە باسی ئەوە دەکەم، کە جێژنی سەرکەوتوانەی شۆڕشی جیهانی دیموکراتیك، کە لە کۆبوونەوەی سەرانی ((گرووپی ٧))[1] لە ساڵی ١٩٩٠ لە هۆستۆن، دەستی پێکرد، زۆر بە پەلە و پێش لە کاتی خۆیدا بوو. ژمارەیەکی کەم لە نوخبەکانی جیهانی سێهەم کە پێشتر کۆنترۆڵی سیستەمە سیاسییە نادیموکراتیکەکانیان بەدەستەوە بوو، بە تامەزرۆیی یان بەڵێنی، دیموکراسییان قەبووڵ کرد. تەنانەت لە نێو ئەو وڵاتانەی کە نارەزایەتی و خۆپێشاندانی خەڵکی ببووە هۆی پێکهێنانی دیموکراسی لە ڕژێمە سەرکوتکەرەکانی پێشوو، ژمارەیەکی زۆر کەم لەوان هەبوون کە مەرجی هێشتنەوەی دیموکراسییان هەبوو. خاڵی سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە لەم وڵاتانە لە پێوەندی لەگەڵ گرینگترین کۆڵەکەکانی دیموکراسی وەك چەمکەکانی هەڵبژاردن و نوێنەرایەتی کردنیش کۆدەنگییەك لە ئارادا نەبوو. (Diamond, 1999, p.89).

یەکێکی دیکە لە گریمانە سەرەکییەکانی ئەم فەسڵە ئەمەیە کە، بەجۆرە لە حاڵی حازردا دەبێ چاوەڕوانی سەرهەڵدانی توندوتیژی سیاسی لە زۆربەی دیموکراسییە تازەپێگەیشتووەکاندا بین، کە بۆخۆم بووەتە هۆی لاوازی ڕەوتی هەڵدان و گەشەسەندن و کودەتا سەربازییەکان لە دەیەی سەرەتای سەدەی ٢١دا بە دوادا دێ. بە کورتی دەتوانین بڵێین کە ئێمە پێ دەنێینە سەردەمێك کە بەرچاوترین تایبەتمەندی ئەو ڕەوتی پێچەوانەی دیموکراتیزاسیۆنە هەتا ڕەوتی بەردەوامی دیموکراتیك. بەڵام لە سەرەتادا پێویستە کە هۆکارەکانی گۆڕانکاری و ئاڵوگۆڕە لە ناکاوەکان لە سیاسەتەکانی وڵاتانی ڕۆژئاوایی بۆ پشتیوانی لە دیموکراسی لە وڵاتانی ڕوو لە گەشە تاوتوێ بکرێ.

دیموکراسی: لە دەستکەوتێك بۆ گەشەسەندن، هەتا مەرجێکی پێویست بۆ وەدیهێنانی لە زۆر بابەتی سەرەکیدا ڕوانگەی نوێی زاڵ دیسانەوە بە هەمان بنەمای سەرەتایی خۆی گەڕایەوە، بیرۆکەیەك کە لە زۆربەی تیۆرییە کۆمەڵایەتییەکانی ڕۆژئاوایی و زۆربەی شێوازە ئیمپریالیستەکانی دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان پەرەی ئەستاند و لە باسەکانی پێوەندیدار بە گەشەسەندن لە فەسڵی ٢دا لەژێر ناوی مۆدێرنیزاسیۆن ئاماژەمان پێکرد.

(1) G. 7.



ئەم بیرۆکە کۆنە پێی وابوو کە زۆر ناوچە کە پێی دەڵێن ((گەشە نەکردوو)) ((دواکەوتوو)) و ((جیهانی کۆلۆنیالیزم))، ئامادەیی پێویستی بۆ دیموکراسی نییە و پێش ئەوەی کە دامەزراوە و لایەنەکانی دیموکراسی لەم ناوچانە پێك بێ، بە ڕێژەیەکی بەرچاو پێویستی بە پێشکەوتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕێنوێنی سیاسی هەیە. (Lee, 1967, p.3-171). کاریگەریی ئەم بیرۆکەیە لە لێکۆڵینەوەکانی پێوەندیدار بە زانستی سیاسی لە دەیەی ٦٠ و سەرتر لەوەش بە باشی هەست پێدەکرێ. لە ڕاستیدا، لە دەیەی ٦٠ لە خوێندنەوەکانی پێوەندیدار بە سیاسەتەکانی بەراوردکردن بە شێوەیەکی بەربلاو ئەم گریمانەیە لەبەرچاو دەگیرا کە دیموکراسی لە مۆدێرنیتە جیا نابێتەوە کەوابوو وەك دەستکەوتی گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی-ئابووری لەبەرچاو دەگیرا نەك یەکێك لە مەرجە پێویستەکانی.

بە پێی ئەم بیرۆکەیە دەستەبەرکردنی دیموکراسی پێویستی بە هۆکارەکانی خوارەوە هەیە:

ئاستی سەرەوەی خوێندەواری، پێوەندی گرتن و فێرکردن، بوونی چینی نێونجی کۆمەڵایەتی بەهێز و کارلێهاتوو، کۆمەڵگای مەدەنی چالاك و هەڵسوور، شێوازەکانی سنوورداری نایەکسانی کۆمەڵایەتی و ماددی. (Dahl, 1971). و ئایدۆلۆژیای گشتی سێکولار لە کۆمەڵگادا.

بەپێی ئەم بیرۆکەیە تەواوی هۆکارەکانی سەرەوە بەرهەمی گەشەسەندنی ئابووری بوون، کە لەگەڵ خۆیاندا مەرجی پێویست بەڵام نەك تەواویان بۆ دیموکراسی سەقامگیر پێك دەهێنا. ((لیپست))[1] لە ڕەستەیەکی کلاسیکدا ئاکامی لێکۆڵینەوەکانی خۆی لەم بوارەدا بەجۆرە باس دەکا: ((هەرچەند نەتەوەیەك گەشەکردووتر بێ، بە هەمان ڕێژەش دەرەتانی بەردەوامی و هێشتنەوەی دیموکراسی لەنێو ئەو نەتەوەیەدا زیاتر دەبێ)). بەم دواییانەش ئاماژە بەوە دەکرێ کە چینی کرێکاری ڕێکخراو (کە بۆ خۆی بەرهەمی هەڵدانی پیشەسازییە) بە هەمان ڕێژە لە پەرەپێدان و پشتیوانی لە دیموکراسی ڕۆڵی هەیە، چونکە هەوڵدان بۆ وەدەست هێنانی دیموکراسی دەتوانین لە باشترین حاڵەتدا هەوڵدان بۆ وەدەست هێنانی دەسەڵات لێك بدەینەوە و لەوەی کە کرێکاران، پێویستیان بە دیموکراسی وەك ئامرازێك بۆ پەرەپێدان و پشتیوانی لە بەرژەوەندییەکانی خۆیان لە ڕەوتی بە پیشەسازی بوون هەیە، کەوابوو بەردەوام یەکێك بوون لە پارێزەرانی.

نیشانەکان لە وڵاتانی ڕۆژئاوایی و بەشەکانی دیکەی جیهانیش ئەم بیرۆکەیە پشت ڕاست دەکەنەوە.

(1) Lopset.





دامەزراوەکانی لیبڕاڵ دیموکراتیك، کەمبوونەوەی نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکان، سەرهەڵدانی کۆمەڵگای مەدەنی، هەماهەنگی سیاسی بەربلاو، ئایدۆلۆژیای سیکۆلار و بروکراتیکی گشتی و پەرەپێدانی نیهادینە بوونی مافی هاوولاتی و مافی مرۆڤ بە دەگمەن دەبێتە هۆی پێکهاتنی گەشەسەندنی ئابووری لەسەر بنەمای شارنشینی و بە پیشەسازی بوون. لە راستیدا بنەما و بناغەی زۆربەی ئابوورییەکانی پیشەسازی پێشکەوتوو لە بارودۆخی نادیموکراتیك یان دیموکراتیك سنووردار پێکهاتووە، وەك بەریتانیا (١٧٥٠-١٨٥٠)، بەشی زۆری ئەورووپای رۆژئاوا بە تایبەتی ئەڵمانیای سەردەمی بیسمارك و ژاپۆنی سەردەمی میجی. (Tilly, 1975) سەرەڕای ئەمەش نموونە سەرکەوتووەکانی هەڵدانی ئابووری لە جیهانی سێهەم پاش دەیەی ١٩٦٠، وەك بەڕازیل، کۆریای باشوور، تایوان و ئەم دواییانەش ئەندونزیا و تایلەند، بە هۆی هەندێك بارودۆخ گەشەیان کردووە کە لە سەرەتادا نیشانەیەك لە دیموکراسی بەردەوام و سەقامگیر لەواندا دەبینرا و تەنانەت دەتوانین بڵێین کە رەوشی ئێستا بە پێچەوانە ئەو بووە. تەنانەت لە کۆمەڵگای سەرکەوتووی تا رادەیەك گەشەکردوو و دیموکراتیك وەك بوتسوانا، مالیزیا و سەنگاپووریش، بۆ ماوەیەکی زۆر سیستەمی تاك حیزبی حکوومەت بە کردەوە وەك رێگایەکی پەسندکراو هەبوو. دیارە لە تەواوی ئەم کۆمەڵگایانەدا، شەپۆلی نێوخۆیی بەهێز بۆ گەشەسەندن و پەرەپێدانی شێوازەکانی دیموکراتیك لە ئارادا بوون حیزبە دەسەڵاتدارەکان لە دیموکراسییە تاك حیزبییەکاندا لەلایەن نوخبەکان و چینی نێونجی کۆمەڵایەتی و کرێکاران لەژێر فشاردا بوون، بە جۆرێك لە هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری تایوان لە ئاداری ٢٠٠٠ ئەم بابەتە بە روونی دەرکەوت.

تەواوی ئەم خاڵانە بوونە هۆی بەهێزبوونی ئەم بیرۆکەیە کە پێی وابوو دیموکراسی ئاسەواری گەشەسەندنە. کەوابوو هەروا باسە سەرەتاییەکان لە تیۆری دیموکراتیزاسیۆن درێژەیان پێدەدرێ.

یەکێکی دیکە لە باسە گرینگەکان سەبارەت بە دیموکراسی ئەمەیە کە هاتنی پێش لە وادەی دیموکراسی و جێبەجێ بوونی پێوانەکانی دیموکراسی لە کۆمەڵگاکانی روو لە گەشە، رەنگە لە قۆناغی سەرەتایی، بەڕاستی ببێتە کۆسپێك لەسەر رێگای رەوتی گەشەسەندن، قۆناغێك کە لەودا دەبێ هەڵبژاردنێکی دژوار لە نێوان رەوتی دیموکراسی یان رەوتی گەشەسەندن ئەنجام بدرێ و پێویستی خێرای بە هەڵوێستی کاریگەر و لێبڕاوانەی سەرکردایەتی دەوڵەتی هەیە. ئەم بابەتە لەبەر ئەوەی روو دەدا کەی لە قۆناغی سەرەتاییدا، گەشەسەندن پێویستی بە کەڵەکە بوونی سەرمایە هەیە بۆ پێکهێنانی ژێرخانەکان و وەگەرخستنی سەرمایە



هەتا ئەوەی کە لەم رێگایەوە توانایی پێکهێنانی سیستەمەکانی خۆشگوزەرانی پێشکەوتووی کۆمەڵایەتی و دابینکردنی مووچەی زۆر بەدەستبێنێ. لە حاڵێکدا کە سیستەمە دیموکراتیکەکان لە هەوڵی کەمکردنەوە و تەنانەت نەهێشتنی رەوتی کەڵەکەبوونی سەرمایە بە مەبەستی چوونە سەری بەکارهێنانن.

بەڵام پاش دەیەی ١٩٦٠، ئەم باسانەش چوونە ژێر پرسیارەوە و بووە هۆی وروژاندنی باسگەلێك کە بەردەوام پێداچوونەوە و تاوتوێ دەکرا. (Huntington and Domingues, 1975, p.47-66).

رەخنەگران بەڵگە دێننەوە کە دیموکراسی و گەشەسەندن بەرامبەر بە یەك سازگار و بەکەڵکن. هەروەها ئەوان دەڵێن کە ئەگەر حاڵەتێکی رێککەوتن و سازانیش لە نێوان دیموکراسی و گەشەسەندندا هەبێ، لەسەرەخۆ بوونی رێژەیی رەوتی هەڵدانی ئابووری، بۆ گەیشتن بە حکوومەتی دیموکراتیك، ئازادییە مەدەنییەکان و پاراستنی مافی مرۆڤ، بە تەواوی وەردەگیرێ و لە راستیدا نرخێکە کە لە بەرامبەر وەدەستهێنانی دیموکراسی دەبێ بدرێ. ئەم پرسە بە تەواوی لە مۆدێلێك کە لە هیندوستان لە لایەن ((نەهرۆ)) پەیڕەو کرابوو دەبینرێ. لەم نموونەیەدا دیموکراسی و گەشەسەندن بە شێوەی یەکسان و هاوکات وەك بایەخگەلی گرینگ سەیر دەکرێن. (Kaviraj, 1996) رەخنەگران ئاماژە دەکەن کە لە سەردەمە جیاوازەکاندا ژمارەی رژێمە نادیموکراتیکەکان کە رەوشی مافی مرۆڤ لەواندا نەگونجاو و دڵساردکەرەوە بوو، زۆرتر لە رژێمە دیموکراتیکەکان بوو، وەك رۆمانی، ئارژانتین، هائیتی، غانا، میانمار، پیرۆ، ئەسیوپیا و موزامبیك.





خشتەی ١-٦: ڕێژەی نرخی هەڵدانی نێونجی ساڵانەی ناپاڵفتەی نەتەوەیی سەرانە لە ساڵی ١٩٦٥ هەتا ١٩٩٠ لە وڵاتانی جێگای سەرنج.

| رژێمە دیموکراتیکەکان | ڕێژەی نرخی هەڵدان | رژێمە نادیموکراتیکەکان | ڕێژەی نرخی هەڵدان |
|---|---|---|---|
| جامائیکا | -١,٣ | زائیر | -٢,٢ |
| ترینیداد و تۆباگو | ٠,٠ | نایجریا | ٠,١ |
| ڤێنزوێلا | -١ | زامبیا | -١,٩ |
| سێنگال | -٠,٦ | لیبیا | -٣ |
| هیند | ١,٩ | کۆریای باشوور | ٧,١ |
| سریلانکا | ٢,٩ | تایوان | ٧ |
| مالیزیا | ٤ | ئەندۆنزیا | ٤,٥ |
| کاستاریکا | ١,٤ | بەرازیل | ٣,٣ |
| بوتسوانا | ٨,٤ | چین | ٥,٨ |
| موریتس | ٣,٢ | ئەلجەزایر | ٢,٤ |
| سەنگاپور | ٦,٥ | تایلەند | ٤,٤ |

سەرچاوە: ڕاپۆرتی ئەنجوومەنی دارشتنی بەرنامەی ئابووری و گەشەسەندن لە ساڵی ١٩٩٢.

لەم رژێمانە نە ڕەوتی هەڵدان و نە ئازادیی بە ئاستی دڵخوازی خۆی نەگەیشتبوو. بەو جۆرەی کە لە خشتەی ژمارە (١-٦) دەردەکەوێ، لە حاڵێکدا لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٥ هەتا ١٩٩٠، هەندێك لە دیموکراسییەکانی جیهانی سێهەم نێونجی هەڵدانی ساڵانەیان نیگەتیڤ یان ڕاوەستاو بووە، وڵاتانی دیکە لە بەراورد لەگەڵ دەوڵەتە نادیموکراتیکەکان گەشەیەکی بەرچاویان بووە. بەڵام سەرەڕای ئەم باسە دژ بە یەکانە و جیا لە بەیاننامە گشتییەکانی دەیەی ٦٠، هەتا پێش سەرەتای دەیەی ٩٠ دیموکراسی هیچ کات وەك بنەمای سەرەکی بیرۆکەی گەشەسەندن لە وڵاتانی ڕۆژئاوایی و گرینگترین مەرج بۆ سیاسەتەکانی گەیاندنی یارمەتی دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان لەبەرچاو نەدەگیرا و تەنیا لە سەرەتای دەیەی ٩٠دا بوو کە دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان پێداگرتن لەسەر دیموکراسییان دەست پێکرد. ئێستا ئەم پرسیارە دێتە بەرباس کە بۆچی پاش دەیەی ٩٠ ئەم گۆڕانکارییە بنەڕەتییە لە سیاسەتە دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکاندا پێکهات؟.



**((هۆکارەکانی گۆڕان))**

ئەم گۆڕانە، لەبەر هۆکاری سیاسی بوو کە بووە هۆی سەرهەڵدانی پرسی ((حکوومەتی دڵخواز)) لە باسەکاندا. هەروەك لە فەسڵی پێشوودا بە دوور و درێژی لەم پێوەندییەدا باس کراوە، ئەم کارە بەهۆی دۆزینەوەی نوێی زانستی کە دیموکراسییان وەك مەرجی پێویست بۆ دەستەبەرکردنی ((حکوومەتی دڵخواز)) و گەشەسەندن دەزانی، نەبوو. لە ڕاستیدا بەڵگەکان لەم پێوەندییەدا ئەمە دەسەلمێنن (مەرجی دێموکراسی بۆ گەشەسەندن) هەروا نادیار ماوەتەوە: ((وەڵامێکی سادە بۆ ئەم پرسیارە ئەمەیە کە ئێمە نازانین کە ئایا دیموکراسی دەبێتە کۆسپی هەڵدانی ئابووری یان ئەوەی کە دەبێتە هۆی بەهێزبوونی)).

هەروەك لە سەرەوە ئاماژەی پێکرا، هەندێك لە دیموکراسییەکان دەبنە هۆی بەهێزبوونی هەڵدانی ئابووری و هەندێکی دیکەش بە پێچەوانەوە ڕوودەدا.

لە ڕاستیدا هۆکاری گۆڕان لە سیاسەتەکانی ڕۆژئاوا بریتین لە:

١- ئەزموونی هاوسەنگکردنی پێکهاتەیی.
٢- سەرهەڵدانی بیرۆکەی نیولیبراڵ.
٣- ڕووخانی کۆمۆنیزمی دەوڵەتی.
٤- پەرەسەندنی بزووتنەوەکانی پشتیوانی دیموکراسی لە وڵاتانی ڕوو لە گەشە.

بەم هۆکارانە، دەبێ تووڕەیی گشتی (خەڵکی) لە زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاوایی لە دژکردەوە بە پێشێل کردنی بەربڵاوی مافی مرۆڤ لە لایەن حکوومەتە نادیموکراتیکەکانی وڵاتانی ڕوو لە گەشە لە دەیەی ٧٠ و ٨٠ زیاد بکەین.

بۆ وێنە لە ئەمەریکای لاتین، ئارژانتین، بەڕازیل و شیلی پاراستنی مافی مرۆڤ لە لایەن حکوومەتە سەربازییەکانی زاڵ، لە ڕەوشێکی زۆر خراپ دایە. لە ئەفریقا، ئەفریقای باشوور نیگەرانییەکی سەرەکی هەیە، هەروەك نایجریاش لەو وڵاتانە بوو کە لەودا پێشێلکردنی مافی مرۆڤ بەربڵاوبوو. لە ئاسیاش، بارودۆخی ئەندۆنزیا، کامبۆدیا و میانمار جێگای نیگەرانی بوو. هەروەها کوشتاری خەڵك لە گۆڕەپانی تیان ئان مێنی پێکەن لە ساڵی ١٩٨٩ش کاریگەری بەرچاوی هەبوو. شەپۆلی سێهەمی دیموکراتیزاسیۆن، پێش ئەوەی دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان، وڵاتانی ڕوو لە گەشە بۆ پێکهێنانی دیموکراسی بخاتە ژێر فشارەوە، لە ڕێدا بوو. بە دەست پێکردنی ئەم شەپۆلە پورتوگال و ئیسپانیا لە ناوەڕاستی دەیەی ١٩٧٠، ئەم شەپۆلە نوێیەی دیموکراتیزاسیۆن بووە هۆی سەرهەڵدانی دیموکراسییە نوێیەکان یان سەرلەنوێ لەدایك بوو[1] لە فیلیپین هەتا شیلی.

(1) Born-Again Democracis.

له دەیەی ٩٠دا ئەم شەپۆلە گەیشتە ئەفریقا و ئەورووپای رۆژهەلات. هیچ کەس نابێ رۆلّی بنەڕەتی و سەرەکی زیادبوونی رادەی دیموکراسییەکان لەم قۆناغەدا لەبەرچاو نەگرێ.

بە پێی پێناسەی کلاسیکی شومپیتەر[1] لە دیموکراسی هەلّبژاردن یان نوێنەرایـەتی، رادەی دیموکراسییەکانی هەلّبژاردن لە رەقەمی ٣٩ لە سالّی ١٩٧٤ گەیشتە ١١٧ لـە سـالّی ١٩٩٨. بە پێی ئەم پێناسەیە دیموکراسی نوێنەرایەتی یا هەلّبژاردن بریتییە لـە: دارشـتنی پرۆگـرام بـە مەبەستی گەیشتن بە گرتنەبەری بڕیاراتی سیاسی کە لەودا تاکـەکان، دەسـەلاّتی بڕیـاردان لـە رێگای بەشداری لە خەباتێکی کێبـەرکێ بـۆ وەدەسـتهێنانی دەنگـی خـەلّك بەدەسـت بێـنن. (Potter, 1997, p.38). زانیارییـەکانی خـشتەی ١-٦ نیـشانی دەدا کـە بـە پێـچەوانەی بانگەشەی دەولّەتی لـە دەیـەی ٩٠، هـیچ پێوەندییـەکی راسـتەوخۆ لـە نێـوان دیموکراسـی و گەشەسەندندا نییە و تەنانەت دەتوانین بلّێین کە بە گشتی هیچ پێوەندییەك لە نێوان جۆری رژێم و کارکردی ئابووری ئەودا نییە و بە جێگای ئەو دەتوانین بەم ئاکامە ئالّۆزە بگەین:

یەکەم، راستییەکەی ئەمەیە کە هەردوو جۆری رژێمە دیموکراتیـك و نادیموکراتیکـەکان لـە جیهانی سێهەم، توانیویانە ئاستێکی بەرز لە گەشەسەندنی ئابووری پێکبێنن، هەر چەند رادەی دیموکراسی فەرمی نێو ئەم رژێمانە زۆر کەمە.

دووەم، دەتوانین بلّێین، ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە رژێمە نادیموکراتیکەکان بـە دەسـتکەوتی زۆر کەمی گەشەسەندن و رەوشی نالەباری مافی مرۆڤ هەن. لە کۆتاییـدا هـیچ نموونەیـەك لـە هەلّدانی ئابووری دلّخواز و سەقامگیر لە ولاّتانی روو لە گەشەی دیموکراتیك یان نادیموکراتیـك، کە لە بارودۆخی لیبرالیزمی ئابووریدا رووی دابێ، بەرچاو ناکەوێ.

لە کاستاریکا هەتا چین و لە بوتـسوانیا هـەتا تایلەنـد، دەولّـەت رۆلّـی گرینگـی لەسـەر هەلّسوکەوتی ئابووریدا هەبووە و زۆرجار تەنانەت خودی دەولّەت پێگەی گرینگـی مـاددی لـە ئابووری ولاّتەکەی لە ئەستۆ بووە.

کەوابوو لە بنەڕەتدا ئەمە جۆری دەولّەت نییە کە بەشدارە لە رەوتی گەشەسەندندا، بـەلّکو ئەمە جۆر و تایبەتمەندی دەولّەت و سیاسەتەکانییەتی کـە لـە کـرداری ئابووریـدا، کاریگـەری هەیە. ئەم پرسە بەش بە حـالّی خـۆی بـووە هـۆی زەقبوونـەوەی ئەولەوییـەتی سیاسـی، وەك گرینگترین هۆکار لە بڕیاردان لە رەوتی گەشەسەندندا. بە کورتی، تێکەلاّوییـەك لـە سیاسـەتە

(1) Shumpeter.



دیموکراتیکەکان و لیبرالیزمی ئابووری چ لە رابردوو و چ لە حالّی حازردا، بـە دەگمـەن دەبێتـە هۆی پێشکەوتن لە قۆناغی کشتوکالّی بۆ بە پیشەسازی بوون.

هەروەك وایز و هابسۆن[1] پێیان وایە: ((دەسەلاّتی رێژەیی دەولّەت بەردەوام یەکێك لە گرینگترین میکانیزمەکانی پێوانەی رێوشوێنی پیشەسازی ولاّت لە ئابووری نێو نەتەوەیدا بووە و دەبێ)).

ژمارەیەکی زۆر کەم لە خەلّك هەن کە لە چوونە سەری رادەی دیموکراسییەکان لـە جیهانـدا ناڕازی بن، بە تایبەت ئەگەر ببێتە هۆی باشکردنی دۆخی مافی مـرۆڤ. لەگـەلّ ئەمەشـدا ئـەم پرسیارە بنەڕەتییە هەروا دەمێنێ کە: ئایا ئەم دیموکراسییە نوێیانـە یـان سـەرلەنوێ بوژاوانـە بەردەوام دەبن و ئایا دەبێتە هۆی بەهێزبوونی هەلّدانی ئابووری؟ ئەگەر حکوومەتی دلّخواز لـە حکوومەتە دیموکراتیکەکاندا بە باشترین شێوە گرەنتی بکرێ، چ دوورە دیمەنێك لەودا دەبینین؟

دەمهەوێ پێشنیار بکەم کە دەیەکانی سەرەتای سەدەی ٢٠، نموونەیەکی تیکەلاّو پێکـدێنن کە لەواندا تەواوی دیموکراسییە نوێیەکان ناتوانن بەردەوام بن. بەلاّم هـەر ئاکـام و ئاسـەوارێك پێوەندی بە دوو پرسەوە هەیە: لە لایەك ((شێوازێك کە هەزینەکان و بەرژەوەنـدیی لیبرالیزمـی ئابووری لەسەر ئەو بنەمایە دابەش دەکرێ و لە لایەکی دیکەوە شێوازێك کـە لەسـەر بناغـەی ئەو دەرەتانە دیموکراتیکەکان لە لایەن گرووپەکانی چەوساوە و دەرەوەی دەسەلاّتی پێـشوو، بـۆ راستکردنەوەی نایەکسانییەکانی رابردوو و نەهێشتنی کێشە نوێیەکان، کەلّکی لێوەردەگیرێ.

بە واتایەکی دیکە، تێکەلاّوکردنی ئابووری لیبرالیزم و سیاسەتەکانی حکوومەتی دلّخـوازی دیموکراتیك، ئاکام و ئاسەوارەکانی گەشەسەندن دیاری ناکەن، بەلّکو شێوازی هەلّسوکەوتی ئەم دوو هۆکارەیە کە کاریگـەرە لەسـەر ئاسـەوار و ئاکامـەکانی گەشەسـەندن. لـە زۆر حالّەتـدا هەلّسوکەوتێکی ئەوتۆ دەبێتە هۆی پێکهێنانی رەوشێك دژی گەشەسـەندن. دیـارە ئـەم جـۆرە دوورە دیمەنە، بەستراوەتەوە بە بارودۆخێك کە مانەوە و بەردەوامی دیموکراسی گەرەنتی بکا.

((دیموکراتیزاسیۆن و سەقامگیری ئـەو-دوو بابـەتی لێـك جیـاواز)) بەلّگـە شکـستەکانی رابردوو لـە سـەدەی بیـستەم نیـشاندەری گرینگـی هەنـدێك لـە رەوشـەکانە لـە بـەردەوامی دیموکراسییەکاندا. هەرچەند ئـەم بابەتـە لـە رووخـانی دیموکراسـییەکانی جیهـانی سـێهەم لـە سالّەکانی دوای جەنگیش دەبینرێ، بەلاّم هاتنی ئەم باسە لە سەرەتادا پێویستی بە رەخساندنی بوارێکی لەبار هەیە. لە باسەکانی پێوەندیـدار بـە دوورە دیمـەنی (بـەردەوامی دیموکراتیـك)[2]

(1) Weiss and Hobson.
(2) Democratic Surrival.





یەکێك لە بابەتە گرینگەکان، جیاوازی دانان لە نێوان ئەو رەوتانەیە کە بوونە هۆی رەخساندنی بواری پێویست بۆ دروست بوونی قۆناغی ((تێپەڕبوون بۆ دیموکراسی)) و لە لایەکی دیکەوە بارودۆخێك کە دەبێتە هۆی پێکهاتنی ((سەقامگیری دیموکراتیك))[1].

خاڵی گرینگ ئەمەیە کە ((تێپەڕبوون بۆ دیموکراسی)) و پاشانیش مانەوەی دوو بابەتی جیاوازن. تەواوی قوتابخانە گرینگەکانی تیۆریی دیموکراتیزاسیۆن باسی جیاوازی نێوان ئەم دوو رەوتەیان قەبووڵ کردووە. چونکە ((هەموو لایەك دەبێ ئامادەیی جیاوازی دانان لە نێوان رەوشی سەقامگیری سەرەتایی دیموکراسی و رەوشێك کە دەبێتە هۆی مانەوە و بەردەوام بوونی پاش سەقامگیرییان ببێ)). ئەمە لە حاڵێکدایە کە باوکی خوێندنەوەی دیموکراتیزاسیۆن لیپست پێی وایە کە ((دیموکراسییە نوێیەکان دەبێ نیهادینە بکرێن، سەقامگیربن و رەواییان پێ بدرێ)).

هەروەها نموونەی پێویست لە رووخان و شکستی دیموکراسییە نوێیەکان و سەرلەنوێ بوژانەوەش هەیە، هەتا شاهیدێك بۆ ئەم بانگەشەیە بن کە رەوتەکانی پێکهێنان و سەقامگیرکردن دیموکراسی لە یەکتر جیاوازن.

ئێستا، پرسیار ئەمەیە کە ((سەقامگیری چییە؟ چ کاتێك دیموکراسی دەپارێزێ)).

ئاشکراترین تایبەتمەندی ناسراوی ((دیموکراسی سەقامگیرکراو)) کاتێك سەرهەڵدەدا کە تەواوی یاریزانە سەرەکییەکانی سیاسی، ئەم راستییە کە ((رەوتەکانی دیموکراسی پێویستە ببنە هۆی دووبارە بوونەوەی حکوومەت))[2] بەبێ مەرج قەبووڵ بکەن. (Mainwaring, 1997, p.3)

لە شیکردنەوەی رەستەی سەرەوە دەبێ بڵێین کە سیاسەتە دیموکراتیکەکان لە شوێنێکدا وەك سەقامگیر چاوی لێدەکرێ کە خەڵك، حیزبەکان و گرووپە سیاسییەکن بە دوای بەرژەوەندی خۆیان بەهۆی کێبەرکێ، دانوستان و هاوکاریی یاسایی و ئاشتیخوزانەوە بن. هەروەها لە شوێنێکدا کە سەبارەت بە بەدیلی حکوومەتێك بە جێگای حکوومەتێکی دیکە لە رێگای شێوازەکانی سەرەوە رێککەوتن هەبێ، رەوتی ((سەقامگیری دیموکراسی)) پێکهاتووە.

نموونەیەکی گرینگی دیکە کە پێویستە سەرنجی پێبدرێ، ئەمەیە کە لیبراڵ دیموکراسی لە ئەمەریکا، بەریتانیا، فەرەنسا، ئیسکاندیناوی و وڵاتانی بنلوکس[3] (بەلجیکا) لوکزامبۆرگ، هۆڵەندا بە درێژایی دەیەی ٣٠، سەرەڕای فشارە سیاسی-کۆمەڵایەتییەکان و قەیرانی ئابووریی ساڵەکانی جەنگ، سەقامگیر مایەوە و لە نێو نەچوو.

---

(1) Democratic Consolidation.
(2) Government Renewal.
(3) Benelux.



دیارە سەقامگیری و بەردەوامی دیموکراسی لەم وڵاتانە لە بەراورد لەگەڵ شکست و رووخانی بە بڵاوی ئەو لە وڵاتانی دیکە زۆر دەگمەنە. چونکە رووخانی رۆژ لە دوای رۆژی دیموکراسی لە ئەورووپای ئەو سەردەمە، ناسەقامگیری درێژخایەنی دیموکراسییەکان لە ئەمەریکای لاتین لە سەدەی بیستەم و نموونەی گشتی رووخانی دیموکراسییەکان پاش ١٩٦٠ لە زۆربەی وڵاتانی داگیرکراوی پێشوو کە پاش کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی لەسەر بنەمای دیموکراتیك سەربەخۆ ببوون (شەپۆڵی دووەمی دیموکراسی)، نیشاندەری دەگمەن بوونی نموونەکانی سەقامگیری و بەردەوامی دیموکراسییە. (Huntington, 1991).

هەروەها ئەگەرچی نموونەگەلی گرینگ لە خۆڕاگری دیموکراسی لە بەرامبەر هێرشی دژی دیموکراسی (زۆرتر لە نێو دەوڵەت) وەك هیند و جامائیکا هەبوون، بەڵام پێشتر چەندین نموونە لە رەوتی پێچەوانەی دیموکراتیزاسیۆن دیتراون. بۆ نموونە هەتا کۆتایی ساڵی ١٩٩٩ لە زۆربەی وڵاتانی خوارووی بیابانی ئەفریقا، دیموکراسی یان سەرەتا شکستی خواردووە یان جارێکی دیکە پاش دووبارەبوونەوەی رووخاوە. ئەم وڵاتانە بریتین لە لسوتۆ، نایجریا، سیرالیێئۆن، گامبیا و نیجی. لە ئەلجەزایر رەوتی دیموکراتیزاسیۆن لە ئاکامی رەوتی هەڵبژاردن لە کۆتایی ساڵی ١٩٩١ بە حاڵەتی هەڵپەسێردراوی مایەوە و پاشان سەرلەنوێ دەستی پێکردەوە. لە پاکستانیش دیموکراسی جاریکی دیکە بە هۆی کودەتای سەربازی لە کۆتایی ١٩٩٩ وەلانرا. بە سەرنجدان بە روون بوونی ئەم بابەتە کە دامەزراندنی سیستەمی سیاسی دیموکراتیك لە رابردوو بە هیچ جۆرێك بە مانای سەقامگیری ئەوان نییە، هێنانە بەرباسی ئەم پرسیارە پێویستە کە ئایا دیموکراسییەکانی تازە دامەزراو دەتوانن بەردەوام بن؟ بە مەبەستی وەڵامدانەوە بەم پرسیارە، ئەمن ٥ مەرج کە بە پێی لێکۆڵینەوەکانم لە بەراورد لەگەڵ حاڵەتنە جیاوازەکان بۆ سەقامگیریی دیموکراتیزاسیۆن پێویستن، پێشنیار دەکەم.

### پێنج مەرجی پێویست بۆ بەردەوامی دیموکراسی

پێم وایە کە پێنج مەرجی پێویست بۆ سەقامگیری دیموکراسی هەیە کە بە گشتی نیشاندەری رۆڵی سەرەکی سیاسەت لە گەشەسەندن دایە. هەروەها ئەم مەرجانە لەسەر سوودمەندبوونی گەلاڵەی پرسیارگەلی گشتی تیۆریك لە زانستی سیاسی لە پێوەندی لەگەڵ گەشەسەندن و دەستنیشان کردنی زانستی سیاسی لە دەقی خوێندنەوەکانی گەشەسەندن و بە پێچەوانەوە، تەئکید دەکەن.

**رەوایی:**

رەوایی چەمکێکە کە پێناسە و هەڵسەنگاندنی، بە تایبەت لە سیستەمە سیاسییە پاوانخوازەکان کە لەواندا بیروڕای گشتی بە توندی سەرکوت دەکرێ، زۆر دژوارە. هەرچەند کە ئەم وشەیە نادیارە و ئاڵۆزە، بەڵام ئاسانترین پێناسەی بۆ وەرگرتن دەبێ. بەڵام هەروەك ((هێڵد))[1] ئاماژەی پێدەکا رەنگە خەڵك بە هۆی جیاواز سیستەمێکی سیاسی قەبووڵ بکەن (یان لانیکەم دژی رانەوستن کە جیاوازی لەگەڵ قەبووڵ کردن)، بەڵام بە دەگمەن ((قەبووڵکردنی وشیارانە و کامڵ)) بناغە و کۆڵەکەی رەواییە. هەروەها رەنگە خەڵك بە هۆی ترس یان بە هۆی گوێڕایەڵی نەریتی رازی بن بە وەرگرتنی سیستەمی سیاسی یان ئەوەی کە هۆی قەبووڵکردنی ئەوان رەزامەندی مەرجدار بێ.

بۆ وێنە توانایی دەوڵەتی ئەندۆنزیا پاش ١٩٩٦ لە بەرەوپێش بردنی هەڵدانی ئابووری و دابەشکردنی بەربڵاوی بەرژەوەندی بە دەست هاتوو، سەرەڕای حکوومەتی سەرەڕۆیانە و توندوتیژ، بەردەوام وەك یەکێك لە هۆکارەکانی دابینکەری رەوایی رژێم، کەوتووەتە بەرباس. (Putzel, 1997) شتێك کە وەك رەوایی بەربڵاو و تەنانەت خۆشەویستی نەزمی نوێی سوهارتۆ لە ئەندۆنزیا لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٥ هەتا ١٩٨٨ ناسراوە، لە راستیدا پابەندبووە بە مەرجی هەڵدانی ئابووریی بەردەوام، چونکە راوەستانی هەڵدانی ئابووری لە ئاکامی قەیرانی ماڵی ئاسیا لە کۆتایی دەیەی ١٩٩٠دا بووە هۆی ئەوەی کە رەوایی رژێم و (خۆشەویستییەکەی) بە توندی بکەوێتە ژێر کاریگەرییەوە.

سەرەڕای هەموو ئاڵۆزییەکانی چەمکی (رەوایی)، روونە کە هیچ حکوومەتێکی دیموکراتیك بەبێ کەڵك وەرگرتن لە یەکێك لە جۆرەکانی رەوایی ناتوانێ بەردەوام و سەقامگیربێ.

لەگەڵ ئەمەشدا وادێتە بەرچاو کە تێگەیشتنی هەرچی زیاتری چەمك و بەڕێوەبردنی، بە دابەشکردنی بەسەر ٣ بەشدا دەرەتانی هەیە: رەوایی جوگرافیایی، رەوایی بە هۆی یاسای بنەڕەتی و رەوایی سیاسی.

رەوایی جوگرافیایی واتە کەسانێك کە لە چوارچێوەی دەوڵەتێکدا دەژین، هەڵکەوتی سەر زەوییەکەی و هاوسەنگی و دڵخوازیی شوێنی ژیانیان لەودا قەبووڵ بکەن یان ئەوەی کە لانیکەم بە راشکاوی دژایەتی لەگەڵدا نەکەن، مەگەر لە رێگای بەکارهێنانی شێوازی یاسایی. بەم

(1) Held.



جۆرە، لە هەر شوێنێکدا کە خەڵك بە پێی ئەم فاکتۆرانە رەوایی بە دەوڵەت نەبەخشن، سیاسەتە دیموکراتیکەکان دەکەوێتە بەر مەترسییەوە.

لە حاڵەتی توندتردا، رەنگە ئەم هەڕەشەیە شێوازی بزووتنەوەی جیاییخوازانە یان بزووتنەوەیەك کە بیەهەوێ بەشێك لە خاکێ وڵاتی دراوسێ بگەڕێنێتەوە، بە خۆوە دەگرێ. لەم جۆرە شوێنانەدا گرووپێك یان ناوچەیەك هەوڵی جیایی لە سەرزەویی بنچینەیی و دامەزراندنی دەوڵەتی دڵخوازی خۆیان دەدەن یان ئەوەی کە بیر لە پەیوەست بوون بە سەرزەوییەکی دیکە دەکەنەوە. لەو سیستەمانەی کە هیچ جۆرە رەوتێکی سیاسی تایبەتی بۆ خەڵك، بە مەبەستی جیایی لە دەوڵەتی ناوەندی نییە، ئەگەری پێڕەوی کردن لە رەوتی دیموکراتیك لە لایەن خەڵکەوە نامێنێ و لە حاڵەتێکی ئەوتۆدا توند و تیژیش چاوەڕوان کراوە. سیاسەتی دیموکراتیك لە ناوچە قەیراناوییەکاندا ئەگەر نەڵێین مەحاڵە، بەڵام زۆر دژوارە. دەتوانین بۆ نموونە ئاماژە بە ناوچەی باسك لە باکووری ئیسپانیا، ئێریترە (کە پێشتر بەشێك بوو لە ئەسیوپیا) سریلانکای باکوور، ئەو شوێنەی کە چریکەکانی تامیل بۆ سەربەخۆیی شەڕ دەکەن و ناکۆکی چیچان بۆ سەربەخۆیی بوون لە رووسیا، بکەین.

((رەوایی بە هۆی یاسای بنەڕەتی)) تایبەتە بە قەبووڵ کردنی یاسای بنەڕەتی. هەمان پێکهاتەی فەرمی یاساکان، کە لە رێگای ئەوەوە، دەسەڵاتی سیاسی بۆ بەدەست هێنانی، دەکەونە ململانێ و خۆیان رێکدەخەن و دابەش دەبن.

یەکێك لە دژوارترین بەشەکانی دیموکراتیزاسیۆن، لە قۆناغی دارشتنی یاسای بنەڕەت دایە، ئەم بابەتە لە دانوستانە ئاڵۆزەکانی پێوەندیدار بە ئەفریقای باشوور لە نێوان ساڵەکانی ١٩٩٠ هەتا ١٩٩٤ بە باشی دەرکەوتبوو.

لە حاڵێکدا دیموکراسییەکان لە کەشی سیاسی تاریکی سەردەمی حکوومەتە سەرەڕۆکان سەرهەڵدەدەن، کۆمەڵێك لە خواست و بەرژەوەندیش دێنە نێو کەشی سیاسی کراوە بەڵام پێشبینی نوێی بۆ ناکرێ. رەنگە هەندێك لە خواستەکان بەهێز و دەوڵەمەند بن و خوازیاری گۆڕان نەبن و هەندێکیش لاواز و خوازیاری گۆڕان بن. لەم حاڵەتەدا رەنگە بەرژەوەندیی جۆراوجۆر لەوانە بەرژەوەندی ئابووری (خاوەن زەوییەکان)، بەرژەوەندی سیاسی یان دامەزراوەیی (حیزبە سیاسییەکان و دامەزراوەکانی یاسادانان)، بەرژەوەندی کارکردی (سوپا و بوروکراسی)، بەرژەوەندی چینایەتی (وەك کرێکارانی سازماندراو لە بەڕازیل)، بەرژەوەندی قەومی (بە رەگەز ئەفریقاییەکان لە ئەمەریکای باشوور یان هیندییەکان لە فیجی)، بەرژەوەندی ناوچەیی





(پارێزگایەك یان ناوچەیەكی نەتەوەیی شوێن كەوتوو)، یان كۆی هەندێك لەم بەرژەوەندییانە، لە كۆمەڵگادا هەبن. هەر یەك لەم گرووپانە بیرۆكەیەكی وشیارانەیان لە پێوەندی لەگەڵ ئەوەی كە چۆن دەسەڵات لە یاسای بنەڕەتیدا كاریگەری لەسەر بەرژەوەندی ئەوان دادەنێ، هەیە و هەموویان خوازیاری گەرەنتی پشتیوانی لە بەرژەوەندییەكانیان لە یاسای بنەڕەتی نوێدان. یاسای بنەڕەتی تارادەیەك خاوەنی ئەم جۆرە تواناییانەیە هەر بۆیە دانوستانەكان لەو پێوەندییەدا زۆر دژوار و تاقەتپڕوكێنە، چونكە گرووپەكان بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدان كاریگەری لەسەر یاسای بنەڕەتی و نێوەرۆكەكەی دابنێن. (Przeworski, 1986, p.60).

ئایا سیستەمی نوێ سیستەمێكی پەرلەمانی یان سەرۆكایەتی دەبێ؟ ئەگەر وەڵام خاڵی دووەم بێ دەسەڵاتی سەرۆككۆماری لە بەراورد لەگەڵ دامەزراوەی یاسادانان بە چ شێوازێك دەبێ و رۆڵی حیزبە سیاسییەكان لەم سیستەمەدا چی دەبێ؟ سەرۆككۆمار چەند دەورە دەتوانێ لە پۆستی خۆیدا بمێنێتەوە؟ سوپاچۆن كۆنترۆڵ دەكرێ؟ كام یەك لە سەرچاوەكانی دەسەڵات لە ناوەندا دەمێننەوە (لە سیستەمە فیدرالییەكاندا)؟ دەوڵەتە خۆجێیی و ناوچەكانی دیكە هەتا چەند خاوەنی ئەم هێز و بەرژەوەندییەن؟ ئایا لە سیستەمی نوێدا، ((راگەیەندراوێك بۆ مافی مرۆڤ))[1] لەبەرچاو گیراوە؟ نێوەرۆكەكەی چ دەبێ؟ رەوتی گۆڕانكاریی لەودا هەتا چەند دژوار دەبێ؟ بۆ وێنە ئایا خاوەندارێتی تایبەتی پشتیوانی لێ دەكرێ؟ ئەگەر وەڵام پۆزێتیڤە، كەوابوو یاسای بنەڕەتی بەربەستی هەمەلایەنە بۆ دەوڵەت سەبارەت بە سیاسەتەكانی ئابووری پێكدێنێ. تەنانەت لەو دیموكراسییانەی كە لە كۆنەوە دامەزراون (وەك بەریتانیا و نموونەی نوێتر هیند) بەرژەوەندیی قەومی و ناوچەیی بە تێپەڕبوونی سەردەم دەتوانێ پەرەبستێنێ و حكوومەتی ناوەندی بۆ چاكسازی یاسای بنەڕەتی بخاتە ژێر فشارەوە و جێبەجێ نەبوونی دەتوانێ ببێتە هۆی توندوتیژی. لە بەریتانیا پرسی راگواستنی دەسەڵات بە ئیسكاتلەند و وێلز نموونەیەكی باشە لەم پێوەندییەدا. لە هیندیش داواكاری بۆ خودموختاریی زیاتر و تەنانەت سەربەخۆیی هەرێمی پەنجاب وەك فشاری رۆژ لە رۆژ زیاتری ناسیۆنالیزمی هیندی، فشارێكی بەرچاوی بۆ دەوڵەتی ناوەندی هیند هێناوە. كەوابوو ئەگەری وای دابنێین كە خەڵك پێناسەی جوگرافیایی لە دەوڵەت بە رەوا دەزانن، هەروەها ئەوان دەبێ یاسای بنەڕەتیش بۆ پێكهێنانی سەقامگیری، بە رەوا بزانن، هەتا ئەوەی كە بەم جۆرە شانسی رێككەوتن و چارەسەری كێشەكان لە ئارادا بێ.

(1) Bill of Rights.



لە كۆتاییشدا بە رەوایی سیاسی دەگەین. ئەم چەمكەش ئاماژە بە رێژەی مافی حكوومەت بۆ بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات، لە روانگەی دەنگدەرانەوە دەكا. بە واتایەكی دیكە كاتێك ئێمە باسی رەوایی سیاسی حكوومەتێكی دەكەین، مەبەستمان ئەمەیە كە ئاكامی هەڵبژاردن رەنگدانەوەی دەنگی خەڵكە لە سەندووقەكاندا و هیچ ساختەكارییەكیش لە ئاكامی هەڵبژاردندا نەكرابێ.

بۆ نموونە لە هائیتی، لە ناوەڕاستی دەیەی ٨٠، بەردەوام شاهیدی ساختەكاری لە هەڵبژاردندا بووین، كە ئەم قەیرانە پاش رووخانی رژێمی ((دووالیر)) بە دەستێوەردانی سوپا و لەبەرچاو نەگرتن ئاكامی دیموكراتیك هاوكات بووە. ئەم پرسانە تەنیا هەندێك لەو هۆكارانەن كە دەبنە هۆی هاتنە خوارەوەی رێژەی رەوایی سیاسی و هەڵكەوتی دیموكراسی هەتا ئاستێكی زۆر نزم لە وڵاتێكدا. (Der Byshire, 1996, p.2-230).

پاش بەرێوەچوونی یەكەمین هەڵبژاردنی چەند حیزبی لە ساڵی ١٩٩٢ لە كینیا، زۆربەی ئەندامەكانی حیزبە نەیارەكان (كە لە هەڵبژاردندا شكستیان خواردبوو)، بانگەشەی ئەوەیان دەكرد كە بێ سەروبەریی بەربڵاو لە پرۆسەی هەڵبژاردندا بینراوە. بەم جۆرە ئاكامی هەڵبژادن- و بە دوای ئەودا ئاكامی دیموكراسی- كەوتە مەترسییەوە. هەرچەند چاودێرانی هەڵبژاردنی وڵاتانی خاوەن بەرژەوەندی هاوبەش، سەرەڕای ئەم بێ سەروبەرییانە، ئاكامی گشتی هەڵبژاردنیان وەك رەنگدانەوەی دەنگی دەنگدەران چاو لێدەكرد. ئەگەرچی سەبارەت بە حاڵەتی دوایی ئاكامی هەڵبژاردن قەبووڵ كرا، بەڵام سەرەڕای ئەمەش، دڵەڕاوكێ و نیگەرانیشی لە كێنیا بە دواوە بوو.

بە كورتی دەتوانین بڵێین كە دڵنیایی لە هەمبەر رەوتەكان و ئاكامی سیاسەتەكانی هەڵبژاردنی دیموكراتیك، بۆ پێكهێنانی سەقامگیری دیموكراتیك، پێویستە.

بەڵام خاڵی سەرەكی جێگای باس ئەمەیە كە سەرەڕای تەواوی ناروونییەكان لە چەمكی رەوایی، شێوازەكانی سیاسی، جوگرافیایی و یاسایی رەوایی بۆ مانەوە و بەردەوامی حكوومەتی دیموكراتیك پێویستن. دیارە پێویست بە وەبیرهێنانەوەیە كە پێكهێنانی ئەم رەوشە لە زۆربەی دیموكراسییە نوێیەكاندا، ئاسان نییە.

چونكە دڵنیا نەبوون، گرژی و بێزاریی، لە حكوومەتەكانی پێشوو بەجێماون و سەركەوتن لە هەڵبژاردن بەردەوام هاوڕێیە لەگەڵ ترس لە ئاكامی لە دەستدانی دەسەڵات.





**((پێڕەوی کردن لە بناغەکانی یاری))**[1]

بۆ ئەوەی دیموکراسییەکان بە سەقامگیری بمێننەوە، پێویستە هەتا ڕێککەوتنێك سەبارەت بە بناغەی یاریی سیاسی و وەفادارییی بەو بنەمایانە یان بە واتایەکی دیکە بە خودی ڕەوتەکانی دیموکراتیك، بە تایبەت لە نێو نوخبەکانی سیاسی کۆمەڵگادا هەبێ.

((ئادام پرزوریسکی))[2] زانای سیاسی ئەمەریکایی سەبارەت بە دیموکراتیزاسیۆن بەم جۆرە تیۆری خۆی باس دەکا: ((ڕەوتی نیهادینەکردنی ناسەقامگیری و پێوەندیدارکردنی هەموو بەرژەوەندییەکان بەو ڕەوتە)). (Przeworski, 1986).

مەبەستی ((پرزوریسکی)) لەم ڕستەیە ئەمەیە کە لەبەر ئەوەی سیاسەتە دیموکراتیکەکان پێویستی بە کێبەڕکێی ئازاد بۆ بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات هەیە، بەم جۆرە هیچ گرووپێك ناتوانێ لە پێوەندی لەگەڵ سەرکەوتن لەم کێبەرکێیانەدا دڵنیا بێ. لە ڕاستیدا، گۆڕانکاری لە حکوومەتی دیکتاتۆر بۆ دیموکراسی ئەم مانایە دەگەیەنێ کە گرووپێك کە پێشتر دەسەڵاتی بەدەستەوە بووە (وەك دەسەڵاتی سەربازی لە ئەمەریکای لاتین و هتد...) دەست لە دەستێوەردان لە ئاکامی هەڵبژاردن هەڵدەگرن و بەم جۆرە ناسەقامگیری نامێنێ.

ناسەقامگیریی ئاماژە پێکراو دوو ڕەهەندی هەیە کە هەردوو بەشێوەیەکی بەرچاو، هەڕەشە لە گرووپێك دەکا کە کۆنترۆڵی لەدەست داوە. یەکەمین ڕەهەند ئەمەیە کە ڕەنگە ئەم گرووپە لە هەڵبژاردندا سەرکەوتوو نەبن و بەم جۆرە دەسەڵات لەدەست بدەن.

دووەمین ڕەهەندیش ئاماژە بەم بابەتە دەکا کە گۆڕانکاریی کە لە لایەن حکوومەتی نوێ بەڕێوەدەچێ، ڕەنگە زیان بە بەرژەوەندی ئەم گرووپە بگەیەنێ. بەم حاڵەش، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە یاسای بنەڕەتی هەرچەند بە شێوەی سنووردار هێزە سەرەکییە سیاسییەکان پەسەندیان کردبێ و بە لەبەر چاوگرتنی ئەوەی کە هەڵبژاردنەکانیش بە پێی یاسا و عادیلانە بەڕێوە چووە، بەڵام بۆ دابەزاندنی دیموکراسی بە کردەوە پێویستە دۆڕاوەکانی هەڵبژاردن لە ڕێگای بەڵێندان بە ڕەوتی دیموکراتیك، پێڕەوی لە ئاکامی هەڵبژاردن بکەن.

ئەوان (دۆڕاوەکان) نابێ ببنە هێزی دژی دیموکراسی (وەك ئەو کێشانەی کە بۆ دەوڵەتی((ئاکینو)) پاش سەردەمی مارکۆس هاتە پێش) یان ئەوەی کە بە کەڵك وەرگرتن لە دیموکراسی و هەڕەشەی هەڵپەساردنی هەڵبژاردن بکەن (وەك کارێك کە بەرەی ڕزگاریدەری ئیسلامی

(1) Adherence to the Rules of the Game.
(2) Orzeworski.



لە ئەلجەزایر لە ساڵی ١٩٩١ ئەنجامیدا)، هەروەها دۆڕاوەکان نابێ لە بەرامبەر شکستی خۆیان پەنا بۆ توندوتیژی ببەن (وەك ئەوەی دوای هەڵبژاردنی ١٩٩٢ لە ئانگۆلا ڕوویدا).

لە لایەکی دیکەوە، سەرکەوتووەکانی هەڵبژاردنیش دەبێ بزانن کە بۆ هەمیشە لە دەسەڵاتدا نامێننەوە و ئەوانیش لە هەڵبژاردنی دوایی سەرلەنوێ دەبێ بۆ وەدەست هێنانی دووبارەی دەسەڵات خەبات بکەن، بابەتێك کە ناتوانرێ لەبەرچاو نەگیرێ. ڕەنگە دۆڕاوەکان، هەمان حیزبێك بێ کە نوێنەری ڕژێمی سەرەڕۆی پێشوو بوون یان ئەوەی کە دۆڕاوەکان یەکێك لەو گرووپانە بن کە لە ڕژێمی پێشوو بۆ سەقامگیرکردنی دیموکراسی خەباتی کردووە. لە سەرەتای دەیەی ٩٠ لە میانمار و نایجریا، ڕژێمە سەربازییەکان خۆیان بوارد لەوەی کە حیزبەکەیان لە هەڵبژاردندا شکستی خواردووە و ئاکامی هەڵبژاردنیان لەبەرچاو نەگرت. لە کۆتایی ساڵی ١٩٩١ لە ئەلجەزایر لەبەر هۆکارە ئاڵۆزەکان، دەوڵەت کاتێك زانی بەرەی ڕزگاریدەری ئیسلامی لە بەرەبەری سەرکەوتن لە هەڵبژاردن دایە ڕەوتی هەڵبژاردنی دیموکراتیکی هەڵپەسارد.

لە ئانگۆلاس، یەکێك لە حیزبە سەرەکییەکانی وڵات –بونیتا[1]– کە لە شەڕێکی نیوخۆیی درێژخایەن دژی حیزبی دەسەڵاتدار –ئێمپلا[2]– لە ململانێدا بوو، هەر کە لە هەڵبژاردندا شکستی خوارد بە بیانووی ئەوەی کە لە ژماردنی دەنگەکان ساختەکاری کراوە دەستی بۆ چەك برد. لە تەواوی ئەم نموونانە، ڕەوتی پێکهێنانی دیموکراسی بە سادەیی پێچەوانە بووەتەوە.

بە پێچەوانەی ئەم حاڵەتانە، لە زامبیا و مالاوی ڕێبەرانی ڕژێمەکانی پێشوو کە لە هەڵبژاردندا شکستیان خوارد، بەبێ کێشە وازیان لە دەسەڵات هێنا، ئەو کارەی کە زۆربەی حیزبە کۆمۆنیستەکان لە وڵاتانی پێشووی ئەورووپای ڕۆژهەڵات ئەنجامیاندا.

بە گشتی دەبێ بڵێین، دیموکراسی سەقامگیر، پێویستی بە نەبوونی هەڕەشەی جیددی (وەك سوپا تایبەتییەکان لە پیرۆ، کۆلۆمبیا، ئایرلەندای باکوور و هتد...) دژی دەسەڵاتی دەوڵەتە.

لە هەر شوێنێك کە دیموکراسی سەردەکەوێ وەك (زۆربەی وڵاتانی ئەمەریکای لاتین، فیلیپین و کۆریای باشوور)، هێزە سیاسییەکانی پێوەندیدار بە ڕژێمی پێشوو دەبێ پابەندبن بە شێوازەکانی دیموکراسی. بە واتایەکی دیکە گرووپە سەربازییەکان کە بواری مانەوەی ڕژێمی رابردوویان لە دەسەڵات دەرەخساند، دەبێ بگەڕێنەوە سەربازگەکان و لەوێ بمێننەوە.

(1) Unita.
(2) Mpla.





بەڵام بە هەمان ڕێژەش، گرووپە سەربازییەکان کە لە سەردەمی خەبات بۆ دیموکراسی پێکدێن (وەك یەکیەتی نەتەوەیی ئەفریقا لە زیمبابووە، کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقا، ساندنیستەکان لە نیکاراگوا و چریکەکانی ئەفریقای باشوور) دەبێ پابەند بن بە یاساکانی دیموکراسی.

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە کە کێشەی سەقامگیری دیموکراتیك تەنیا تایبەت بە جیهانی سێهەم نییە، ئاماژە بە بابەتی ئایرلەندای باکوور دەکەم. پرسی ئاماژەپێکراو لە بابەتەکانی پێوەندیدار بە گرووپە سەربازییەکان، لە پڕۆسەی تایبەت بە چەکداماڵینی ئایرلەندای باکوور دەرکەوت، هەمان شت کە هەندێك لە خەڵك لەبەر ئەوە هیوایان بە پێکەوە سازانی دیموکراتیك لە ڕێگای دانوستانی کۆمیتەکانی وایت هال و دوبلێن و ستورمونت نییە.

**((سیاسەتی میانەڕۆ لە لایەن حیزبە سەرکەوتووەکانەوە))**

لەگەڵ ئەمانەشدا نایەتە بەرچاو کە تەواوی گرووپ و حیزبەکان مل بۆ یاساکانی هەڵبژاردن ڕاکێشن، بەتایبەتی ئەگەر شکست لە گۆڕەپانی هەڵبژاردن بە مانای لەدەستدانی هەرچی زیاتری بەرژەوەندی حیزبی و گرووپی بێ.

بەم جۆرە بەو ئاکامە دەگەین، سەرەڕای ئەوەی کە گرووپەکان و حیزبە شکست خواردووەکان دەبێ ئاکامی هەڵبژاردن قەبووڵ بکەن، سەرکەوتووەکانیش دەبێ قەبووڵی بکەن کە بۆ کەڵك وەرگرتن لە دەسەڵاتێك کە بە تازەیی بەدەستیان هێناوە، بەربەست و (هێڵی سوور) و سنووری دیاریکراو هەیە. ئەم بابەتە وەك مەرجی سێهەم بەم مانایەیە کە سەقامگیری دیموکراتیك سەرەڕای مەرجی دیکە، بەستراوەتەوە بە میانەڕەوی سیاسی حیزبە سەرکەوتووەکان لە هەڵبژاردندا، هەرچەند زۆربەی براوەکان بە پێی گومان و (هەندێك جاریش پێویستی ڕاستەقینە) خوازیاری چاوخشاندنەوە بەسەر زۆربەی سیاسەتەکانی وڵاتن. بە واتایەکی دیکە ئەگەر حکوومەتە نوێیەکان لە بەدواداچوونی سیاسەتی باس هەڵگر و گرژی خوڵقێن بەتایبەتی کە لە هەندێك حاڵەتدا ئەم سیاسەتانە بە توندی هەڕەشە لە بەرژەوەندی کەسانی دیکە دەکا، خۆ ببوێرن، ئەگەری سەرکەوتن و سەقامگیری دیموکراسی نوێ و لە دایك بوو زۆرترە.

لە ڕاستیدا ئەم جۆرە بەربەستانە کە لە سەری ڕێککەوتوون سەبارەت بە ڕێژەی گۆڕانکاری لە سیاسەتی وڵات بە هۆی گۆڕانی حیزبە دەسەڵاتدارەکان، زۆرتر پێش ئەوەی ڕەوتی دیموکراتیزاسیۆن لە وڵاتدا کامڵ بکا، لە ئاکامی دانوستانی (نهێنی و هتد...) دیاری دەکرێ، کە وابوو ئەمە بەشێك لە ڕەوتی دیموکراتیزاسیۆن. (Huntington 1991, p.15-609). ئەم



بابەتە نیشانی دەدا کە سەرەڕای گرینگی جیاوازی نێوان قۆناغی سەقامگیربوون و دیموکراتیزاسیۆن، پێوەندی گرینگیش لە نێوانیاندا هەیە. بە کورتی، هەر پرسێك کە لە ئاکامی ڕەوتی دیموکراتیزاسیۆن ڕوویدا، ئاسەواری گرینگ لەسەر ڕووداوەکانی دواتر بەجێدێڵێ. نموونە ڤێنزوئێلا بە باشی نیشاندەری گرینگی و ڕۆڵی بەرچاوی بنەمای میانەڕەوی سیاسی وەك یەکێك لە مەرجەکانی سەقامگیری دیموکراتیکە، چونکە بە پێچەوانەی وڵاتانی دیکەی ئەمەریکای لاتین، ئەم بنەمایە بووەتە هۆی ئەوەی کە هەتا حکوومەتی دیموکراتیك پاش ساڵی ١٩٨٥ هەروا بەردەوام بێ. لەم ساڵەدا، دوو پەیمانی دەگمەن لە ڤێنزوئێلا لە نێوان گرووپە سیاسییە سەرەکییەکان مۆر کرا. یەکەمین پەیمان ڕێککەوتننامەی (کرێکار-مالیك) بوو کە بە پێی ئەو ڕێککەوتننامەیە خاوەن سەرمایەکان، دامەزراوە دیموکراتیکەکان وەك ناوەندێك کە لە ڕێگای ئەوەوە، کرێکاران ڕەوشی ماددی خۆیان باش دەکەن، قەبووڵ کردووە. لە لایەکی دیکەوە کرێکارانیش خاوەندارێتی تایبەتی سوود لە لایەن خاوەن سەرمایەکانەوە قەبووڵ دەکەن. (Mccoy, 1988) ئەم ڕێککەوتننامەیە بەم مانایە بوو کە کرێکاران سەرمایەدارییان قەبووڵ کرد و سەرمایەدارەکانیش دیموکراسی قەبووڵ دەکەن)).

دووەمین ڕێککەوتننامە، پەیمانی ((پانتوفیجۆ))[1] بوو کە لە لایەن ٣ حیزبی سیاسی سەرەکی (بەبێ بەشداری حیزبی کۆمۆنیست) مۆرکرا. بە پێی ئەم پەیمانە هەر ٣ حیزبی سەرەکی ئەم وڵاتە، بەبێ سەرنجدان بەوەی کە کام یەك لە هەڵبژاردندا سەردەکەوێ، بەشێك لە پۆستەکانی حکوومەتی پێ دەدرێ و ئامانجی گەشەخوازیی کە لەسەری ڕێککەوتوون جێبەجێ دەکەن و هەروەها پێش بە هاتنی حیزبی کۆمۆنیست بۆ حکوومەت دەگرن.

دیارە ڤێنزوئیلا خاوەنی سەرچاوەی دەوڵەمەندی نەوتە و داهاتەکەی بۆ دابینکردنی هەزینەی چاکسازیی ئابووری و کۆمەڵایەتی بوو. ئەو ڕێککەوتننامانە لە کۆتایی دەیەی ٨٠ و سەرەتای دەیەی ٩٠ بە توندی کەوتبوونە ژێر فشارەوە و دیموکراسی ڤێنزوئیلا مەترسی ڕووخانی لێدەکرا، بەڵام نوخبەکانی ئەم وڵاتە توانییان بە دانوستانی دووبارە سەبارەت بە پەیمان و ڕێککەوتنەکان، درێژە بە دیموکراسی لە ڤێنزوئێلا بدەن. بەهەر حاڵ، سەرەڕای تەواوی ئەم هەڕەشانە دژی دیموکراسی لەم وڵاتەدا، خاڵی سەرەکی ئەمەیە کە ئەم پەیمانانە چەندین ساڵ ببوونە چوارچێوە و سووری گۆڕانکاریی سیاسی و حیزبە سەرەکییەکانی وڵات بە شێوەیەکی کاریگەر پابەند بوون بە ڕەوتی دیموکراتیکەکان لە ڕێگای گەرەنتی بەشداربوونیان لە حکوومەت.

---

(1) Punto Fijo Pact.





لـه فەسـڵی ١ و ٨دا، هـەوڵ دەدەم هـەتا كاریگـەری گەشـەخوازیی ئـەم جـۆرە لـە دیموكراسییەكانی پەیمانی تاوتوێ بكەم.

دیارە، پرسێكی گرینگیش هەیە كە دەستڕاگەیشتن بەم جۆرە ڕێككەوتننانە لە پێوەندی لەگەڵ میانەڕەوی سیاسی لە حكوومەتە دیموكراتیكەكاندا پاش قۆناغی تێپەڕبوون، زۆر دژوار دەكا.

هۆكاری ئەم پرسە ئەمەیـە كـە زۆربـەی لایـەنگرانی ڕژێمـە دیموكراتیكـە نوێیـەكان، بـە شێوەیەكی نالۆژیكانە چاوەڕوانی بەكارهێنانی سیاسەتەكانی دابەشكردنی سەرلەنوێ بە چەشنی رادیكاڵ و خێران. ڕەنگە بەڵگەی ئەوان ئەمە بێ كە، ئەوان ڕەنگدانەوەی بیروبۆچوونی زۆربـەی كۆمەڵگان (وەك ئەفریقای باشووری پاش ڕژێمـی ئاپارتایـد) و مەگـەر نـە ئـەوەی كـە ئـەوان چەندین ساڵ بۆ ئامانجێكی ئەوتۆ خەباتیان كردووە و ڕەنجیان كێشاوە؟

ئەمە لـە حاڵێكدایـە كـە بـە زوویـی حكوومـەتی نـوێ تێـدەگا كـە توانـایی هێنانـەدی داواكارییەكانی (پیشە، مافی باشتر، شوێنی نیشتەجی بوون، تەندروسـتی، چاكسازی زەویـیە كشتوكاڵییەكان)ی ئەوانی نییە و یان لانیكـەم توانـایی ئـەوتۆی هـەتا كاتێـك كـە هەڵـدانی ئابووریی سەقامگیر، سەرچاوەی پێویست بۆ دەسـتەبەركردنی داواكـاریی ئـەوتۆ نەڕەخسـێنێ، نییە. هەروەها بە پێی هەموو ئەو هۆكارانەی لە سەرەوە باسـكران، حكوومـەتی نـوێ نـاوێرێ دەست بەسەر كەلوپەل و داراییەكانیشدا بگرێ، چـونكە خوازیـاری پاراسـتنی ڕێككەوتننامـە سیاسییەكان بە مەبەستی مانەوە و سەقامگیری دیموكراسی نوێیە. ئـەم بابەتـە بەتایبـەت لـە حاڵەتێكدا كە جۆرێك ڕێككەوتن لـە نێـوان نوخبـەكان لـە پێوەنـدی لەگـەڵ سـنووردارکردنی ئاڵوگۆڕ لە سیاسەتەكان لە حكوومەتی دیموكراسی نوێدا هەیە بە باشی دەردەكـەوێ. تەنانـەت ڕەنگە ئەم ڕێككەوتننانە لە دەقی یاسای بنەڕەتی نوێدا بگونجێندرێ. ئەم بابەتەش هەروەها لە حاڵەتێكدا كە حكوومەتی نوێ لە هەوڵی ڕاكێشانی یارمەتی دەرەكی و وەگەڕخستنی سەرمایە لە لایەن دامەزراوە و كۆمپانیا ڕۆژئاواییەكان بێ بەرچاو دەكەوێ.

ئەگەر سیاسـەتەكانی دەوڵـەتی بەرامبـەر بـە كـاركردی بـازاڕی ئـازاد، وەك یـەكێك لـە تایبەتمەندییەكانی دیموكراسـی نـوێ، رادیكـاڵ و نادۆسـتانە بـێ، وەرگرتنـی یارمـەتی ئـەوتۆ دەكەوێتە مەترسییەوە، بەڵام ئەگەر حكوومەتی نوێ وەڵامی پۆزێتیڤ بە داواكاریی لاینگرانـی خۆی نەدا، ئەوان دەتوانن لە مافی دیموكراتیكی تازە وەدەست هاتووی خۆیان لە كەشی سیاسی نوێدا كە لە سایەی دیموكراسیدا ڕەخساوە، كـەڵك وەربگـرن. ڕێـژەی ئـەو فـشارانەی كـە لـەم ڕێگایەوە دەخەنە سەر حكوومەت، لە وڵاتە جۆراوجۆرەكاندا جیاوازە.



ڕەنگە ئەوان ببنە نەیاری حكوومەت و برژێنـە سـەر شـەقامەكان و ڕێپێـوان سـاز بكـەن، كەمكاری بكەن و مانبگرن تەنانەت شێوازی ڕێپێوانی توندوتیـژیش وەرێ بخـەن، هـەروەك لـە زۆربەی وڵاتانی ئەمەریكای لاتین لە كاتی دامەزرانی دیموكراسی نوێیەكانـدا ڕوویـداوە. ئەگـەر ئەم جۆرە نارەزایەتییانە پەرەبستێنێ، لەو كاتەدایە كـە مەترسـی ئاشـكرا دەبـێ. هەڵوێـستی ئەوتۆ نە تەنیا ڕەنگە ببێتە هۆی ناسەقامگیری دیموكراسی، بەڵكو ئەگەری ئـەوە هەیـە ببێتـە هۆی لاوازبوونی ئابووری و زیان گەیاندن بە ستراتیژی گەشەسەندنی حكوومەتی نوێش.

لە كورتی هەتا كاتێك میانەڕەویی سیاسـی لـە لایـەن سـەركەوتووەكانی هەڵبـژاردن وەك یەكێك لە مەرجە گرینگەكانی سـەقامگیری دیموكراتیـك بپـارێزرێ، سـەقامگیری دیموكراتیـك زۆرتر بەردەوام دەبێ.

**((هەژاری وەك كۆسپێك لەسەر ڕێگای سەقامگیری دیموكراتیك))**

لە دەستپێكردنی ڕەوتی دیموكراتیزاسیۆن هەتا نوێترین قۆناغی شـەپۆلی سـێهەم كـە دوای ساڵی ١٩٩٠ەوە، بە دەگمەن لە كۆمەڵگا هەژارەكاندا دیموكراسـی سـەقامگیر پێكهـاتووە و بـە پێچەوانەوە، بەردەوام پێوەندییەكی ڕاستەوخۆ لە نێـوان سـەروەتی وڵات و دیموكراسـیدا بـووە، هەرچەند كـە هیندسـتان لـە نێـوان ڕژێمـەكانی لیـبراڵ دیموراسـی وەك ڕێزپـەڕێك ماوەتـەوە. (Huntington, 1984, p.9-198) دیارە مەبەستم ئەمە نییە كە كۆمەڵگای دەوڵەمەند بـە شێوەی سیستماتیك دەتوانێ دیموكراسـی بـە قـایمی ڕابگـرێ، چـونكە بەڵگـەكان لـە وڵاتـانی دەوڵەمەند و خاوەن نەوتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەم بانگەشەیە ڕەتدەكەنەوە. سەروەت مەرجی پێویست بۆ دیموكراسی نییە.

لەگەڵ ئەمەشدا، زۆربەی كۆمەڵگاكانی ڕوو لە گەشە كـە داهـاتی سـەرانەیان لـە مـاوەی دەیەی ٩٠، كەمتر لە ٦٠٠ دۆلار لە ساڵدا بووە، هـەتا پـێش لـە سـاڵی ١٩٩٠ نـەیانتوانیوە لیبراڵ دیموكراسی سەقامگیر بكەن. (World Bank, 1997).

دیارە چەند ڕیزپەڕێكیش وەك گامبیا (لانیكـەم تـا ١٩٩٤) و بەتایبـەت هینـد هـەبوون، هەرچەند كە زۆربەی ئەوانە بە دیموكراسی ڕێژەیی (نەك لیبراڵ) گەیشتن.

بە پێچەوانەوە، لە تەواوی حاڵەتەكاندا كە یەكێك لە وڵاتانی ڕوو لە گەشە (جگە لە هیند) توانییان سیاسەتی دیموكراتیكی ڕێژەیی یان لیبراڵ لە دەیـەی ١٩٦٠ بـە دواوە پێكبێـنن (وەك ڤێنزوئێلا، كاستاریكا، جامائیكا، بوتسوانا، موریتـانی و سـەنگاپوور) لـە هەنـدێك برگـەدا





داهاتی سەرانە لە ٦٠٠ دۆلار لە ساڵدا تێپەڕیکردووە. هۆیەکی لۆژیکی بۆ ئەوەی کە بۆچی هەژاری کۆسپە لەسەر ڕێگای سەقامگیری دیموکراتیك ئەمەیە کە: لە وڵاتانی هەژاردا ململانێ بۆ دەستراگەیشتن بە سەرچاوەی سنووردار و بەرژەوەندییەك کە دەتوانێ کۆنترۆڵی دەوڵەت لە لایەن حیزبێك یان قۆڵێکی بە دواوە بێ، دەستەبەرکردنی دیموکراسی مەحاڵ دەکا. لەم وڵاتانەدا بەرپرسە دەوڵەتییەکان لە پێوەندی لەگەڵ بەشداری لە ڕەوتی ئاشتەوایی و ڕێککەوتن بە توندی ڕەفتار دەکەن و بەرامبەر بە لەدەستدانی دەسەڵاتیش زۆر بێ مەیلن. لەم جۆرە حاڵەتانەدا هەڵپەساردنی دیموکراسی ڕێگایەکی باشە بۆ بەردەوام بوون لە دەسەڵات. ئەم حاڵەتە زۆرتر لە وڵاتانی خوارووی بیابانی ئەفریقا روویداوە، جێگایەك کە هەژاری بووەتە هۆی پێکهاتنی ڕەوشێك کە پێی دەڵێن ((سیاسەتی زگ)). (Bayart, 1993).

سەرەڕای ئەمەش، زۆرتر هەژاری لەگەڵ ئاستی خوارەوەی خوێندەواری و دەرەتانی فێرکردن و پێوەندیگرتن دایە کە هیچ یەك لە مانە لەڕووی مێژووییەوە پێوەندییان بە دیموکراسی سەقامگیرەوە نەبووە.

ئێستا کە ژمارەیەکی زۆر لە وڵاتانی هەژار و زۆر هەژار دیموکراتیزەبوون و لە ئاکامدا بە ڕێژەیەکی بەرچاو بابەتی پێوەندیی ڕاستەوخۆی نێوان سەرروەت و دیموکراسییان کەم کردووەتەوە، بە هیچ شێوەیەك ئەم باسە کۆتایی پێ نەهاتووە. چونکە ئەگەر ئەم دیموکراسییە نوێ و هەژارانە، نەتوانن خۆیان سەقامگیر بکەن و لە سەدەی بیست و یەکەمدا بەردەوام نەبن، جارێکی دیکە ئەم پێوەندییە، دێتەوە بەرباس. بەڵام ئەگەر بەشێکی بەرچاو لە وڵاتانی هەژار بتوانن دیموکراسییەکانی خۆیان سەقامگیر بکەن، لەم حاڵەتەدا بابەتی پێوەندی نێوان دیموکراسی و سەرروەت بە تەواوی نامێنێ.

**((جیاوازی مەزهەبی، فەرهەنگی و قەومی: بەربەستەکانی دیموکراسی))**

جیاوازی لە ڕادەبەدەری قەومی، فەرهەنگی یان مەزهەبی (بەتایبەت لەو شوێنانەی کە لە نێوان گرووپەکان نایەکسانی ماددی هەیە)، هەردوو ڕەوتی سەقامگیری و تێپەڕبوونی دیموکراسی لەگەڵ کێشە بەرەوڕوو دەکا.

دیارە زاڵ بوون بەسەر ئەم کێشانە لە دیموکراسییەکانی لە حاڵی سەقامگیریدا مەحاڵ نییە، هەروەك چەند نموونەیەك لە دیموکراسی لە وڵاتانی فرە فەرهەنگی، فرە قەومی و فرە مەزهەبی وەك سویسرا، کەنەدا، مۆریتانیا، ترینیداد و تەنانەت بۆ ماوەیەکی درێژخایەن لە لوبنان هەیە.



دارشتنی یاسای بنەڕەتی و هاوپەیمانی یان ڕێککەوتننامەکانی نێوان نوخبەکان دەتوانێ بە پابەندکردنی گرووپەکان بە پێکهاتەکانی دیموکراسی، ببێتە هۆی سەقامگیری دیموکراسی. بەڵام بەبێ بارودۆخێکی ئەوتۆ بۆ قەرەبوو کردنەوە، مانەوەی دیموکراسی سەرەڕای ئەم جۆرە جیاوازییانە ئاسان نییە.

ئەم بابەتە لە هەندێك لە پرسەکان کە بووە هۆی پێکهێنانی گرژی و ئالۆزی لە نێوان گرووپە قەومی و نەتەوەییەکان لە ئەورووپا و کێشەی نوێ لە ساڵەکانی نێوان جەنگ، بۆ دیموکراسی، بە باشی دەرکەوت. وەك پۆڵۆنیا، چیك و سلۆڤاکیا و بەتایبەتی یوگسلاڤیا.

زۆر نموونەی نوێ لەم پێوەندییەدا هەیە. شەڕی توندی نێوان چینییەکان و مالاوییەکان لە مالیزیا لە دەیەی ١٩٦٠ و لە نێوان فیجییە ڕەسەنەکان و بە ڕەگەز هیندییەکان لە فیجی لە کۆتایی دەیەی ٨٠ و لە ساڵی ٢٠٠٠ کە بە هەڵپەساردنی دیموکراسی کۆتایی پێیهات، نموونەگەلێك لەم چەشنەن. گرژی و ئالۆزیی ئاشکرای نێوان گرووپە موسڵمان و ناموسڵمان و چینییەکان لە ئەندونزیا زۆرجار بە شێوەی توندوتیژییەکی مەترسیدار سەری هەڵداوە.

کیشوەری ئەفریقاش گۆڕەپانی هەندێك لە نوێترین نموونەکانی جیاوازی قەومی-فەرهەنگییە. وەك ناسەقامگیریی بەردەوام لە نایجریا، ئەنگۆلا و سودان. لە کینیا کە بە دژواری دەتوانین لە ڕیزی جیاوازییە قەومییەکان دابنێین، سەرهەڵدانی کێشەی کەمی زەوی، گەشەی لە ناکاوی حەشیمەت و نایەکسانی بەربڵاوی کۆمەڵایەتی و ناوچەیی، فشارێکی زۆری بۆ دیموکراسی سەرلەنوێی لە دایك بوو کە لە سەرەتای دەیەی ١٩٩٠ لە لایەن لایەنگرانی ڕۆژئاوایی پێکهاتبوو، هێناوە. لە نزیك ئەورووپای ڕۆژئاوا، دیمەنی تاڵی دابەشکردنی یوگسلاڤیا لە دەیەی ٩٠ و بەتایبەتی شەڕی قەومی، بە ئاشکرا نیشاندەری ئەم بابەتەیە. لە شوێنەکانی دیکەش مەزهەبی توند بووەتە هۆی لاوازیی سیاسەتە دیموکراتیکەکان.

لەم حاڵەتەدا پێکدادانی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ و هەندێك جار توندوتیژ لە نێو دینی ئیسلام لە وڵاتانی ئەلجەزایر و بەنگلادیش، بە باشترین شێوە دەبینرێ. لە هیندیش دیموکراسی بە هۆی هەڕەشەکانەوە، سەرەتا بە هۆی گرژی و ئالۆزی ناوچەیی و دواتریش بە هۆی دەستدرێژی مەزهەبی و بناژۆیی هیندو ڕۆژ بە ڕۆژ لەرزۆکتر دەبێ. (Ckaviraj, 1996).

لە تەواوی ئەم نموونانەدا، جیاوازیی مەزهەبی و قەومی بووە هۆی گەلە کۆمەکیی گرووپە جیاوازەکان و زۆرتر هەڵگری ئاسەواری دژە دیموکراتیك و ڕێك نەکەوتنە.

ڕەنگە هەتا کاتێك گرینگی وەفاداریی فەرهەنگی، قەومی و مەزهەبی نەچێتە خانەی پرسە تایبەتییەکانەوە و لە پێناوی بەڵێنییەکی بەربڵاو بە هاووڵاتیی سێکۆلار (جیا لە مەزهەب)، چەك نەکرێ، ڕەوتی سیاسی دیموکراتیك سەقامگیر نابێ.

وادێتە بەرچاو کە ئەم باسە لە وڵاتانی ئیسلامی (وەك تورکیا، میسر و ئەلجەزایر) کە بەهێزترین لایەنگرانی ڕەوتی دیموکراسی لەواندا تایبەتە لە کەرتەکانی سێکولاری کۆمەڵگا، ڕاستە.

لە ئیسرائیلیش کەسانێك کە بڕوایان بە لاوازبوونی نەریتە دیموکراتیکەکان هەیە و کەسانێك کە ڕەوایی دەوڵەت بە ڕێژەیەکی کەم قەبووڵ دەکەن، زۆرتر لە نێو جوولەکە بناژۆکانن.

## خۆڕاگریی دیموکراتیك

ئێستا کە ڕەوایی، قەبووڵی بنەماکانی یاری، میانەڕەویی سیاسی و نەبوونی هەژاری و ڕەوشی ڕوو لە گەشە لەڕووی مەزهەبی، قەومی و فەرهەنگی، بارودۆخی پێکهاتەیی پێویستن بۆ پێکهێنانی سەقامگیریی دیموکراتیك، کام یەك لە فاکتۆرەکان دەبنە هۆی کاریگەربوونی ئەم هۆکارانە لە ((سەقامگیریی دیموکراتیك))؟

چوار کەس لە زانایانی سیاسی ئەمەریکا لە لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنەدا سەبارەت بە مانەوە و فەوتانی ٢٢٤ ڕژێمی سیاسی لە ١٣٥ وڵات لە ماوەی ساڵەکانی ١٩٥٠ هەتا ١٩٩٠، چەند مەرجیان کە بۆ هێنانەدی (خۆڕاگریی دیموکراتیك) پێویستە، دەستنیشان کردووە.

یەکەم، سەرەڕای ئەم ڕاستییە حاشاهەڵنەگرە کە ڕابردووی زۆربەی دیموکراسی و بوونی دیموکراسییەکان لە دراوسێیەتییان بووەتە هۆی شانسی زۆرتری سەقامگیری و مانەوەی دیموکراسی، ئەوان بۆیان دەرکەوتووە کە ئاستی خۆشگوزەرانی و سەروەت هۆکارێکی پشتیوانییە لە سەقامگیریی دیموکراتیکدا. چونکە لە لێکۆڵینەوەکانیاندا، هیچ سیستەمێکی دیموکراتیك کە داهاتی سەرانەیان زیاتر لە ٦٠٠٠ دۆلار بێ، تووشی ڕووخان نەهاتوون.

هیچ یەك لە دیموکراسییەکانی ((شەپۆلی سێهەم)) لە ئەفریقا ئەم ڕەوشەیان نەبووە، لە ئەمەریکای لاتینیش تەنیا ئەرژەنتین و ئۆرۆگوەە داهاتی سەرانەیان سەرووی ٦٠٠٠ دۆلار بووە



و لە ئاسیا و ئەورووپای ڕۆژهەڵاتیش ژمارەیەکی زۆر کەم لە دیموکراسییەکان (سلۆڤانیا و کۆریا) خاوەنی ئەم ڕەوشە بوون.

دیارە هەندێ دیموکراسی بە داهاتی کەمتریش سەقامگیر ماونەتەوە، وەك جامائیکا، کاستاریکا، بوتسوانا و ڤێنزۆئێلا.

دووەم: ئەگەری سەقامگیری دیموکراسییە هەژارەکان تەنیا لە حاڵەتێکدایە کە ئابووری ئەوان تووشی دابەزین و هاتنەوە یەك نەبێ. چونکە ((هەڵدان)) دەتوانێ هەژاری قەرەبوو بکاتەوە.

بەڵام لە زۆربەی دیموکراسییە نوێیەکان (ڕۆژهەڵات و باشوور) لە دەیەی ٩٠، ڕەوتی هەڵدان زۆر لەسەرەخۆ و لاوازە، کەوابوو لە بەرامبەر هەڕەشەی دابەزینی ئابووریشدا زۆر زوو زیانیان پێدەگا.

سێهەم، ئەوە بوو کە ئەگەری سەقامگیری دیموکراسییە هەژارەکان لە کاتێکدا کە نایەکسانییەکان لە ئاستی داهاتی خەڵك لەم وڵاتانەدا کە بێتەوە یان هاوسەنگتر بێ، زۆرتر دەبێ.

چوارەم بریتییە لەوەی لە هەر شوێنێك سیستەمی دیموکراسی پێشتر جارێك ڕووخابێ، دیموکراسی نوێ لە ڕەوشی ئابووریدا لاواز، زووتر زیانی پێ دەگا. ئەمە هەمان بابەتی جێگای نیگەرانییە کە لە زۆربەی وڵاتانی ئەفریقایی و ئەمەریکای لاتین، کە فەرهەنگی کودەتا لەواندا بە قووڵی سەقامگیربووە، دەبینرێ. نایجیریا و لەم دواییانەش لە ئاسیا کودەتای سەربازی ١٩٩٩ی پاکستان نموونەیەکی باشە بۆ ئەم بابەتە.

پێنجەم، وادێتە بەرچاو تەمەنی ڕژێمە دیموکراتیکە پەرلەمانییەکان زیاترە لە ڕژێمە وێکچووەکانی سەرۆك کۆماری.

زۆر هۆکاری ئاڵۆز بۆ سەلماندنی ئەم بانگەشەیە هەیە، بەڵام هۆکاری سەرەکی بریتییە لەوەی کە سیستەمەکانی سەرۆك کۆماری زۆرتر دەبنە هۆی پێکهێنانی بەربەست لە پێوەندی نێوان دەزگای بەڕێوەبەری و یاسادانان، لە حاڵێکدا سیستەمە پەرلەمانییەکان دەبنە هۆی پێکهێنانی دەزگای بەڕێوەبەری کە حیزب یان هاوپەیمانییەك لە حیزبە دەسەڵاتدارەکان، بۆخۆیان لە دەزگای یاساداناندا بەشدارن.

بەکورتی، دیموکراسییەکان تەنانەت لەنێو هەژارترین نەتەوەکانیشدا دەتوانێ سەقامگیر بمێنێتەوە و ئەمە لە حاڵێکدایە کە یەکەم، بەڕێوەبەریی گەشەسەندن لە دەستی نەتەوەکاندا بێ





و ببنە هۆی کەمبوونەوەی نایەکسانییەکان، دووەم، رەوشی نێونەتەوەیی گونجاوبێ و دامەزراوە پەرلەمانییەکانیش هەبن. (Przeworski, 1996, p.9).

هیچ نموونەیەك باشتر لە رەوشێك کە بووە هۆی پێکهێنانی قەیرانی جیددی بۆ دیموکراسی ڤێنزوئیلا لە کۆتایی دەیەی ٨٠ و سەرەتای دەیەی ٩٠، ئەم بابەتەشی ناکاتە: ((لەبەر دابەزینی بەهای نەوت لە دەیەی ٨٠) کە بووە هۆی کەمبوونەوەی مووچە هەتا ٤٠٪ و لە ئاکامدا بەرزبوونەوەی نابەرامبەرییەکان، لە حاڵێکدا بوو کە دەزگای بەڕێوەبەریش لەگەڵ حیزبی زۆر بەهێز لە دەزگای یاسادانان بەرەوڕووبوو. (Coppedge, 1992).

دوایین فاکتۆری گرینگی پێکهێنەری خۆڕاگریی لە سیاسەتە دیموکراتیکەکاندا، کۆمەڵگای مەدەنیی بەهێز و پلۆڕاڵە. کۆمەڵگای مەدەنی پێکهاتووە لە کەرتەکانی ئابووری، سیاسی، فەرهەنگی، کۆمەڵایەتی و هتد... کە لە ئاکامی رێککەوتننامەی خۆبەخشانە یان تایبەتی لەلایەن تاکەکان و گرووپەکان و لە دەرەوەی چاودێری راستەوخۆی دەوڵەت پێکهاتووە. (Held, 1987, p.271)

ئەم گرووپانە رەنگە لاوان، یەکیەتییە تیجارییەکان، رێکخراوەکانی بازرگانی، ئەزموونەکانی سینفی یان مەزهەبی، راگەیاندنە سەربەخۆکان و هەروەها ئەو گرووپانەی کە بەرژوەندی هاوبەشیان هەیە، بن.

بەم حاڵەش، ئەگەرچی رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی لە هەر شوێنێك کە شارنشینی و ئاڵوگۆڕی پێکهاتەیی رووی دابێ، پەرەیان ئەستاندووە (بەتایبەت لە ئەمەریکای لاتین)، بەڵام دەسەڵاتی کۆمەڵگای مەدەنی بەرێژەیەکی زۆر لە کۆمەڵگایەك بۆ کۆمەڵگایەکی دیکە جیاوازە و ئەم حاڵەتە بەتایبەتی لە ئەفریقا بەباشی دەبینرێ. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی زۆربەی کۆمەڵگاکانی جیهانی سێهەم ئەمەیە کە دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنیش تەنانەت تا ئەو ئاستەی کە ئیزنی بوونیان هەیە — لەژێر نفووز و بە واتایەکی دیکە کۆنترۆڵی دەوڵەتە و بەجۆرە بوونەتە رێکخراوگەلێك بۆ دەوڵەت.

بەڵام هەروەك ((سکلار))[1] زیرەکانە ئاماژەی پێ دەکا، ((رەنگە لە نێو کۆمەڵگای مەدەنیدا هێندێك بوار هەبن کە لەواندا شێوازەکانی دیموکراتیك پەرەیان ئەستاندبێ لە هەمان کاتدا بوارگەلی دیکەش هەبن کە ئەو رەوتە لەواندا بەم ئاستە نەگەیشتبێ)). ئەمە بابەتێکە کە دیامۆند لە تێگەیشتنی خۆی لە ((دیموکراسی روو لە گەشە)) هێناویەتە بەر باس. (Diamond, 1999)

(1) Sklar.







# دەرەنجام

تیۆری جۆراوجۆر لە هەوڵی شیکردنەوەی ڕێگاکانی گەیشتن بە دیموکراسین. تیۆریسیەنەکانی نوێگەرا (مۆدێرنیزاسیۆن) پێیان وایە کە ئاسەواری سیاسی هەڵدانی ئابووری بە تێپەڕبوونی زمان — وەك ڕەوتێکی سێکۆلاری سەرەکی — دەبێتە هۆی پێکهاتنی هێزە سیاسییەکان بە بەرژەوەندیی بەهێزی دیموکراتیك لەنێو کۆمەڵگای مەدەنیدا. (Lefwich, 1996)

تیۆریسیەنەکانی تێپەڕکردن، پێ لەسەر ڕۆڵی دانوستان لە نێوان نوخبەکان و ڕێککەوتننامەکان لە ڕەوتی دیموکراتیزاسیۆن دادەگرن.

تیۆریسیەنەکانی پێکهاتەیش تەئکید لەسەر هاوسەنگ کردنی گۆڕاوەکانی نێوان هێزە چینایەتییەکان دەکەن.

تیۆریسیەنەکانی دیکەش پێ لەسەر ئاسەواری فشارەکان و هۆکارە نیونەتەوەییەکان دادەگرن. نێوەڕۆکی ئەم بیرۆکانە هەرچی بێ، ئەم بابەتە کە ((ئەگەر دیموکراسییەکان دەیانەوێ بەردەوام بن، پێویستیان بە سەقامگیربوون هەیە))، هەر لەسەر جێی خۆیدا دەمێنێتەوە. ئەگەر هەروەك ڕوانگەی زاڵ تەئکید لەسەر ئەوە دەکا، دیموکراسی گەرەنتی حکومەتی دڵخواز و حکومەتی داخوازی دیموکراتیکیش دەبێتە هۆی پێکهێنانی گەشەسەندنی و (هەژاریی لە جیهاندا لەنێو دەبا)، کەوابوو پرسیاری سەرەتای ئەم فەسڵە هەروا وەك سەرەکیترین بابەتی جێگای باس دەمێنێتەوە کە ئایا دیموکراسییە نوێیەکان بەردەوام دەبن؟

لێرەدا سێ خاڵ سەرەکی هەیە

یەکەم خاڵ ئەمەیە کە، بەپێی زانیارییە بەراوردکاری و مێژووییەکان، بوونی تەنیا ١ یان ٢ مەرج لە مەرجەکانی ئاماژەپێکراو لەم فەسڵەدا، سەقامگیریی دیموکراتیك گەرەنتی ناکا، لە حاڵێکدا بوونی تەواوی ئەم مەرجانە ئەگەری ئەو زیاتر دەکا. هەرچەند ڕەنگە نەبوونی هەندێك لە مەرجەکان بەهۆی کارلێهاتوویی مەرجەکانی دیکە، قەرەبوو بکرێتەوە.

بۆ وێنە کاریگەریی نێگەتیڤی بوونی جیاوازیی لە ڕادەبەدەری فەرهەنگی یان قەومی ڕەنگە بە دارشتنی ورد و ژیرانەی یاسای بنەڕەتی یان میانەڕەویی سیاسی یان بوونی هاوپەیمانی بەربڵاو قەرەبوو بکرێتەوە.



بەڵام کێشەکە لێرەدایە کە ژمارەیەکی کەم لە دیموکراسییە نوێیەکان خاوەنی ئەم مەرجانەن، لەبەر ئەم هۆیە، سەقامگیریی بەربڵاوی دیموکراتیك خاوەنی دووردیمەنێکی دڵخواز نییە. کەوابوو چاوەڕوانی پێکهاتنی ڕەوتی پێچەوانە (دژی دیموکراتیك) لە دەیەی یەکەمی سەدەی بیست و یەکەم، دوور لە زەین نییە.

هەرچەند کە فشاری بەرچاوی نێونەتەوەیی دژی ڕەوتی پێچەوانە لە ئارادایە، ڕەنگە ئەم ڕەوتە سەرەتا لە دیموکراسییە بچووك و ڕێژەییەکان ڕووبدا، بەڵام بۆ پەرەپێدانی ئەم ڕەوتە پێویستی بە ڕوودانی چەند حاڵەتی ((گرینگ)) هەیە.

دیار ڕەنگە ((دیموکراسی درۆزنانە))[1] بەردەوام بێ چونکە لە بنەڕەتدا بە هیچ شێوەیەك دیموکراتیك نەبوون. ئەم دیموکراسییانە، ڕواڵەتێکی فریوکارانەی لە دامەزراوە دیموکراتیکەکان هەیە کە بە ئاسانی ڕاستیی نادیموکراتیك و سەرەڕۆیانەی حکومەت دەگۆڕێ و بە بەرگی دیموکراتیك دایدەپۆشن.

وشەی ((دیموکراسی درۆزنانە)) ب مەبەستی جیاوازیدانان لەنێوان ئەم دیموکراسییانە و دیموکراسییەکانی هەڵبژاردنی ڕەسەن و لیبراڵ دیموکراسی کەڵکی لێ وەردەگیرێ، دەتوانین لەم پێوەندییەدا ئاماژە بە وڵاتانی خوارەوە بکەین: مەکزیك، ئۆگاندا، ئەندونزیا و هەروەها پیرۆ، ئۆردۆن و زیمبابووە بکەین. (Diamond, 1999, p.15)

دووەمین خاڵ بریتییە لەوەی کە، دەبێ لەبیرمان بێ لەسەر بنەمای ئەزموونی مێژوویی ڕوانگەی ڕۆژئاوا، دیموکراسیی بەردەوام وەك ئامانجێکی دڵخواز سەیر دەکرێ.

بۆ وێنە لە کۆتایی دەیەی ٩٠ لیپسێت دەنووسێ کە ((دیموکراسی تەنیا ئامرازێك لە دەستی گرووپە جۆراوجۆرەکان بۆ دەستراگەیشتن بە ئامانجی خۆیان و گەڕان بە دوای کۆمەڵگای دڵخوازدا نییە، بەڵکو دیموکراسی بۆخۆی، کۆمەڵگایەکی دڵخوازە)) (Lipset, 1960, p.403).

هەرچەند ئەمڕۆکە داواکاریی زۆر بۆ دیموکراسی لە وڵاتە جۆراوجۆرەکاندا هەیە، بەڵام دەبێ بزانین کە ئەم داواکارییانە، هێشتا نەبوونەتە جیهانی. بۆ وێنە هەندێك لە نوخبە نەریتییە موسڵمانەکان پێیان وایە کە دیموکراسی دامەزراوەیەکی ڕۆژئاواییە و لە ئاکامدا بۆ کۆمەڵگای ناڕۆژئاوایی گونجاو نییە. (Bromcy, 1997)

(1 ) Pseudo-Democracy.





بیرۆکەیەکی ئەوتۆ لە ناوچەکانی باشووری ئۆقیانووسی ئارام هەیە. بۆ وێنە بڵاوکراوەی ((فیجی تایمز))[1] لە ساڵی ١٩٩٢، لە دیموکراسی وەك ((گۆڵێکی بیانی)) کە ریشەکەی لە خاکی فیجی ناڕوێ، باس کردووە. (Larmour, 1995)

لە سەنگاپووریش روانگەیەك لەژێر ناوی ((روانگەی لی))[2] هەیە کە لەسەر ئەو باوەڕەیە ((دیموکراسی لە بنەڕەتدا دیاردەیەکی رۆژئاواییە و لەگەڵ فەرهەنگەکانی نارۆژئاوایی ناگونجێ)).

لە وڵاتانی دیکەش هەندێك لە نوخبەکانی لاینگیری مۆدێرنیزانسیۆن، پێیان وایە کە رەنگە دیموکراسی ببێتە کۆسپ لەسەر رێگای ((سیاسەتی خێرای ئابووری))[3]. کەوابوو ئەم کەسانە پێیان کە پێکهێنانی لیبراڵ دیموکراسی هاوشان لەگەڵ سیاسەتی خێرای ئابووری دەتوانێ کردەوەیەکی پێشواده و تەنانەت ((مەترسیدار)) بێ.

ئەڵمانیای سەردەمی بیسمارك، ژاپۆنی پاش شۆڕشی میجی لە ساڵی ١٨٦٨، کۆریای دوای ١٩٦٠ و کۆماری گەلی چین پاش ساڵی ١٩٨٠ نموونەگەلی باشن بۆئەم روانگەیە.

لەڕاستیدا دەوڵەتەکانی چین و کوبا، بەترسەوە، ئەزموونی سۆڤییەتی پێشوو لە پێوەندی لەگەڵ تێکەڵاوکردنی دیموکراسی سیاسی و ئازادیی ئابووری، بەردەوام لەبەر چاویان گرتووە.

سێهەمین خاڵ وەك دوایین خاڵی ئەم باسە، جیاوازیی ئازارهێنەر لە پێوەندی لەگەڵ دیموکراسییەکان بەگشتی و لیبراڵ دیموکراسی بەتایبەتی پێك دێنێ.

ئەم جیاوازییانە بەم شێوەیەکە، رەنگە دیموکراسییەکان هاوکات یان سەرەڕۆ و توندڕەو یان پارێزگاربێ.

ئەوان دەتوانن ئەوەندە توندڕەو (رادیکاڵ) بن کە هیچ بیرۆکەیەکی دیکەی سیاسی نەتوانێ لەوودا گەشە بکا و خاوەنی مافی سیاسی و ئازادییە مەدەنییەکان بێ. بەڵام ((پرزورسکی)) پێی وایە کە پارێزگاریی کۆمەڵایەتی و ئابووری، وەك بەهای پێویست بۆ دیموکراسی سەیر دەکرێ. چونکە هەر ئەندازە کە دیموکراسی لە بوارەکانی سەرەوە توندڕەوبێ، لە رەهەندەکانی دیکە دەبێ بە پارێزەوە هەڵسوکەوت بکا.

خاڵی سەرەکی لەم باسەدا ئەمەیەکە، ئەگەرچی لاینگرانی دیموکراسی بنەمای یاساییان لە یاسای بنەڕەتی خۆیاندا گونجاندووە و بۆ نیهادینەکردنی لە سیستەمی سیاسی خۆیان تێدەکۆشن، بەڵام دیموکراسییەکان بە یەك ئەندازە لە نیهادینەکردنی مافی ئابووری و

(1) Fiji Times.
(2) Lee thesis.
(3) Urgent Tasks of Economic Trans Transformation.



کۆمەڵایەتی وەك ئاسایشی پیشە، لانیکەمی داهات بۆ هەر تاکێك لانیکەمی دەستراگەیشتن بە ئامرازەکانی خۆشگوزەرانی و تەندروستی سەرکەوتوو نەبوون. (هەرچەند ئامارەکان دەریدەخەن رەوشی ئەوان لە رژێمە پاوانخوازەکانی پێشوو باشتر بوو).

دیارە زۆربەی لیبراڵ دیموکراتەکان و ئابووریناسانی نیوکلاسیك پێیان وایە کە ئەم مەرجانە (کە چینییەکان وەك ژیان[1] باسی لێوەدەکەن) مافی تاکەکەس نین، بەڵکو ئاسەواری هەڵدانی ئابوورییەکە دیموکراسی لە درێژخایەندا دەتوانێ پێکی بێنێ. کەوا بوو بەبێ بوونی هەڵدانی ئابووری، هیچ رژێمێك ناتوانی ئەم مافانە بۆ خەڵك دەستەبەر بکا.

هەروەها رەنگە دیموکراسی لە رەهەندێکی دیکەوە پارێزگار بێتە بەرچاو، ئەم رەهەندە بریتییە لەو کێشە و گیروگرفتانەکە دیموکراسی لەکاتی هەڵگرتنی هەنگاوی خێرا بە مەبەستی کەمکردنەوەی نابەرامبەرییە پێکهاتەییەکان کە لە رژێمی پێشوو بەجێ ماوە، لەگەڵی بەرەورو دەبێ. چونکە هەرچەند حکوومەتە دیموکراتیکە نوێیەکان و یان تەنانەت جۆری کۆنترلی ئەو، پابەندن بە کەمکردنەوەی هەژاری و بردنەسەری ئاستی خۆشگوزەرانی خەڵك، بەڵام زۆرتر بۆ بەڕێوەبردنی کاری ئەوتۆ پێویستیان بە سیاسەتی توندڕەوانە و بەبێ رێککەوتنی گشتی هەیە. کێشەکە لێرەدایە کە ئەم جۆرە هەڵسوکەوت و سیاسەتانە رەنگە ببێتە هۆی پێشێلکردنی ئەو پەیمانانەی کە لە سەرەتادا بوونەتە هۆی پێکهێنانی دیموکراسی.

جیاوازییەك کە لە خاڵی کۆتایی باسە بەرچاو دەکەوێ ئەمەیە هەڵسوکەوتی نادیموکراتیك و یەك لایەنە لە قۆناغی سەرەتایی گەشەسەندن بۆ دامەزراندنی کۆڵەکەکانی هەڵدانی ئابووری و تەنانەت دیموکراسی سەقامگیر لە درێژخایەندا پێویستە.

بۆ روونبوونەوەی زیاتری ئەم باسە ئاماژە بە نموونەیەك لە فەسڵی یەکەمدا دەکەم. چاکسازیی زەوییە کشتوکاڵییەکان نموونەیەکی ئاشکرایە. بەشێوەی گشتی لەسەر ئەم بڕوایەن کە چاکسازیی زەوییە کشتوکاڵییەکان یەکێك لە مەرجە گرینگەکانی گەشەسەندنی کشتوکاڵی و خۆشگوزەرانی گوندنشینەکانە و بەم جۆرە دەبێتە هۆی سەقامگیریی دیموکراتیك. بەڵام خاوەن زەوییەکان بە هیچ جۆرێك لە چاکسازی زەوییە کشتوکاڵییەکان رازی نین. وەك ئاسیا و ئەمەریکای لاتین و زۆرتر ئەم گرووپە بەرژەوەندیی بەهێز لەگەڵ پێوەندی زۆر نزیك بە دەوڵەت پێك دێنن.

لە ئاکامدا حکوومەتە دیموکراتیکەکانی جیهانی سێهەم وەکوو فیلیپین پاش دامەزرانی سەرلەنوێی دێموکراسی لە ساڵی ١٩٨٦ و پاکستان لە سەردەمی بۆتۆ لە ١٩٧٠، بە دەگمەن

(1) Subsistence Right.





توانیویانە لە بەرامبەر بەرژوەندیی تاکەکەسی خاوەن زەوییەکان هەڵسوکەوتی کاریگەر ئەنجام بدەن و دەرەتانی دەستراگەیشتن بە خۆشگوزەرانی و دەسەڵات بۆ گوندنشینەکان برەخسێنن، لە حاڵێکدا چاکسازی زەوییە کشتوکاڵییەکان بۆ ئەم مەبەستە گەلاڵە و بەڕێوەدەچێ. (Herring, 1979)

دیموکراسی هیندیش سەرکەوتنی کەمی لە بەڕێوەبردنی چاکسازی زەوییە کشتوکاڵییەکان بەدەست هێناوە و گوندنشینە هەژار و بێ زەوییەکان هەروا لە هیندا هەن. هەرچەند لە هەندێك لە هەرێمەکان وەك کرالا، لەم بوارەدا سەرکەوتنی گەورەی بەدەست هێناوە.

بەکورتی دەتوانین بڵێین کە سیاسەتە دیموکراتیکەکان بە دەگمەن وەك سیاسەتی گۆڕانکاریی رادیکاڵی ئابووری هەڵسوکەوتی کردووە، لە حاڵێکدا رەنگە گۆڕانکاریی رادیکاڵ هەمان خاڵی سەرەکیی لە رەوتی گەشەسەندندا بێ و ئەمە یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانە کە دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەتا پێوەندیی نێوان گەشەسەندن و دیموکراسی جیاوازبێ دەتوانین بڵێین کە سیاسەتی دیموکراتیکی سەقامگرتوو، سیاسەتگەلێ پێکەوە سازان، ئاشتخوازانە و میانڕەوانەیە. لەبەر ئەم هۆیەیە کە لێکۆڵینەوەی دیموکراسی لە کۆمەڵگا هەمە چەشنەکان وەك ئەو کۆمەڵگایانە کە لە ڕووی ئاستی داهات، چین، قەوم و فەرهەنگ یان مەزهەب دابەش بوون، مەحاڵە.

ئەگەر دیموکراسی لیبراڵ بێ یان سۆسیالیستی، لۆژیکی سیاسەتە دیموکراتیکەکان وادەخوازن کۆدەنگ و پارێزگار بن. بۆ زۆر کەس ئەم تایبەتمەندییەی دیموکراتیك تایبەتمەندییەکی گونجاوە لە حاڵێکدا کەسانی دیکە وەك خاڵی لاواز سەیری دەکەن.

بەم جۆرە ئەم بۆچوونە سەرهەڵدەدا کە دێموکراسی دەبێتە هۆی گەشەسەندن لە هەندێك لە کەرتەکانی کۆمەڵگا نە بە گشتی.

لە هەمان کاتیشدا دێموکراسی دەبێتە هۆی پێکهاتنی بزووتنەوە دیموکراتیکەکان لە چەندین بەشی کۆمەڵگا نەك بەگشتی.

هەروەها رەنگە ئەم بیرۆکەیەش هەبێ کە دێموکراسی لە چەمکێکی دیکەدا روو لە گەشە و کامڵبوونە. لەسەر ئەم بنەمایە دیموکراسی رێژەیی و درۆزنانەش ئەگەر بەردەوام بن رەنگە ببنە دیموکراسی هەڵبژاردن و تەنانەت لە کاتی خۆیدا ببنە دیموکراسی راستەقینەی لیبراڵ. لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر لە هەر کاتێکدا دیموکراسی نوێ سەقامگیر بێ، دەست دەکەن بە کۆکردنەوەی ئامرازی سیاسی و توانایی پێویست بە مەبەستی کەمکردنەوەی لەسەرەخۆ و بەردەوامی نابەرامبەرییەکان لە دەستڕاگەیشتن بە سەرچاوە و دەرەتانەکانی لە سەرەخۆ و بەردەوامی



نابەرامبەرییەکان لە دەستڕاگەیشتن بە سەرچاوە و دەرەتانەکانی ئابووری. ئەم رەوتە هەمان رەوتی لەسەرەخۆ، نارێك و پێك و سێکولارێك بوو کە لە زۆربەی وڵاتانی ئەورووپای رۆژئاوا بە درێژایی سەدەی ٢٠ روویدا و لە ئاکامدا تاکەکان سەرەڕای مافی مەدەنی و سیاسی بوونە خاوەن هەندێك مافی کۆمەڵایەتی و ئابووریش. (Marshall, 1950)

بەڵام جیاوازییەکی ئاڵۆز لەم باسەدا هەیە ئەویش ئەمەیە کە ئەم جۆرە ئاڵوگۆڕانە بۆ پێکهێنانی سەقامگیری دیموکراتیك، زۆر لە سەرەخۆیە، بەتایبەت لەو شوێنانەی کە دیموکراسی لە داوی ئاپارتایدی کۆمەڵایەتی گرفتار بووە.

لە کۆتاییدا دەبێ بڵێین کە تەواوی ئەم بیرۆکانە نیشانی دەدا کە گەشەسەندن و پێشکەوتن خاوەنی ئامانجی زۆرە کە دیموکراسی تەنیا یەکێك لە ئامانجەکانییەتی.

خاڵێکی دیکە ئەمەیە کە ناتوانین بیسەلمێنین کە رژێمە دیموکراتیکەکان دەتوانن باشتر لە رژێمە دیموکراتیکەکان، ببنە هۆی گەشەسەندنی ئابووری. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەندێك لە دەوڵەتە دیموکراتیکەکان-هەرچەند زۆر لیبراڵ نەبوون- توانیویانە زۆر کاریگەرتر لە دەوڵەتە نادیموکراتیکەکان، گەشەسەندنی ئابووری دەستەبەر بکەن.

بە کورتی دەبێ بڵێین کە چەندین نموونە لە نێو هەردوو رژێمی دیموکراتیك هەیە کە لە پێکهێنانی گەشەسەندنی ئابووری سەرکەوتوو بوون، کەوابوو بە روونی دەردەکەوێ کە جۆری رژێم لە پێکهێنانی گەشەسەندن، رۆڵی زۆر کەمی هەیە.

ئێستا چۆن دەتوانین ئەم جیاوازییانە شی بکەینەوە، پێم وایە کە وەڵامدانەوە بەم جیاوازییە دەبێ لە تایبەتمەندییەکان و توانایی دەوڵەتەکان، بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە دیموکراتیکن یان نا، بگەڕێین، بە کورتی بەم جۆرە دەوڵەتانە کە رۆڵی گرینگیان لە گەشەسەندن هەیە دەڵێم ((دەوڵەتی گەشەخواز))[1].

ئێستا ئەم پرسیارە دێتە گۆڕێ کە مەبەست لە ((دەوڵەتی گەشەخواز)) چییە؟ چۆن پێکهاتووە و تایبەتمەندیی پێکهاتەیی و سیاسی ئەوان کامانەن؟ دەوڵەتانی گەشەخوازی دیموکراتیك و نادیموکراتیك چ جیاوازییەکیان هەیە؟ ئاسەوارەکانی گەشەخوازی لە جۆرە جۆراوجۆرەکانی سیاسەتی دیموکراتیك و دەوڵەتی دیموکراتیك چۆنە؟

وەڵامدانەوە بەو پرسیارانە، دوو فەسڵی داهاتووی ئەم کتێبە پێکدێنێ.

(1) Developmental State.





# فەسڵی حەوتەم

## ((دەوڵەتانی گەشەخواز: ئەولەوییەتی سیاسی لە گەشەسەندندا))

**پێشەکی:**

هەروەك لە فەسڵی سەرەتایی ئەم کتێبەدا ئاماژەم پێکرد، سەرەکیترین کەموکوڕی هەر دوو بەشی خوێندنەوەی گەشەسەندن و زانستی سیاسی بەدرێژایی ٣٠ ساڵی رابردوو، جیایی و سەربەخۆیی ئەم دوو بەشە لە یەکتر بووە.

بەتایبەت لە بواری گەشەسەندن لە هەردوو رەهەندی تیۆری و کردەوە تەواوی رێکخراوە گرینگەکانی نێونەتەوەیی لەوانە سندووقی نێونەتەوەیی دراو و بانکی جیهانی لە لێکدانەوەکانی خۆیاندا سیاسەتیان وەلانابوو و بە دەگمەن کەڵکیان لە زانستی سیاسی وەردەگرت.

هەتا ئەم دواییانەش خوێندنەوەی زۆر کەم لەلایەن ئەم رێکخراو و دامەزراوانە لە پێوەندی لەگەڵ رۆڵی سەرەکی سیاسەت لە گەشەسەندن بەڕێوەچووە. هەروەها کە لە فەسڵی یەکەمدا ئاماژەم پێکردووە، لە بەشی زانستی سیاسی بە مانا گشتییەکەی، لەڕووی فەنییەوە جگە لە چەند لێکۆڵەرێکی تایبەت کە ئاماژە بە خوێندنەوە گرینگەکانی ئەوان کراوە، بایەخێکی زۆر کەم بە پرسی گەشەسەندن دراوە. سەرەڕای هەندێك کار کە لە لایەن لێکۆڵەرانێك وەك دونێڵ[١]، ستیڤان[٢]، تریمبێرگێر[٣] و کەسانی دیکە بەرێوەچووە، هەروا بابەتی سەرەکی گەشەسەندن لە رەوتی سەرەکی زانستی سیاسی بە کورتبینانەیی ماوەتەوە. ئەمە لە حاڵێکدایە کە تایبەتمەندیی گەشەکردوویی یان گەشە نەکردوویی باشترین دەرکەوتی لە پێوەندی لەگەڵ نیگەرانییە گشتییەکانی بەشی زانستی سیاسی پێشکەش کردووە. ئەم نیگەرانییانە بریتین لە تایبەتمەندییەکان، رۆڵ و توانایی دەوڵەت، سەرچاوەکان، شێوازەکان، دابەشکردن و کۆنترۆڵی دەوڵەت لە کۆمەڵگایەکدا، پێوەندی نێوان دەوڵەت، ئابووری و کۆمەڵگای مەدەنی،

(1) Donnell.
(2) Dtephan.
(3) Trimberger.



کێشەی جیاوازی بەرژەوەندی، گرژی و ئاڵۆزی نێوان گەشەسەندن و دیموکراسی بەتایبەتی رەوشی مانەوەی دیموکراسی. لەڕاستیدا لێکۆڵینەوەکانی هاوچەرخ لە پێوەندی لەگەڵ دیموکراتیزاسیۆن لە جیهانی روو لە گەشە، رۆڵی بەرچاوی لە تێگەیشتنی نێوەرۆك و رەوشی دیموکراتیك گێڕاوە. ئەگەر کێبەرکێکان و دەستکەوتەکانی تایبەت بە بابەتی سەرەکی سیاسەت لە دەقی گەشەخوازیی نارۆژئاوایی، سەرلەنوێ لە رەوتی سەرەکی سیاسەت دیاری بکرێ، بەشی زانستی سیاسی بەشێوەیەکی بەرچاو دەوڵەمەند دەبێ. ئەم حاڵەتە، بووەتە هۆی کەمکردنەوەی کەموکوڕی هەندێك لە رەهەندەکانی تیۆری، رێکخراوەیی و فەلسەفی ئەم بەشە. لەبەر رۆشنایی ئەم تێبینییانە، ئەم فەسڵە بابەتێك کە لەودا باسی سەرەکی بەشەکانی زانستی سیاسی و خوێندنەوەی گەشەسەندن (کە لە ژێر ناوی دەوڵەتی گەشەخواز باسی لێوە دەکەین) بەراورد دەکرێن. بەڵام پێش لەمە ئاماژەکردن بە هەندێك پێشەکی پێویستە.

### دەوڵەتانی گەشەخواز[١]

لە ساڵەکانی ١٩٦٥ هەتا ١٩٩٧ زۆربەی وڵاتانی روو لە گەشە، نێونجی ساڵانەی هەڵدانی نێگەتیڤیان لە بەرهەمی ناپاڵفتەی نەتەوەیی خۆیان تۆمار کردووە ( World Bank 1999 c: table 1.4) و لەو نێوەدا ژمارەیەکی کەم لە وڵاتان، خاوەنی نرخی هاوسەنگی هەڵدان ( ١,٥ تا ٣,٥٪) بوون. لەم ماوەیەدا چەند وڵاتی روو لە گەشە نرخی نێونجی هەڵدانی ساڵانەیان سەرتر لە ٤ لە سەد لە بەرهەمی ناپاڵفتەی نەتەوەیی خۆیان بەدەست هێناوە، کە دەتوانین ئاماژە بە بوتسوانا، کۆریای باشوور، تایوان، سەنگاپوور، چین، ئەندونزیا، تایلەند و مالیزیا بکەین. لە رووی ستاندارده نێونەتەوەییەکان، ئەم ئامارە نیشاندەری دەستکەوتی بەرچاوە. جیا لە جێگرتنی ئەم وڵاتانە لە رۆژهەڵات و باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا، ئەم کۆمەڵگایانە، خاوەن وێکچوونی تایبەتی نین. هەندێك لەم وڵاتانە لەوانە چین و ئەندونزیا خاوەنی حەشیمەتێکی یەکجار زۆرن و هەندێکی دیکەشیان وەك بوتسوانا و سەنگاپوور حەشیمەتیان کەمە. هەندێك لەوانە وەك ئەندونزیا و بوتسوانیا خاوەنی کانگای کانزایی بە بایەخن و هەندێکی دیکەش وەك کۆریا و تایلەند خاوەنی ئەو کانگایانە نین. هەروەها سیاسەتە ئابوورییەکانی ئەم وڵاتانە بە شێوەیەکی بەرچاو جیاوازن، هەندێك لەوانە وەك مالیزیا و ئەندۆنزیا لەڕووی فەرهەنگی-

(1) States of Development.





کۆمەڵایەتی یان پێکهاتەی قەومی-تایفەیی هەمە چەشنە و هەندێکی دیکە لەوانە وەك تایوان، بوتسوانا و تایلەند خاوەنی هاوچەشنی فەرهەنگین. ژمارەیەکی زۆر کەم لەم وڵاتانە سیاسەتی دیموکراتیك یان نیمچە دیموکراتییان گرتووەپێش لە حاڵێکدا زۆر لە ئەوان بە دوورن لەم جۆرە سیاسەتە.

بە سەرنجدان بەم جیاوازییە ئاشکرایە، چ شتێك دەتوانێ سەرکەوتنی ئەوان لە دەستڕاگەیشتن بە نرخی هەڵدانی بەرزی بەرهەمی ناپاڵفتەی نەتەوەیی پاساویدا؟ پێم وایە کە ئەم وڵاتانە کۆپییەکن لەم جۆرە دەوڵەتانە کە دەتوانن پلەیەکی بەرز لە گەشەسەندن بە دەست بێنن. ئەم دەوڵەتانە، دەوڵەتی گەشەخوازە و پێوەندی بە کارکردی سیاسەت لەم کۆمەڵگایانە و پێوەندیی سیاسی-ئابووری ئەوان لەگەڵ سیستەمی نێونەتەوەیی بەتایبەت لەگەڵ یاریزانە سەرەکییەکانی ئەم سیستەمە هەیە. هەروەك پامێیل[1] پێی وایە، ڕەنگە دەوڵەتانی گەشەخواز بەشێك لە ڕژێمی گەشەخوازی بەربڵاوتر کە بریتییە لە بنەماکانی دەسەڵات و کردار، بێ. لە هەر حاڵدا، دەوڵەت ناوەندی ئەم ڕژێمەیە. پێش ئەوەی ئاماژە بە پێکهاتە سەرەکییەکانی دەوڵەتی گەشەخواز بکەم، ئاوڕێك لە وێستگە و واتاکانی ئەم چەمکە دەدەمەوە.

## دەوڵەتی گەشەخواز، وێستگەی واتایی و پێناسەکانی

لە ڕووی ئامانجە سەرەتاییەکانەوە، دەتوانین تایبەتمەندیی جیاوازی دەوڵەتانی گەشەخواز بەم جۆرە پێناسە بکەین کە ئامانجە سیاسییەکان و پێکهاتە نیهادی نەبووەکان بە تایبەتی بوروکراسییەکانی، بەرەو گەشەسەندن دەڕۆن لە حاڵێکدا ئامانجەکانی گەشەخوازیی سیاسییە. چونکە لە ناوەندی ئەم دەوڵەتانەدا، هۆکاری سیاسی بە ستراتیژی گەشەخوازیی خێرا و بە پەلە لە ڕێگای پێکهاتەکانی دەوڵەتەوە پیك دێن. (Castells, 1992) ئەم هۆکارە سیاسییانە بریتین لە ناسیۆنالیزم، ئایدۆلۆژیا و ئۆگریی گەیشتن بە ڕۆژئاوا.

هەروەها لە نێوان ڕێژەی هێزی سەربازی و دەسەڵات و سەربەخۆیی دەوڵەتی گەشەخواز پێوەندییەکی بەردەوام هەیە. (Burmeister, 1986, p.122)

ئەم پێوەندییە، ئاکامی پێویستی ئەوانەیە دژکردەوە بەرامبەر بە ململانێی ناوچەیی و هەڕەشەی دەرەکی و ئەم خاڵە پێ لەسەر بانگەشەی تیلی[2] سەبارەت بە پێوەندی نێوان

(1) Pample.
(2) Tilly.



دەوڵەت و شەڕوانی دادەگری. بە کورتی ناسیۆنالیزم لە ناوەندی ڕژێمی دەوڵەتی گەشەخوازە. (Woo-Cuming, 1999) دواتر ئاماژە بە لایەنەکانی دیکەی تایبەتمەندیی سەرەکی دەوڵەتی گەشەخواز دەکەم.

پێناسەیەکی کرداری لە دەوڵەتی گەشەخواز، ئەوان لە چوارچێوەی دەوڵەتگەلێکی دادەنێ کە سیاسەتەکانیان لەسەر هێنانەدی دەسەڵاتی پێویست، سەربەخۆیی، توانایی زۆر و ڕەوایی لە ناوەند بۆ پێکهێنان و هاندانی دەستڕاگەیشتن بە ئامانجەکانی گەشەخوازی-لە ڕێگای داڕشتنی پرۆگرام و بردنە سەری ئاستی ڕەوشی هەڵدانی ئابووری یان دەستڕاگەیشتنی ڕاستەوخۆ بە هەڵدان یان تێکەڵاوێك لەم دووانە دامەزراوە.

دەتوانین بیرۆکەی بنەڕەتی و چەمکی دەوڵەتی گەشەخواز لە جۆرە جیاوازەکان لە حکوومەتەکانی ڕابردوو بە شێوەی ڕواڵەتی دەستنیشان بکەین. بۆ وێنە، ڕەنگە بتوانین ئەم بیرۆکەیە لە باسەکانی مرکانتلیستی فریدریك لیست[1] سەبارەت بە پێویستی وڵاتەکانی کەمتر پەرەگرتوو بە کەڵك وەرگرتن لە ئامرازە ناسروشتییەکان بۆ گەیشتن بە وڵاتانی پێشکەوتوو بە مەبەستی دەستڕاگەیشتن بە گەشەسەندنی ئابووری وڵات و ئامادەسازیی بۆ جێگیر بوون لە کۆمەڵگای داهاتووی جیهانی ببینین. (List, 1985/1966: 175) لیست بە لە بەرچاوگرتن کۆریا و ژاپۆن لە سەدەی بیستەم دەڵێ:

((پیشەسازییەکی پێشکەوتوو، بازرگانییەکی گرینگی دەریایی و هەڵدانی تیجارەتی دەرەکی لە ئاستێکی بەرز، تەنیا لە ڕێگای ئامرازەکانی دەستێوەردانی دەوڵەت وەدەستدێ)).

دەتوانین بڵێین کاتێك مارکس ئاماژە بە سەربەخۆیی یەکجارەیی دەوڵەتی فەڕەنسا، لە سەرەمی لوئیز بناپارت دەکا لە دووەمین گرووپ لە تیۆرییە گرینگەکانی خۆی لە پێوەندی لەگەڵ دەوڵەت، دەوڵەتی گەشەخوازی سەرمایەداریی لەبەرچاو گرتبوو. هەرچەند ئەم جۆرە دەوڵەتە لە ڕێگای هاوسەنگیی هێزە چینایەتییەکان لە کۆمەڵگا پێك دێ و ڕەنگە خۆیان لە بەرژەوەندیی چینێکی تایبەت ڕزگار بکەن، بەڵام ئەم دەوڵەتە، دەوڵەتێکی ئازاد نییە. بە گشتی ئەم دەوڵەتە، وەك مەبەستە سەرەکییەکەی، سەرقاڵی بردنە سەری ئاستی بەرژەوەندیی سەرمایەدارین.

جۆن ئێلستێر[2] دەڵێ: ئەم جۆرە لە دەوڵەتی سەرمایەداری سەربەخۆ لە ڕوانگەی مارکسی بنەمای تیۆریی ناوبراوە کە دواتر لە لایەن مارکسیستە ڕۆژئاواییەکان لەوانە

(1) Friedrich List.
(2) Jon Elster.





پولنزاس[١] تەواو کرا. لە دەیەی ٣٠ زایینی و دواتریش، رەهەندی لاوازی بیرۆکە و شێوازی دەوڵەتی گەشەخواز ناوەندی هەندێك لە سیاسەتەکانی گەشەخوازیی دەسەڵاتی ئیمپراتۆرەکان پێکدەهێنا. (Lee, 1967)

لەگەڵ ئەمانەشدا هیچ کەس بە ئەندازەی تیۆریسیەنێك وەك گرشنکرۆن[٢]، پاش جەنگی دووەمی جیهانی ئاماژەی بە پێویستی دەوڵەتێك بەکارکردی گەشەخوازی نەکردووە.

هەروەها تێڕوانینی رێگ[٣] لە سیاسەتی بوروکراتیك لە تایلەند، چەند بەشێك لە بیرۆکەی دەوڵەتی گەشەخواز لەخۆ دەگرێ. ناوبراو بە سەرنجدان بە دەوڵەتی ئەندونزیا، دەوڵەتی گەشەخوازی بەم جۆرە پێناسە کردووە: ((سیستەمێکی سیاسی کە لەودا دەسەڵاتی هێزە سەربازییەکان و ئاستەکانی سەرەوەی ئیداری کە بریتییە لە پسپۆڕانی راهێنراو یان تکنۆکراتەکانە. هەروەها سامۆئێل هانتینگتۆن پێ لەسەر گرینگی جێگیربوونی دەسەڵات لە سیاسەتی بوروکراتیك وەك هۆکاری نوێکردنەوە لە گەشەسەندنی ئابووری-کۆمەڵایەتی دادەگرێ. ئەم جۆرە دەوڵەتە بۆ وەدەست هێنانی سەرکەوتن، پێویستی بەوە هەیە هەتا بەسەر وێرانییە سیاسییەکانی بەرژەوەندیی هێزە کۆمەڵایەتییەکان و شێوازەکان و ئەو دامەزراوانەی کە بوونەتە هۆی دواکەوتوویی و راوەستان لە بەرامبەر مۆدێرنیزاسیۆندا زاڵ بێ.

کاردووسو و فالتو لە دەیەی ٧٠ی زایینی لە بیرۆکەی دەوڵەتی گەشەخواز[٤] بۆ پێناسەی هەوڵەکانی دەوڵەتانی مەکزیك و شیلی لە سەردەمی جەنگ و ساڵە سەرەتاییەکانی دوای جەنگ بۆ دەستەبەرکردنی پیشەسازی بوون کەلکیان وەرگرتووە. (Cardoso and Falleto, 1979)

هەرچەند تیۆریسیەنەکانی وەك میرداڵ ئاماژەیان بە جیاوازی نێوان دەوڵەتی نەرم و دژوار کردووە بەڵام تەنیا لە ٢٠ ساڵی دوایی سەدەی بیستەم دایە کە زانایانی زانستی سیاسی، بە روانینی قووڵ رەوش و کارکردی، کاریگەری گەشەخوازیی دەوڵەتەکان و هەندێك لە تایبەتمەندییەکانی تاوتوێ کردووە.

ئالێن کی تریمبرگێر[٥] لە هەوڵی ئەوەدا بوو هەتا چۆنیەتی سەربەخۆیی و سەرهەڵدانی دەوڵەتە بوروکراتیکەکانی روو لە گەشە لە جیهانی سێهەمدا شی بکاتەوە. ناوبراو بە

(1) Poulantzas.
(2) Gerschen Kron.
(3) Rigg.
(4) Developmentalist State.
(5) Ellen Kay Trimberger.



بەراوردکردنی وڵاتانی ژاپۆن، تورکیا، میسر و پیرۆ بەو ئاکامە گەیشتبوو کە دامەزراوەکانی دەوڵەتێکی بوروکراتیك، کاتێك کە ئیداراتی سەربازی و مەدەنیی گرینگ لەژێر دەسەڵاتی خاوەن زەوییەکان و چینی تیجاری و پیشەسازی نەبێ، و لە وڵاتانێکدا کە بەڕێوەبەرانی حکوومەت پاش وەدەستهێنانی دەسەڵات، پێوەندییەکی نزیك لەگەڵ ئەم چینانە پێك نەهێنن، سەربەخۆیی رێژەییان بە دەست هێناوە.

ئەگەرچی باسی سەرەکیی ئەو لە تیۆری شۆڕشگێریدا پۆلین بەندی دەکرێ بەڵام بۆچوونی ناوبراو، روانگەگەلی گرینگی لە پێوەندی لەگەڵ رەوشی پێکهاتەیی و مێژوویی دەوڵەتانی گەشەخواز پێکهێناوە. لە هەمان سەردەمدا گریگۆر[١]، فاشیزمی ئیتاڵی بە هۆی رۆڵی مۆدێرنی ئەو، وەك رژێمێکی گەشەخواز، پێناسە کردووە.

هەروەك ئاماژەی پێکرا، ئەگەرچی بیرۆکەکانی پێوەندیدار بە دەوڵەتی گەشەخواز دەتوانین لە بەرهەم و ئاسەواری زۆربەی تیۆریسیەنە کۆنەکاندا ببینین، بەڵام جگە لە کاردوسو و خالێتۆ، کەسێك لە چەمکی دەوڵەتی گەشەخواز کەڵکی وەرنەگرتووە و تەنانەت هەوڵدان بۆ راڤە و ئاشکرابوونی لەڕووی تایبەتمەندیی و توخمە پێکهێنەرەکانی و پێش مەرجەکانی پێویست بۆ دەستەبەرکردنی لە ئارادا نەبووە. هەرچەند لە زۆربەی بیرۆکەکانی پێوەندیدار بە ئابووری گەشەخواز، رۆڵی گرینگ بۆ دەوڵەت لەبەرچاو گیراوە، بەڵام هیچ یەك لەوانە ئاماژەیان بە رەوشی سیاسی و دامەزراوەیی پێویست بۆ بەڕێوەبردنی کاریگەری ئەم رۆڵە نەکردووە. (Green, 1974)

لە هەر حاڵدا ناکامی لە تێگەیشتن و لێکدانەوەی نیوەرۆکی دەوڵەتی گەشەخواز، یەکێك لە گەورەترین بەربەستەکان و کەموکوڕی تیۆریی گەشەسەندن و سیاسەت پاش جەنگی دووەمی جیهانی سەیر دەکرێ. دەستەواژەی دەوڵەتی گەشەخواز پاش بڵاوبوونەوەی بەرهەمی گرینگی چارلز جانسۆن[٢] بایەخی پێدرا. ناوبراو لە نێوان گەشەسەندنی دەوڵەتێك لەسەر بنەمای بڕیاردانی عەقڵانی و دەوڵەتی وەك سۆڤییەت، کە تێبینی ئایدۆلۆژی بنەمای بڕیاردانیان بوو، هەروەها دەوڵەتانی سۆسیال دیموکرات و لیبڕال دیموکرات جیاوازی دادەنا. ناوبراو پێی وابوو کە یەکێك لە تایبەتمەندییە گرینگەکانی دەوڵەتی گەشەخواز، پێوەندی زۆر نزیکی ئەو لەگەڵ کەرتی تایبەتی و چوونە سەری دەستێوەردانی ئەو لە بازاڕە. (Johnson, 1981, 9-10).

(1) Gregor.
(2) Charls Johnson.





هەر وەك گریگۆر سەبارەت بە ئیتاڵیا ئاماژەی پێکردبوو، جانسۆن پێی وابوو کە یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندییەکانی دەوڵەتی گەشەخواز، دەسەڵات، بەردەوامی و سەربەخۆیی بوروکراسی ئەوە. لە پێوەندی لەگەڵ ژاپۆن، ناوبراو لەسەر وەزارەتخانە سەرەکییەکانی بودجە، تیجارەتی نێونەتەوەیی و پیشەسازی وەك بۆروکراسییەکانی نوخبە[١] تەئکیدی دەکرد.

ناوبراو سەبارەت بە ژاپۆن پێی وابوو کە گرتنە پێشی سیاسەتی رەوا لە لایەن نوخبە بوروکراتیکەکان یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندییەکانی دەوڵەتی گەشەخوازی ئەو وڵاتەیە، جانسۆن ١٤ ساڵ پاش هاتنەبەر باسی ئەم پرسیارە کە لە ژاپۆن چ کەسێك حکوومەت دەکا، لە وەڵامدا ئاماژە بە بوروکراسی نوخبە دەکا. لە کۆتاییدا ناوبراو لەسەر ئەم خاڵە پێدادەگرێ کە تێگەیشتنی دەوڵەتی گەشەخواز لە ژاپۆن سەرەتا لەڕووی سیاسییەوە ئیمکانی هەیە، چونکە وێستگەی ئەم دەوڵەتە لە ئامانجی ناسیۆنالیستی و سیاسی سەرچاوە دەگرێ.

روانگەی ناوبراو لە ئاشکراکردنی وێستگەیەکی ئەوتۆ بۆ دەوڵەتی گەشەخوازی ژاپۆن دووبارە بوونەوەی هەمان ئەو خاڵانەن کە ((لیست))[٢] سەبارەت بە ئەڵمانیا، موسیلینی سەبارەت بە ئیتاڵیا لە ساڵەکانی جەنگ، ستالین سەبارەت بە گەشەسەندنی حاشاهەڵنەگر و خێرایی سۆڤییەتی پێشوو و سەرۆك کۆماری پارك لە پێوەندی لەگەڵ کۆریای باشوور بەکاریان هێنابوو.

روانگەکانی ناسیۆنالیستی بۆ گەشەسەندنی ئابووری، بابەتێکی نوێ نین. رێبەرانی بێ ئەژمار لە وڵاتانی روو لەگەشەدا، ئەم ئامانجانەیان لەبەرچاو گرتبوو. بەڵام خاڵی سەرەکی ئەمەیە کە لە نێوان ئەم وڵاتانەدا، ژمارەیەکی زۆر کەم خاوەنی توانایی سیاسی بە مەبەستی هێنانەدی گەشەسەندن بوون. لە حاڵێکدا تەنیا دەوڵەتانی گەشەخواز بە سەرنجدان بەو پێوەرانەی کە ئاماژەی پێکرا-دەتوانن بەرێوەیبەرن. کەوابوو بۆ تێگەیشتنی دروستی ئەم جیاوازییە ئێمە پێویستمان بە لێکدانەوەی ئەو لەڕووی سیاسییەوە هەیە. بۆ وێنە، شکستی دەوڵەتی گەشەخواز لە هیند، نە تەنیا بەهۆی پانتایی وڵات بەڵکو بەهۆی بەرژەوەندی تایبەتی کەسانێك بوو کە فشارەکانیان بیوونە هۆی لاوازبوونی روانگە نەهرۆیی[٣]. ئەم بابەتەش دەتوانین لە مەکزیك و بەڕازیل ببینین، دەبێ تارادەیەکی زۆر بیگەڕێنینەوە بۆ ئاکامی سیاسەتەکان بەتایبەتی سیاسەتەکانی سیستەمە بوورکراتیکەکان کە بوونە هۆی ناسەقامگیری

(1) Elite Bureaucracy.
(2) List.
(3) Nehru's Vision.



و دڵنیانەبوون لە تواناییەکانی بوروکراتیك و لە ئاکامدا پێکهێنانی بەربەست لە دەستڕاگەیشتن بە ئامانجی گەشەخوازی. (Schneider, 1999)

بە پێچەوانەی دەوڵەتانی سەرەوە، دەوڵەتانی رۆژهەڵاتی ئاسیا و دەوڵەتانی گەشەخواز لە شوێنەکانی دیکە توانییان لە بوارەکانی پەیداکردنی پیشە، پاراستنی ئابووریی نەتەوەیی لە نفوزی لە رادەبەدەری سەرمایە بیانییەکان و بەتایبەتی بەڕێوەبردنی پرۆژەگەلێك بە سوودی بەرچاو، دەستڕاگەیشتن بە پیشەسازی پێشکەوتوو و هتد... سەرکەوتنی بەرچاو وەدەست بێنن. (Pemple, 1999, p.139)

گۆردن وایت[١] دەوڵەتی گەشەخوازی بە سەرنجدان بە سێ گۆڕاوی سیاسی خوارەوە، دەوڵەتانی لە سێ گرووپی دەوڵەتی کاپیتالیستی[٢]، دەوڵەتی سۆسیالیستی[٣] و دەوڵەتی میانەڕەو[٤] پۆلین بەندی کردووە.

١- نێوەڕۆکی هێزەکان و بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی و سیاسی دەوڵەت، ئامانجەکانی پێکدێنێ.
٢- توانایی تەکنیکی، بەڕێوەبەریی و سیاسی دەوڵەت وەك سێ فاکتۆری دیاریکەر.
٣- شێوەی دەستێوەردانی دەوڵەت لە ئابووری.

تێکەڵاوێك لە سێ گۆڕاوی ئاماژەپێکراو، پێگەی هەر دەوڵەتێك لە هەر یەك لە سێ چینی جێگای سەرنجی گۆردن وایت دیار بکا. لەو کاتە بە دواوە لە لایەن نووسەرە جۆراوجۆرەکانەوە لێکدانەوەی زۆر گرینگ لەسەر دەوڵەتی گەشەخواز ئەنجام دراوە.

سەرەرای لێکۆڵینەوەکانی بەرێوەچوو لەم پێوەندییەدا، لە درێژەی ئەم فەسڵەدا مۆدێلێکی بەربلاوتر لە دەوڵەتی گەشەخواز بە کەڵك وەرگرتن لە لێکۆڵینەوەکانی رابردوو و ئەزموونەکانی زانستی لە دەوڵەتانی گەشەخواز دەخەمەڕوو.

لانیکەم دەتوانین بڵێین کە زۆرتر نووسەران لە خوێندنەوەکانی خۆیاندا لە بواری دەوڵەتانی گەشەخواز، بایەخیان بە دەوڵەتانی رۆژهەڵاتی ئاسیا بەتایبەتی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا داوە. تەنانەت هەندێکیان پێیان وایە کە دەوڵەتانی گەشەخوازی رۆژهەڵاتی ئاسیا، بەرهەمی رەوشێکی تایبەتی مێژوویی ئەو وڵاتانەیە. (Onis, 1991, p.113) بەڵام من پێم وایە کە خوێندنەوەی ئەوتۆ، کورتبینانەیە. چونکە من سەرەڕای ئەوەی کە مالیزیا، تایلەند و ئەندونزیا

(1) Gordon White.
(2) Capitalist State.
(3) Socialist State.
(4) Intermediate State.





بە بەشێك لەم دەوڵەتانە دەزانم لە بوتسوانیاش کە وڵاتێکە لە دەرەوەی ناوچەی ئاماژە پێکراو، وەك دەوڵەتێکی گەشەخواز باسی دەکەم.

ئەگەرچی دواتریش ئاماژە بەم خاڵە دەکەم، بەڵام شایانی باسە کە هەرچەند تەواوی دەوڵەتانی گەشەخواز رەوشێکی یەکسانیان نییە و رەنگە لە رووی پێکهاتەیی و جۆری ستراتیژی جیاوازییان پێکەوە هەبێ، بەڵام دەتوانین ئەوان لەسەر بنەمای هەندێك تایبەتمەندیی هاوبەش، لەگەڵ ئەم چینە لە دەوڵەتەکان پۆلێن بەندی بکەین. (Pample, 1999, p.149)

بەرەو نموونەیەك بۆ دەوڵەتی پەرەسەندن

پێشکەشکردنی مۆدێلێك لەم ئاستەدا، نیشاندەری هەوڵدانێکە بۆ دەرهاوێشتنی تایبەتمەندییە هاوبەشەکان لە نێو کۆمەڵێك لە جۆرە جیاوازەکانی دەوڵەتانی گەشەخواز.

پێم وایە کە دەوڵەتێکی گەشەخواز، خاوەنی چەندین تایبەتمەندیی گرینگە لەوانە:

١- نوخبە خاوەن ئیرادە بۆ دەستەبەرکردنی ئامانجەکانی گەشەخوازی.

٢- سەربەخۆیی رێژەیی دەوڵەت.

٣- بوروکراسی بەهێزی ئابووری و کێبەرکێیی.

٤- کۆمەڵگای مەدەنی لاواز.

٥- توانایی پێویست بۆ بەرێوەبەریی کاریگەری بەرژەوەندی کەرتی تایبەتی.

٦- کەڵك وەرگرتن لە ئامرازەکانی سەرکوت بۆ بەرەو پێشبردنی گەشەسەندن لەگەڵ بایەخدان بە خۆشگوزەرانی گشتی و پاراستنی رەوایی یاسایی.

## نوخبەکانی گەشەخواز[1]

یەکەمین تایبەتمەندیی بەرچاو لە زۆربەی دەوڵەتانی گەشەخواز، رێنوێنی ئەوانە لەلایەن نوخبەکانی خاوەن ئیرادەی و ناگەندەڵی[2] گەشەخواز (لانیکەم لە بەراورد لەگەڵ رژێمە گەندەڵەکانی وەك زئیر و هایتی).

ئەم نوخبە گەشەخوازانە، زۆرتر کەسایەتییەکانی دامەزرێنەری حکوومەتن کە دەتوانین ئاماژە بە لی کان یو[3] لە سەنگاپوور، سەرەتسێ خاما[4] لە بوتسوانیا، ژەنراڵ پارك چونك

(1) Developmental Elites.
(2) Uncorrupt.
(3) Lee Kuan Yew.
(4) Seretse Khama.



هی[1] لە کۆریای باشوور و سەرۆك کۆمار سوهارتۆ لە ئەندۆنزیا بکەین. سەرەڕای ئەمەش دەبێ بڵێین کە دەوڵەتی گەشەخواز لەرووی شێوازی حکوومەت، وەك سیستەمەکانی پاشایەتی، بەستراوە بە تاکێك نییە. (هەرچەند لە ئەندۆنزیای سەردەمی سوهارتۆدا تاڕادەیەك بەم چەشنە بووە). بە پێچەوانەوە، لەم دەوڵەتانە، زۆرتر هاوپەیمانییەك لە گرووپە جۆراوجۆرەکان بە بەرژەوەندی جیاوازەوە حکوومەت دەکەن و تەنانەت کاتێك گۆڕانکاریی ئابووری-کۆمەلایەتی روو دەدا، ئەم دەوڵەتانە نوخبەکان بە بیرۆبۆچوونی جیاوازەوە دەهێننە ناو دەوڵەتەوە و بەشداریان دەکەن. لە زۆربەی ئەم دەوڵەتانە، رێبەرانی سەرەکی حکوومەت زۆر کەمن. بۆ وێنە، بە پێی ئەو لێکۆڵینەوانەی بەرێوەچوون لە دەیەی ٧٠ی زایینی تەنانەت لە ئەندونزیا بە حەشیمەتی نزیك بە ١٧٠ ملیۆن کەس، گرووپێکی ١٠٠٠ کەسی پێکهاتوو لە نوخبەکانی بوروکراتیك، تیکنۆکرات و سەربازی بەسەر خەڵکی دیکەدا حکوومەتیان دەکرد. (Jackson, 1978, p.3-4)

ئەوەی کە تایبەتمەندیی نوخبە گەشەخوازەکان لەم جۆرە دەوڵەتانە نیشاندەدا بریتین لە:

بڕیاری لێبڕاوانە بۆ گەشەسەندن، بەڵێنی ئەوان بە هەڵدانی ئابووری و توانایی ئەوان لە دەستەبەرکردنی ئەم جۆرە دەوڵەتانە، دژایەتی تەواوی لەگەڵ دەوڵەتی تالانچی[2] زائیر (Lundahl, 1992) دەوڵەتی گەندەڵی مارکۆس لە فلیپین و دەوڵەتانی لەم چەشنە هەیە.

لە تایبەتمەندییەکانی دیکەی نوخبە گەشەخوازەکان پێوەندیی پتەوە و زۆر نزیك لە نێوان بوروکراسییەکانی ئاستی سەرەوەی سەربازی و مەدەنی و ئیداراتی گرینگی سیاسییە. ئەم تایبەتمەندییە لە دیموکراسییەکانی لیبراڵی رۆژئاوایی بە دەگمەن دەبینرێ. ئەم نوخبانە زۆر ناسیۆنالیستن و بزوێنەری سەرەکی گەشەسەندنی ئابوورین و زۆرتر خۆیان لە بەرامبەر هەرەشەکانی ئاسایشی نێوخۆیی و ناوچەیی بە بەرپرس دەزانن.

پێناسەکردن، ناساندن و پێوانەی گەندەڵی زۆر دژوارە و دەوڵەتانی گەشەخوازیش بەرفراوانی وەگەرخستنی سەرمایە و قەرزی دەرەکی) دەتوانێ ببێتە هۆی ئاژاوەی گەورە بەتایبەت لەو وڵاتانەی رۆڵی دەوڵەت لە ئابووریدا زۆر و بەرچاوە.

کەوابوو ((سیاسەتی گۆڕانکاری گەشەخوازی)) لە هەندێك لەم دەوڵەتانە تێکەڵاوێکە لە پاتریمونیالیزم[3]، سانترالیزم[4]، بەرێوەبەری ئابووری تیکنۆکراتیك، بەکاربردنی فشار و

(1) Park Chung Hee.
(2) Predatory.
(3) Patrimonialism.
(4) Centralization.





گەندەڵی[1]. هەرچەند تایلەند و ئەندۆنزیا نموونەگەلێکن لە گەندەڵی لە رادەبەدەر لە نێوان دەوڵەتانی گەشەخوازدا، بەڵام ((گەندەڵی)) پرسێکە کە لانیکەم تەواوی دەوڵەتانی گەشەخواز لەگەڵی بەرەوڕوون.

بۆ وێنە رژێمی سۆهارتۆ وەك ((مەکینەیەك بۆ راکێشانی لاینگران)) چاو لێدەکرێ کە رایەڵکەیەکی بەبڵاو لە جاکارتا هەتا پارێزگاکانی دیکەی ئەندۆنزیا لەخۆ دەگرێ. (Crouch, 1984, p.82)

هەروەها ئاماژە بەوە کراوە کە سۆهارتۆ بە مەبەستی سەقامگیری دەوڵەتەکەی، سوپایشی لە کەڵك وەرگرتن لە بەرژەوەندییەکانی ((گەندەڵی)) هاوڕێی خۆی کردبوو.

لە پێوەندی لەگەڵ کۆریا دەبێ بڵێین کە گەندەڵی و بەرتیل خۆری وەك هۆکاری پاڵپێوەنەر بۆ رەوتی گەشەسەندن هەڵسوکەوتی دەکرد، بە جۆرێك کە ببووە بابەتێکی نەتەوەیی و دەوڵەت بۆ بەرەو پێشبردنی سیاسەتەکانی جێگای دڵخوازی خۆی و هاندانی کۆمپانیاکانی هاوئامانج کەڵکی لێوەردەگرت. (Moran, 1999, 575)

لەگەڵ ئەمەشدا، وەك نموونەیەکی گشتی، ئەم دەوڵەتانە بە ئەندازەی دەوڵەتە گەشەنەکردووەکانی وەك فیلیپینی ژێر دەسەڵاتی مارکۆس، هائیتی و زائیر و هتد... کە گەندەڵی بەربڵاو لەگەڵ بەکارهێنانی فشار، ببووە هۆی دابەزینی هەڵدانی ئابووری و چوونە سەری هەژاری و نایەکسانی، گەندەڵ چاو لێناکرێ.

### سەربەخۆیی رێژەیی گەشەخواز

یەکێ لە رەهەندە هاوبەشەکانی دەوڵەتانی گەشەخواز، سەربەخۆیی رێژەیی نوخبەکان و دامەزراوە دەوڵەتییەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەوانە. مەبەست لە سەربەخۆیی بریتییە لەوەی کە دەوڵەت بتوانێ سەربەخۆیی رێژەیی لە بەرامبەر خواستەکان و بەرژەوەندیی گرووپەکان و چینی تایبەت و زاڵکردنی بەژەوەندیی نەتەوەیی بەسەر بەرژەوەندی ئەوان بپارێزێ. (Nordlinger, 1987: 369-71)

شایانی باسە کە سەربەخۆیی دەوڵەت، بە مانای جیایی ئەو لە کۆمەڵگا نییە بەڵکو بە پێچەوانەوە، سەربەخۆیی بوروکراسییە گەشەکردووەکان، لە چوارچێوەی رایەڵکەیەك لە پێوەندی لەگەڵ یاریزانانی دەوڵەتی و نادەوڵەتی کە لە پێناسەکردن، سەرلەنوێ پێناسەکردن و

(1) Coercion and Corruption.



بەڕێوەبردنی ئامانجەکانی گەشەخوازی رۆڵیان هەیە، بە دیاردەکەوێ. لە راستیدا، لە دەوڵەتانی گەشەخوازی سەرمایەدار وەك ژاپۆن، پێوەندی نزیکی نێوان بوروکراسییە گرینگەکانی دەوڵەت لەگەڵ هۆکارە ئابوورییەکان لە کەرتی تایبەتی لە ئارادا بووە کە تێکەڵاوێك لە حاڵەتی دەوڵەتی-تایبەتی بۆ دەستڕاگەیشتن بە ئامانجەکانی گەشەخوازی زۆر بەهێز و کاریگەر پێکهێناوە. لێرەدا دەوڵەت و بازاڕ لە رێڕەوێکدا هەنگاو دەنێن، هەرچەند لە روانگەی ویدەوە[1]، دەوڵەت خاوەنی رۆڵی سەرەکی و حاکم بەسەر بازاڕە.

لە دەوڵەتانی گەشەخوازی نادیموکراتیکدا، زۆرجار سەرچاوەی سەربەخۆیی دەوڵەت، شۆڕش یان دەست بەسەرداگرتنی سەربازی —وەك ئەوەی لە چین، تایوان، کۆریا، تایلەند و ئەندۆنزیا دەبینرێ— بووە. بەڵام لە دەوڵەتانی گەشەخوازی دیموکراتیکدا هۆکاری سەرەکی لە پێکهێنانی سەربەخۆیی دەوڵەت دەبێ لە زاڵبوونی حکوومەتی تاك حیزبی کە بەردەوام لە هەڵبژاردنەکاندا سەرکەوتوو بوون، بگەڕێین. لەم جۆرە دەوڵەتانە دەتوانین ئاماژە بە سەنگاپوور، مالیزیا و بوتسوانا بکەین. لە پێوەندی لەگەڵ ئەم بابەتە لە فەسڵی دواییدا بە وردی باسی لێوەدەکەم.

لانیکەم لە زۆربەی نموونەکانی ئێستادا، رەوتی یارمەتییەکان و وەرگەرخستنی سەرمایەی دەرەکی جێگای سەرنج بووە. کۆریا و تایوان لە دەیەی ٦٠، تایلەند و ئەندۆنزیا لە دەیەی ٧٠ و بوتسوانا لە یەکەمین دەیەی دوای سەربەخۆیی، لەگەڵ رەوتی گەورە لە پشتیوانی ماڵی بەرەوڕوو بوون و لەم رێگایەوە بەستراوەیی دەوڵەت بە داهاتەکانی نێوخۆیی کەم بووەوە هەتا دەوڵەت بە دەستی ئاوەڵا سەرچاوەکان کۆنتڕۆڵ و رێك بخاتەوە. (Leftwich, 1995, 411).

### دەسەڵاتی بوروکراتیك

هەردوو هۆکاری ئیرادەی پتەوی نوخبە گەشەخوازەکان و سەربەخۆیی رێژەیی دەوڵەت لە رێکخستنی بوروکراسی بەهێز، فەننی، کێبەرکێی و بە دەسەڵات بۆ رێنوێنی و بەڕێوەبەری گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی و ئابووری کاریگەربووە. بۆ وێنە MITI لە ژاپۆن وەك نموونەیەکی باش لە بوروکراسی بە هێز چاو لێدەکرێ و دەوڵەتانی دیکەی گەشەخوازیش دەتوانین ئەم جۆرە دامەزراوانە ببینین. دامەزراوەی پلاندانانی ئابووری لە کۆریا، دامەرزاوەی گەشەسەندنی ئابووری لە سەنگاپوور و وەزارەتخانەکانی گەشەسەندن و پلاندانانی بوودجە لە بوتسوانا لەم جۆرە دامەزراوانەن. ئەوەی کە نیشاندەری جیاوازی ئەم دەزگایانە لە دەوڵەتی گەشەخواز لە

(1) Wade.





دامەزراوەکانی پلاندانانی وێکچوو لە زۆربەی وڵاتانی روو لە گەشە توانایی راستەقینە، دەسەڵات، هێزی کێبەڕکێ و رۆڵی ئەوان لە رێکخستنی سیاسەتەکانی پەرەسەندنە.

بەم جۆرە جیاوازی نێوان دەوڵەتانی گەشەخواز و دەوڵەتی تاڵانچی و پاتریمونیال لە وڵاتانی ئەفریقایش لە روانگەی ئەم دۆردراوە زۆر روون و ئاشکرایە.

هەروەها دەبێ ئاماژە بەوە بکەین کە لە نێوان دەوڵەتانی گەشەخواز و دەوڵەتانی ئەمەریکای لاتین و ناوەندی، جیاوازی سەرەکی هەیە. نەبوونی هێز، دەسەڵات و بەتایبەتی بەردەوامی لە بوروکراسییەکانی دەوڵەتانی ئەمەریکای لاتین، یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی سنووردار بوونی توانایی گەشەخوازی ئەوان بووە. ئاوڕێك لە وڵاتانی مەکزیك و بەڕازیل نیشانی دەدا کە ژمارە دەستنیشانکراوەکان لە هەر یەك لەم وڵاتانە، شتێك نزیك بە ٥٠ هەزار دەستنیشانکراوەو لە تەواوی پۆستەکان لە هەر ئاستێك لە دەسەڵات، دەرەتانی لەسەر کارلابردنی نوێ لە هەر ئاستێك لە دەسەڵات، دەرەتانی لەسەر کارلابردنی نوێ لە هەر پێگەیەکدا هەیە. (Schneider, 1999, p.229)

ئەم رەوشە، وەك کۆسپێك لە پێکهێنانی بوروکراسی سەقامگیر لە ئەمەریکای لاتین و سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەربەخۆیی گەشەخواز، بڕیاردەرانی چالاك و بەڵێندەری رۆژهەڵاتی ئاسیا، هەڵسوکەوتی کردووە.

سەرەڕای ئەمەش، هێزە چینایەتییە دەسەڵاتدارەکان و رێکخراوەکانی شاری و گوندی رۆڵی کاریگەریان لە دەزگا دەوڵەتییەکان و پێکهێنانی هەڕەشە دژی ئەوان گێڕاوە. دەسەڵاتی ئەم هێزە چینایەتییانە، سەربەخۆیی و توانایی دەوڵەتانی گەشەخوازی خستووەتە ژێر کاریگەرییەوە. (O'Donnell, 1973).

لە کۆتاییدا دەبێ بڵێین کە پاش دەستەبەرکردنی دیموکراتیزاسیۆن و سەرهەڵدانی شەپۆلەکانی رزگاریخوازی، دەسەڵاتی بوروکراسی دەوڵەتی گەشەخوازیش کەم بووەوە و بووە هۆی ئاڵۆزیی لە بەڕێوەبەری بابەتەکانی ئابووری.

## کۆمەڵگای لاوازی مەدەنی

کۆمەڵگای مەدەنی لە هەموو دەوڵەتانی گەشەخوازدا، لاواز بووە و لە ژێر چاودێری دەوڵەتدایە. لە تەواوی دەوڵەتانی گەشەخوازدا وەك بوتسوانا، بایەخ بە رێکخستنی دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی نەدراوە و لە کۆریا، ئەندۆنزیا و چین، ئەم دامەزراوانە لە ژێر نفووز و چاودێری توندی دەوڵەتدایە.



وا دێتە بەرچاو کە لاوازیی کۆمەڵگای مەدەنی، بووەتە مەرجێك بۆ پێکهێنان و سەقامگیریی دەوڵەتانی گەشەخواز. دیارە لە ئاکامی فشارەکانی دیموکراتیزاسیۆن، دامەزاراوەکان، کۆمەڵگای مەدەنی و چەندین گرووپ لە کۆمەڵگا کە زۆرتر ناوەندی دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی پێکدێنن، پێکهاتوون. بەڵام ئەم جۆرە لە هێزە سیاسییەکان، تەنیا وەك هێزێکی جیددی لە حکوومەتە نادیموکراتیەکان، کە گۆڕانکاری گرینگ لە پێکهاتەی ئابووری-کۆمەڵایەتی ئەوان روویداوە، چاو لێدەکرێ.

## دەوڵەتی گەشەخواز و بەرژەوەندی ئابووری

خوێندنەوەی مێژوویی نیشانی دەدا، پێش ئەوەی کە سەرمایەکانی دەرەکی و نەتەوەیی گرینگ سەیر بکرێن و یان چینە دەسەڵاتدارەکانی پێشوو لە نێو بچن و لە گرینگییەکەی کەم بێتەوە، هێز، دەسەڵات و سەربەخۆیی رێژەیی دەوڵەتانی گەشەخواز پێکهاتوون و سەقامگیربوون. (Castells, 1992).

ئەم بابەتە بە تایبەت لە ئێستا وڵاتی چین، کە گرینگی سەرمایەی دەرەکی و نێوخۆیی روو لە پەرەسەندنە، بە باشی دەردەکەوێ. دیارە رۆڵی هێز و دەسەڵاتی دەوڵەتیش بە تەواوی ئاشکرایە. ئەمە لەبەر ئەوەیە کە چین —وەك زۆربەی وڵاتانی دیکە— لەساڵی ١٩٧٩ کەوتبوو سەر رێڕەوی دەوڵەتی گەشەخواز (White, 1991) گرینگی سەقامگیری و پتەوکردنی هێز و دەسەڵاتی دەوڵەت، پێش گرینگی سەرمایەی دەرەکی و نەتەوەیی، بە رێژەیەکی زۆر بووە هۆی بەهێزبوونی تواناییەکانی دەوڵەتانی گەشەخواز لە بەراورد لەگەڵ بەرژەوەندی ئابووری کەرتی تایبەتی نێوخۆیی یان دەرەکی. ئەم کارە توانایی بە دەوڵەتانی گەشەخواز دەبەخشێ، لە بەراورد لەگەڵ سەماریەداری نێوخۆیی و دەرەکی، رۆڵێکی کاریگەریان لە گەشەسەندندا هەبێ. تەواوی دەوڵەتانی گەشەخواز، کۆمەڵێك دەزگایان دامەزراندووە کە بایەخی پێوەرەکانی چاودێری ماڵی لە دەیەی ٩٠ی زایینی لە پێوەندی لەگەڵ سەرمایەکانی نێوخۆیی و دەرەکی لە کۆریا، یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی سەرهەڵدانی قەیرانی ماڵی ساڵی ١٩٩٧ کۆریا بوو. دیارە خاڵێکی گرینگ لە بەراورد کردن کە پێویستە لێرەدا ئاماژەی پێ بکەین، ئەمەیە کە توانایی سەرەتایی بۆ کۆنترۆڵی سەرمایە، دەوڵەتانی گەشەخوازی تارادەیەکی زۆر لە دەوڵەتانی ئەمەریکای لاتین جیاکردووەتەوە.





## دەوڵەتانی گەشەخواز و مافی مرۆڤ

گومان لەوەدا نییە کە دەوڵەتانی گەشەخواز چ لە جۆری دیموکراتیك یان نادیموکراتیك، لانیکەم لە رووی ستانداردەکانی سۆسیالیستی و لیبراڵیستی رۆژئاوایی، دەوڵەتانی سەرنجڕاکێش نین. کرداری هەندێك لە تاکەکان و رێکخراوەکان، زۆرتر بێ رەحمانە بووە. تەنانەت لە دەوڵەتی نیمچە دیموکراتیك[1] و نەرمی سەنگاپوور، بەرپرسانی فەرمی و دەوڵەتی، زۆر بە دژواری لایەنی نەیار قەبووڵ دەکەن. لی کان یو لە ساڵی ١٩٨٢ رایگەیاند: ((هەر کەس و لە هەر کاتێکدا کردەوەیەك بەرێوەببا کە لەگەڵ بنەما و لۆژیکی کۆمەڵگا لە دژایەتی دابێ، زۆر زوو پێشی پێدەگرم)).

لاوازی رەوشی مافی مرۆڤ بە تایبەت لە دەوڵەتانی گەشەخوازی نادیموکراتیکدا راستییەکە. دەوڵەت گرووپە نەیارەکان قەبووڵ ناکا. تەنانەت لە پێوەندی لەگەڵ گرووپەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، ئەگەر دەوڵەت ئاگاداری جموجۆڵێك بێ کە دژی دەوڵەت و ئامانجی گەشەخوازی تووشی کێشە و گرفت دەکا بەربەرەکانێی لەگەڵ دەکا و پووچەڵی دەکاتەوە.

بەڵام سەرەڕای ئەمەش، زۆربەی دەوڵەتی گەشەخواز لە بەراورد لەگەڵ دەوڵەتانی گەشە نەکردوو، رەوشێکی باشتریان هەیە. ( خشتەی ١-٧).

لە حاڵێکدا رەوشی مافی مرۆڤ لە تایوان، ئەندۆنزیا و چین زۆر لە خوارەوە بووە، وڵاتانی دیکە خاوەن رەوشێکی باشتر بوون. لە دەیەی ٩٠ی زایینیشدا ئەم وەستانە گۆڕانی زۆری بەسەردا نەهاتووە و زۆربەی وڵاتان بە کەمی رەوشی مافی مرۆڤیان باش کردووە. (Humana, 1992).

(1) Quasi-Democratic.



خشتەی (١-٧): رەوشی مافی مرۆڤ لە دەوڵەتانی پەرەسەندنی لە ساڵی ١٩٨٧

| وڵات | رێژەی رێزلێنان لە مافی مرۆڤ |
|---|---|
| بوتسوانا | ٧١ |
| سەنگاپوور | ٥٩ |
| کۆریای باشوور | ٥٩ |
| تایلەند | ٥٧ |
| مالیزیا | ٥٣ |
| تایوان | ٤٧ |
| ئەندۆنزیا | ٣٠ |
| چین | ٢٣ |

سەرچاوە: راپۆرتی Humana لە ساڵی ١٩٨٧. چۆنیەتی ژمێریاری رێژەکانی تایبەت بە وڵاتان، لە خودی راپۆرتەکەدا بە وردی هاتووە.

## دەوڵەتانی گەشەخواز: رەوایی و کارکرد

هەروەك لە فەسڵی پێشووشدا ئاماژەم پێکرد، پێوانەی رێژەی رەوایی بەتایبەت لە حکوومەتە نادیموکراتیکەکاندا زۆر دژوارە.

لەگەڵ ئەمەشدا، سەرەڕای باری لاوازی مافی مرۆڤ، لێکۆڵینەوەکان دەرخەری پشتیوانی بەربڵاو لە دەوڵەتانی گەشەخواز و رەوایی جێگای سەرنجی ئەوانە، تەنانەت لە ئەندۆنزیاش. ئەم خاڵە بەو مانایە نییە کە ئەم جۆرە دەوڵەتانە خاوەنی نەیاری نێوخۆیی نین، بەڵکو ئەم دەوڵەتانە زۆرجار لەگەڵ گرووپەکانی نەیار (تەنانەت لە جۆری شەرخوازیش) لە وڵاتانێك وەك ئەندۆنزیا، کۆریا و تایلەند بەرەوڕوو بوون. (Bello and Rosen Feld, 1992).

سەرەڕای ئەم راستییە و بە تایبەت لە قۆناغی هەڵدانی خێرا، دەوڵەتانی گەشەخواز لەگەڵ مەترسی جیددی بۆ رەوایی یاسایی و سیاسی خۆیان بەرەوڕوو نەبوون.

رەنگە باشترین پاساو بۆ تێکەڵاوێکی دژ بەیەك ((کەڵك وەرگرتن لە سەرکوت و لە هەمان کاتدا وەدەست هێنانی رەوایی)) لە دەوڵەتانی گەشەخواز، ئەمە بێ کە ئەم دەوڵەتانە ئەو بەرژەوەندییانەی لە ئاکامی هەڵدان بەدەستیان هێناوە بۆ دروستکردنی قوتابخانە، رێگاوبان، بردنە سەری ئاستی تەندروستی، دابینکردنی شوێنی نیشتەجێ بوونی گشتی و ئاسانکاری دیکە بۆ زۆربەی خەڵك کەڵکی لێوەرگیراوە. بە لە بەرچاوگرتنی تایبەتمەندیی گەشەسەندنی





مرۆیی[1] پرۆگرامی گەشەسەندنی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان[2] دەتوانین بەو ئاکامە بگەین کە زۆربەی دەوڵەتانی گەشەخواز لەم بوارەدا کاری جێگای سەرنجیان بەڕێوەبردووە. ئەم تایبەتمەندییانە، پێشکەوتنی ولاّتانی لە گەشەسەندنی مرۆیی بە ئاوێتەکردنی پێوانەکانی داهاتی سەرانە، هیوا بە ژیان و ڕێژەی خوێندەواری لە نێوان ١ هەتا ١٧٤ ئیمتیاز دابەشکردووە. (ژمارەی ١ نیشانەی بەرزترین ئیمتیازە).

بۆ وێنە، لە دەوڵەتانی گەشەخواز کە لەم کتێبەدا ئاماژەی پێکراوە، هیوا بە ژیان (لە ساڵی ١٩٩٧) وەك تایبەتمەندییەکی سەرەکی کۆمەلاّیەتی، لە هیچ یەك لە ولاّتان کەمتر لە ٦٥ ساڵ (حاڵەتی ئەندۆنزیا) نەبووە. زۆرترین ڕێژەی هیوا بە ژیان بە ٧٤ ساڵ، تایبەت بە سەنگاپوور بووە. دەوڵەتانی دیکەی گەشەخوازیش بەم جۆرە بوون: کۆریا ٧٢ ساڵ، مالیزیا ٧٠ ساڵ، بوتسوانا ٥١ ساڵ و تایلەند ٦٩ ساڵ.

دەوڵەتانی گەشەخوازی مالیزیا، کۆریا، ئەندۆنزیا و بەتایبەت تایوان لە هەندێك ئاستدا نایەکسانی کۆمەلاّیەتی لە رووی دابەشکردنی داهاتەکان، لە بەراورد لەگەڵ هەندێك کۆمەڵگاکانی ئەمەریکای لاتین وەك بەڕازیل، شیلی و هەندێك لە کۆمەڵگاکانی ئەفریقایی لەوانە سێنیگال، زیمبابۆی یا کینیا، خاوەنی ڕەوشێکی هاوسەنگتر و باشترن. (World Bank, 1998).

(1) HDI.
(2) UNDP.







## دەرئەنجام

بە سەرنجدان بەو شیکردنەوەیە، ئێستا دەتوانین پێناسەیەکی هەمەلایەنەتر لە دەوڵەتی گەشەخواز پێشکەش بکەین.

دەوڵەتی گەشەخواز پێکهاتەیەکی راگوێزراو و کاتی دەوڵەتی مۆدێرنە کە لە کۆمەڵگاکانی روو لە گەشە لە سەدەی نۆزدەهەم تا ئێستا سەری هەڵداوە. دەوڵەتی گەشەخواز، دەوڵەتێکە کە نوخبە بوروکراتیك و سیاسییەکانی، بە سەربەخۆییەکی رێژەیی لە هێزە سیاسی-کۆمەڵایەتییەکان گەیشتوون و لەم رەوشە بۆ بەرەوپێشبردنی پرۆگرامی هەڵدانی خێرای ئابووری لەگەڵ بەکارهێنانی کەم تا زۆری توندوتیژی، کەڵکیان وەرگرتووە.

دەوڵەتی گەشەخواز بە پێی پێویستی بە پێکهێنانی هەڵدانی ئابووری و بە پیشەسازی بوون بە مەبەستی گەیشتن بە یاریزانانی دیکەی جیهانی و ناوچەیی لە رووی ئابووری و سەربازی پێکهاتووە و بۆ وەدەست هێنانی رەوایی لە رێڕەوی باشترکردنی ژیانی ماددی و کۆمەڵایەتی خەڵك هەنگاو دەنێ. دەوڵەتی گەشەخواز لە قۆناغی مۆدێڕندا، خاوەن پلەیەکی بەرز لە ناسیۆنالیزمی ئابووری و سیاسییە و توانیویانە بە هەڵدانی نێونجی ساڵانەی ٤ لە سەدی لە بەرهەمی ناپاڵفتەی نەتەوەیی سەرانە[1]، لانیکەم لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم، دەستیان رابگا.

ئەگەرچی سۆڤییەتی پێشوو و چین لە رێزی دەوڵەتانی گەشەخوازی نادیموکراتیك و سۆسیالیست دان، بەڵام زۆربەی دەوڵەتانی گەشەخواز لە ئاوێتەیەك لە ئابوورییەکانی سەرمایەداری گەشەیان کردووە. چونکە یەکێك لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی ئەم جۆرە لە دەوڵەتەکان، بڕیاردانی لێبڕاوانە و توانایی ئەوانە لە هاووێنەکردن، رێنوێنی، رێکخستن و هاوکاری لەگەڵ کەرتە تایبەتییەکانی نێوخۆیی و بەڕێوەبردن یان چاودێری بەسەر رەفتاری دوو لایەنە لەگەڵ بەرژەوەندی دەرەکییە. دەوڵەتی گەشەخوازی سۆڤییەت چی دیکە لە ئارادا نییە و هەردوو وڵاتی چین و کوبا لە حاڵی حازردا (٢٠٠٠) گۆڕانکاری جێگای سەرنجیان لە

(1) gnp Per Capita.



پێوەندی لەگەڵ هەنگاونان بەرەو لیبراڵیزمی ئابووری و گێڕانی رۆڵی زیاتر لە کەرتی تایبەتی دەست پێکردووە.

دەوڵەتی گەشەخواز لە هێزەکان و رەوتە سیاسییەکانی تایبەت کە لە تەواوی کۆمەڵگاکانی روو لە گەشەدا نابینرێن پێکهاتووە. ئەم سیاسەتانە دوو جۆر لە دەوڵەتی گەشەخواز واتە دەوڵەتی گەشەخوازی دیموکراتیك و نادیموکراتیك پێکهێناوە.

لە کۆتاییدا ئەوەی کە، دەوڵەتانی گەشەخواز، دەوڵەتانی سەقامگیرنین بەڵکو ئەوان وەك شێوازی راگوێزراوی دەوڵەتی مۆدێرن سەیر دەکرێن کە سەرکەوتنیان لە بردنە سەری ئاستی هەڵدانی ئابووری، لە پێکهێنانی بەرژەوەندی و رێکخراوەکان لە ئابوورییە ئاڵۆزەکان و کۆمەڵگای مەدەنی، کاریگەر بوون. ئەم رێکخراو و بەرژەوەندییانە هاورێ لەگەڵ فشارە دەرەکییەکان، رەنگە هێز، دەسەڵات و سەربەخۆیی دەوڵەت لەگەڵ کێشە رووبەڕوو بکا و تەنانەت ببێتە هۆی پێکهێنانی گۆڕانکاری ئابووری و سیاسی، لە ئاکامدا زۆربەی دەوڵەتانی گەشەخواز —دیموکراتیك یان نادیموکراتیك— خاوەنی سووڕێکی[1] ژیانن کە لە دروست بوونی وێستگەی ئەوان دەستی پێکردووە، سەقامگیر دەبێ و بە گۆڕانکاری درێژەی پێدەدرێ کە لە کۆتاییدا رەنگە ئەم دەوڵەتە ببێتە جۆرێکی دیکە لە دەوڵەت.

ئەوەی گوترا چەند ئاکامی گرینگ کە تەئکید لەسەر باسی سەرەکی ئەم کتێبە دەکا، نیشان دەدا. یەکەم ئەوەی کە دەوڵەتانی گەشەخواز وەك جۆرێك دەوڵەت لە جیهانی مۆدێرن، تەنیا تایبەت بە رۆژهەڵاتی ئاسیا نییە. (Onis, 1991, p.124) دەوڵەتانی گەشەخواز تەنانەت لە شێوازی وڵاتانی رۆژهەڵاتی ئاسیا خاوەنی جیاوازی جێگای سەرنجن لەگەڵ یەکتردا. (Pemple, 1999, p.161). نوسخەگەلێك لەم جۆرە دەوڵەتانە و زۆرتر نوسخەکانی لاوازتری لە وڵاتانی موسڵمان و بوودایی رۆژهەڵاتی ئاسیادا دەبینرێ. گرینگتر لەوە ئەمەیە کە، دەوڵەتانی گەشەخواز بەردەوام لەژێر چاودێری نوخبە ناسیۆنالیستەکان و پێداگر بە بەدواداچوونی ئامانجەکانی گەشەخوازی دان.

بە ئاوێتەکردنی پلە جیاوازەکان لە سەرکوت و رەوایی، دەوڵەتانی گەشەخواز لەو وڵاتانەی کە کۆمەڵگای مەدەنی لاوازە، هێز، دەسەڵات، سەربەخۆیی و توانایی جێگای سەرنجیان لە دامەزراوە بۆروکراتیك و سیاسییەکانی دەوڵەت بەتایبەتی دامەزراوە ئابوورییەکان، کۆکردووەتەوە و لە ئاکامدا ژێرخانی بەربڵاویان بۆ دەستڕاگەیشتن بە ئامانجەکانی گەشەخوازی

(1) Life-Span.





پێکهێناوه. ئەم بابەتە، هێزی ئەم دەوڵەتانە لە رووبەڕووبوونی بەهێز لەگەڵ بەرژەوەندی ئابووری دەرەکی و نێوخۆیی بەبێ بەستراوەیی بەوان، بۆ بەدواداچوونی ئامانجی نەتەوەیی گەشەخوازی دەباتە سەرەوە.

دووەم ئەوەی کە، دەوڵەتانی گەشەخواز بە ئاسانی لە چوارچێوەی دوو تیۆری نەریتی دەوڵەت کە لە بیرۆکەی مارکس و ڤیبەر وەرگیراوە، جێناگرێ، چونکە ئەم دەوڵەتانە نە بەرهەمی چینی دەسەڵاتداری کۆمەڵگایە و نە لە هاوسەنگی نێوان ململانێی چینە جۆراوجۆرەکان پێکهاتووە.

هەروەها، لە دەوڵەتانی گەشەخواز بە تایبەت لە قۆناغی سەرەتای دروست بوونیانەوە، وەك دەوڵەتانی هاوکاریخواز[1] چاو لێدەکرێن. ئەم دەوڵەتانە، لە نێوان هۆکارەکانی بوروکراتیك و سیاسی بۆ کەڵك وەرگرتن لە تەواوی دامەزراوە دەوڵەتییەکان بە مەبەستی بەرەو پێشبردنی روانگە و ستراتیژی گەشەخوازی، پێوەندی دامەزراندووە.

ئاکامی سێهەم ئەوەی کە، ئەم تێبینییانە لەسەر خاڵی سەرەکی ئەم کتێبە واتە ئەولەوییەتی سیاسەت لە گەشەسەندن و رۆڵی سەرەکی دەوڵەت لە دەستەبەرکردنی، تەئکید دەکەن. لە هەر شوێنێك کەسێك ئەم جۆرە دەوڵەتانە تاوتوێ بکا، بۆی دەردەکەوێ کە ئامانجەکان، گۆڕانکارییەکان و کەشی سیاسی، شێوازی پێکهاتە و ئامانجەکانی ئەم دەوڵەتانەی دیاریکردووە. ((سیاسەت)) لە چاکسازی و گۆڕانکاریی ئەم دەوڵەتانە بە درێژایی دەیەی ٩٠ی زایینیش رۆڵی سەرەکی گێڕاوە. (Mrrb abe Tcmw 1998)

داهاتووی ئەم دەوڵەتانە روونە، بەڵام لە پێوەندی لەگەڵ هەریەك لە نموونەکانی دەوڵەتانی گەشەخواز، ئاکامی تایبەت بەستراوەتەوە بە پێکهاتەی هێزە سیاسییەکان لەو کۆمەڵگایەدا.

چوارەم ئەوەیە کەوا دێتە بەرچاو دوو ئاکامی دژ بە یەك پێکدێن. لەلایەك وادێتە بەرچاو کە دەرەتانی پێکهێنانی گۆڕانکارییەکی خێرا و سەرکەوتوانە لە هەژاری بەرەو هەڵدان و گەشەسەندن بەبێ بوونی دەوڵەتێك هاو وێنەی دەوڵەتانی گەشەخواز لە جیهانی مۆدێرندا، نییە. بەبێ بوونی دەوڵەتێکی ئەوتۆ کۆمەڵگا رەنگە بە لەسەرخۆیی بتوانی ئەوان پێکبێنی بەڵام لەم بارودۆخەشدا هەزینەگەلی یەکجار زۆر لەوانە بەرگەگرتنی زیانە مرۆییەکان وەك ئەوەی کە بە درێژایی چەند دەیەی دوای سەدەی بیستەم لە وڵاتانی هیند، نایجیریا، بەڕازیل و هتد... هەبوون، بە دوای خۆیدا دێنێ. بە کورتی، بە پێچەوانەی بیرۆکەی ئێستا،

(1) Mobilizing State.



دەستڕاگەیشتن بە گەشەسەندن، پێویستی بە بچووککردنی دەوڵەت نییە بەڵکو پێویستی بە هەڵسوکەوتی باشی دەوڵەت هەیە. (Sandbrook, 1990, p.682). ئەگەری بەهێز هەیە کە ئەم هەڵسوکەوتە هەمان هەڵسوکەوتە کە لە دەوڵەتانی گەشەخوازدا دەبینرێ. داواکاری پێکهێنانی حکوومەتی دڵخواز کە پێ لەسەر رەفتاری باشی بەڕێوەبەری دادەگری، ئەم خاڵە گرینگە کە ئاکامێکی ئەوتۆ تەنیا بەهۆی سیاسەت دێتەدی، لەبەرچاو ناگرن. مۆدێلەکانی گەشەخوازی کە تەوەری سەرەکی ئەو بەڕێوەبەرییە، بە ڕوانینێکی بچووك کردنەوە، سیاسەت لە ناوەندی رەوتەکانی گەشەخوازی جیادەکاتەوە.

بەڵام لە لایەکی دیکەوە، لەبەر هۆکاری ئەولەوییەتی سیاسەت، ناتوانین دەوڵەتانی گەشەخواز موهەندسی بکەین و بە شێوەی سفارشی داوای بکەین. ئەگەر سیاسەت دروست و گونجاو نەبێ، ئەگەری زۆری هەیە ئەم جۆرە دەوڵەتانە پێك نەیەن. زۆربەی هەوڵەکان بۆ پێکهێنانی حکوومەتی دڵخوزا یا دیموکراتیزاسیۆن، رۆڵی سەرەکی سیاسەت لەبەرچاو ناگرن.

لەگەڵ ئەمەشدا، جۆری پێوەندی نێوان دیموکراسی و گەشەسەندن و یان ئەوەی کە ئایا دیموکراسی مەرجی سەرەکی گەشەسەندنە یان نە، گرینگییەکی ئەوتۆی لە باسی ئێمەدا نییە، بەڵکو جۆری دیموکراسی و توانایی گەشەخوازیی پێوەندیدار بەو لە ئەولەوییەتی باسی ئەم کتێبەدایە.

چەندین جۆری جیاواز لە دەوڵەتانی دیموکراتیك، ئاستی جۆراوجۆریان لە گەشەسەندن پێکهێناوە. بەڵام ئەم پرسیارە کە ئەم جۆرە جیاوازانە کامانەن و توانایی گەشەخوازی ئەوان لە چ ئاستێکدایە، بابەتێکە کە لە فەسڵی دواییدا باسی لێوە دەکەین.





# فەسڵی هەشتەم

## دیموکراسی و دەوڵەتی گەشەخواز

## سیاسەتە دیموکراتیکەکان و تواناییەکانی گەشەخوازی

### پێشەکی

لەم فەسڵەدا باسی ئەو بابەتانە دەکەین کە لە فەسڵی پێشوودا بە تەواوی نەکەوتنە بەرباس و لێکۆڵینەوە. بەتایبەت، یەکێك لە گرینگترین باسەکانی ئەم فەسڵە تاوتوێکردنی جیاوازییەکان و کێشەکانە کە وەرگرتنی دیموکراسی وەك مەرجی پێویستی گەشەسەندنی ئابووری، دەبێتە هۆی سەرهەڵدانیان. دوو پرسیاری سەرەکی لەم پێوەندییەدا هەیە. یەکەم پرسیار ئەوەیە کە ئەو هۆکارانە چییە کە هەندێك لە دەوڵەتانی دیموکراتیك لە هەمان کاتدا ((گەشەخواز))[1]یش بن؟

دووەمین پرسیاریش ئەمەیە کە سیاسەتە دیموکراتیکەکان چ کاریگەرییەکیان لەسەر نموونەی ((کرداری گەشەخواز))ی دەوڵەتانی گەشەخوازی دیموکراتیك[2] هەیە؟

دیارە، جێگای وەبیرهێنانەوەیە کە باسەکانی ئەم فەسڵە پێوەندییەکی ئەوتۆی بەم پرسە کە ((ئایا دیموکراسی پێش مەرجی پێویستی گەشەسەندنە؟)) نییە، بەڵکو زیاتر باسەکانی ئەم فەسڵە ئاماژە بەم پرسە دەکا کە ((چۆن سیاسەتە جیاوازەکانی دیموکراتیك، دەبنە هۆی پێکهێنانی ((دەوڵەتانی گەشەخوازی دیموکراتیك ((جیا لە یەکتر؟)).

هەرچەند پێم وایە کاتێکی زۆری دەوێ هەتا سەبارەت بە بەردەوامی دیموکراسییەکانی شەپۆلی سێهەم داوەری بکرێ، بەڵام ئەم راستییە کە ((تەنیا ژمارەیەکی زۆر کەم لە دیموکراسییەکانی جیهانی روو لە گەشە توانیویانە درێژە بە ژیانیان بدەن)) راستییەکی حاشا هەڵنەگرە.

ئەم دیموکراسییانە بریتین لە ڤێنزوئێلا، کاستاریکا، جامائیکا، بوتسوانا، موریتس، مالیزیا، سەنگاپوور و هیندستان. هەرچەند هەندێك لە لێکۆڵەران بەکارهێنانی وشەی

(1) Developmental.
(2) Democratic Developmental State.



دیموکراتیك بۆ دەوڵەتەکانی مالیزیا و سەنگاپوور بە دروست نازانن و پێی دەڵێن ((دیموکراسی سنووردار))[1]. (Potter, 1997, p.38)

تەنیا ژمارەیەکی زۆر کەم لە وڵاتانی دیموکراتیك و نیمچە دیموکراتیك[2] توانیویانە نێونجی نرخی هەڵدانی داهاتی سەرانەی خۆیان زیاد بکەن و خەڵکی خۆیان لە هەژاری، زیان لێکەوتوویی رزگار بکەن. لە نێو ئەم وڵاتانەدا، ئەو دەوڵەتانەی لەم کارەدا سەرکەوتوو بوون بریتین لە: بوتسوانا، سەنگاپوور، مالیزیا، و مۆریتس.

ئەگەرچی هەریەك لەم وڵاتانە، لە رەهەندی جۆراوجۆرەوە وەك پێوەری زەوی، حەشیمەت، مێژوو، سەرچاوەی سروشتی و پێکهاتەی قەومی-فەرهەنگی و چینایەتی لەگەڵ یەکتر جیاوازن، بەڵام خاڵی هاوبەشی تەواوی ئەوانە پێکهێنانی پێکهاتەی دەوڵەتی و نوخبەی سیاسی بەهێز و بە توانا لە بەڕێوەبەری و چاودێری بەسەر رەوتی هەڵدانی ئابووری و پەرەپێدانی خۆشگوزەرانییە.

لێرەدا، من بە جێگای کەڵك وەرگرتن لە دەستەواژەی ((دەوڵەتانی گەشەخوازی دیموکراتیك)) کە زۆربەی لێکۆڵەران کەڵکی لێوەردەگرن، ئەم دەوڵەتانە بە ((دەوڵەتانی دیموکراتیکی گەشەخواز))[3] ناو دەنێم. مەبەستی من لەم کارە، ئەمەیە کە یەکەم لە نێوان دەوڵەتانی دیموکراتیکی گەشەخواز و ((دەوڵەتانی دیموکراتیکی گەشە نەکردوو))[4] جیاوازییەك دابنێم و لە لایەکی دیکەوە نیشانی بدەم کە جیاوازیی سەرەکی وڵاتانی ئاماژەپێکراو (کاستاریکا، ڤێنزوئێلا، جامائیکا و هتد...) نەك لە رێژەی پابەند بوونیان بە سیاسەتە دیموکراتیکەکانە[5]، بەڵکو توانایی گەشەخوازی ئەوانە.

بە واتایەکی دیکە، رەنگە ((دەوڵەتانی دیموکراتیکی گەشە نەکردوو)) لە پابەندبوونیان بە پێوانەکانی دیموکراتیك سەرکەوتوو بن، بەڵام ئەو دەوڵەتانە نەیانتوانیوە لە پێوانەکانی گەشەخوازیشدا هەمان سەرکەوتن بەدەست بێنن.

دیارە، دەبێ بڵێین کە جیاکردنەوەی دەوڵەتانی دیموکراتیکی گەشەخواز و گەشە نەکردوو لەسەر بنەمای هەندێك لە رەهەندەکان، دەبێتە هۆی سەرلێشێواوی خوێنەران. بۆ نموونە،

(1) Partially Democratic.
(2) Quasi-Democratic.
(3) Development Democratic State.
(4) Non-Developmental Democratic State.

(٥) دیارە وڵاتانی ئاماژەپێکراو لەم بوارەدا جیاوازییان پێکەوە هەیە.





هەرچەند کە بوتسوانا و موریتس لە بەراورد لەگەڵ ڤێنزوئێلا و کاستاریکا خاوەن نرخی هەڵدانی خێراترن، بەڵام دوو وڵاتی دوایی لە رووی تایبەتمەندییەکانی گەشەسەندنی مرۆیی، رەوشێکی باشتریان لە چاو بوتسوانا و موریتس بووە. (UNDP, 1996).

لە لایەکی دیکەوە، لە حاڵێکدا کە جامائیکا و هیند لە پێوانەکانی گەشەسەندنی مرۆیی و نرخی هەڵدانی زۆر لاواز هەڵسوکەوتیان کردووە، بەڵام لە ((دابەشکردنی داهات)) لە بەراورد لەگەڵ ڤێنزوئێلا، کاستاریکا و تەنانەت بوتسوانا، رەوشێکی باشتریان بووە. (World Bank, 1996).

دیارە دەبێ ئاماژە بەم خاڵەیش بکەین کە کەڵك وەرگرتن لە وشەی دیموکراسی گەشەخواز یان دیموکراسی گەشەنەکردوو تەنیا بە مەبەستی نیشاندانی جیاوازی وڵاتانی ئاماژەپێکراوە، بەڵام لە راستیدا تەواوی ئەم وڵاتانە لە بوارە جۆراوجۆرەکانی وەك هەڵدانی ئابووری، گەشەسەندنی مرۆیی و دابەشکردنی داهات، تارادەیەك گەشە کردوون. بەم حاڵەش هەڵدانی ئابووری یەکێك لە پێش مەرجە سەرەکییەکانە بۆ گەشەسەندن، کە هەروا وەك گرینگترین تایبەتمەندیی بۆ ناسینی کرداری گەشەخوازییە.

لە فەسڵی پێشوودا، هۆکارەکانی سەرکەوتنی هەندێك لە سیستەمە سیاسییە نادیموکراتیکەکان وەك کۆریای باشوور، تایوان و ئەندۆنزیا، لە دەستراگەیشتن بە هەڵدانی خێرا و بەردەوامی ئابووری بە وردی تاوتوێ کرد. بەڵام هۆکاری سەرکەوتنی هەندێك لە دەوڵەتانی دیموکراتیك لەم بوارەدا، هێشتا بە تەواوی لێکۆڵینەوەی لەسەر نەکراوە. بەواتایەکی دیکە جیاوازی نێوان دەوڵەتانی دیموکراتیکی گەشەخواز و دەوڵەتانی دیموکراتیکی گەشەنەکردوو چییە؟ چ تایبەتمەندییەك بووەتە هۆی پێکهاتنی تواناییەکانی گەشەخوازی لە دەوڵەتی دیموکراتیك و گۆڕینی ئەو بە دەوڵەتی دیموکراتیکی گەشەخواز؟.

شەپۆلی سێهەمی دیموکراسی بووە هۆی چوونە سەری ژمارەی دەوڵەتانی دیموکراتیك و نیمچە دیموکراتیك. بەڵام ژمارەیەکی زۆر کەم لە دیموکراسییەکانی ((جیهانی روو لە گەشە)) دەتوانین لە ریزی دیموکراسییەکانی گەشەخواز دابنێین.

بە سەرنجدان بەوەی کە لەم ساڵانەی دواییدا، تەئکیدی زۆر لەسەر رۆڵی دیموکراسی وەك یەکێك لە مەرجەکانی گەشەسەندن کراوە، تاوتوێکردنی تایبەتمەندییەکانی دیموکراسییە نوێیەکان بایەخی تایبەت بە خۆی هەیە.

لە حاڵێکدا، تێپەڕبوون بەرەو دیموکراسی، وەك مەرجی بنەڕەتی پێکهێنانی دەوڵەتانی دیموکراتیکی گەشەخواز دێتە ئەژمار، بەڵام دەبێ بڵێین کە ئەم تایبەتمەندییە مەرجی پێویست بۆ دەستەبەرکردنی ئەم ئامانجە نییە.



لە لایەکی دیکەوە، چەندین جۆری جیاواز لە دەوڵەتانی دیموکراتیك هەن و هەر یەك لەوانە سیاسەتی دیموکراتیکی تایبەت بە خۆیان هەیە. کەوابوو پێموایە کە توانایی گەشەخوازیی ئەم دەوڵەتانەش بە گوێرەی جۆری ئەوانە، جیاوازە.

مەبەستی سەرەکی ئەم فەسڵە ئەوەیە کە بە کەڵك وەرگرتن لە شیکردنەوەی رێکخستنی رەوشی دیموکراسییەکانی جیهانی سێهەم کە لە سەرەوە ئاماژەی پێکرا (ڤێنزوئێلا، جامائیکا، هیند و هتد...)، ئاورێك لە باسی سەرەکی ئەم کتێبە کە ئەولەوییەتی سیاسەتە لە گەشەسەندن، بداتەوە.

بە تایبەتی، پێم وایە کە هۆکاری بوونی تواناییە جیاوازەکان گەشەخوازی لە جۆرە جیاوازەکانی دەوڵەتانی دیموکراتیك، دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی لە رێژەی ئەولەوییەت دان بە رۆڵی سیاسەت لە پێکهێنانی تایبەتمەندیی و توانایی دەوڵەتە جیاوازەکان، کە بەش بە حاڵی خۆی لە پێکهاتەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی، قەومی و چینایەتی ئەوانیشدا رەنگی داوەتەوە.

دامەزرانی دەوڵەتی دیموکراتیکی گەشەخواز بەستراوەتەوە بە دەستەبەرکردنی دوو دەستە لە پێوانەکانی سەربەخۆ لە یەکتر هەتا دەوڵەتی جێگای سەرنج ببێتە خاوەنی تایبەتمەندیی گەشەخوازی و هەروەها مەرجەکانی دیموکراتیك.

گرینگترین پێوانەی گەشەخوازی کە لەم کتێبەدا کەڵکم لێوەرگرتووە، بوونی نرخی هەڵدانی ساڵانەی لانیکەم ٤ لە سەدی بەرهەمی ناپاڵفتەی نەتەوەی سەرانەیە لە ماوەی قۆناغێکی ٢٥ تا ٣٠ ساڵە.

مەبەست لە دیموکراسیش بە پێی پێناسەی شۆمپیتێر، سیستەمێکی سیاسی نەتەوەییە کە لەودا خەڵك، حیزبەکان و گرووپە سیاسییەکان بە ئازادی و بە پێی کێبەرکێی یاسامەند و هێمن، دانوستان و هاوکاری کردن لەگەڵ یەکتر، بە دوای بەرژەوەندی خۆیاندا و بڕیاراتی سیاسیش لە لایەن کەسانێکەوە دەدرێ کە لەسەر بنەمای دەنگی خەڵك و لە پرۆسەی کێبەرکێیەکی هەڵبژاردندا، بە دەسەڵات گەیشتوون. (Schumpeter, 1943, p.269).

لە کردەوەدا، پێناسەی سەرەوە بە مانای بوونی هەڵبژاردنی یاسامەند و ئازاد، جێگیرکردنی ئاشتی و بەبێ توندوتیژی حکوومەتەکان، نەبوونی کۆسپی سەرەکی لەسەر رێگای بەشداریی سیاسی و پشتیوانی لە ئازادییە سیاسی و مەدەنییەکانە. (Diamond, 1989).

دوو گریمانە جیاواز، تەوەری سەرەکی ئەم باسە پێکدێنن. ئەم دوو گریمانەیە پێکەوە، گرینگترین جیاوازی پێکهاتەیی لە دەوڵەتانی دیموکراتیکی گەشەخواز کە یەکەم دەبنە هۆی





دژواربوونی پێکهاتن و بەردەوامی ئەم دەوڵەتانە و لەلایەکی دیکەوە سەرچاوەی جۆراوجۆری و جیاوازی توانایییەکانی ئەم دەوڵەتانەیە، تاوتوێ دەکەن.

گریمانەی یەکەم (کە لە فەسڵی ٦دا ئاماژەی پێکراوە) پێی وایە کە دیموکراسی، لە سەرەتای دامەزران و قایم بوونی، بە تایبەتی لە جۆری نوێنەرایەتییەکەی، سیستەمێکی پارێزگارە. مەبەستم ئەمەیە کە پرۆسەی بڕیاردان و داڕشتنی سیاسەت لە دیموکراسییە نوێیەکاندا، زۆرجار پارێزگارانەیە و زۆرتر بە هۆی نوخبەکان و لە ڕێگای پێکەوە سازان و کۆبوونەوە دێتە بەرهەم و بەدەگمەن لە بەشداریی بەربڵاوی خەڵك وەردەگیرێ.

هەروەك لە فەسڵی شەشەمدا ئاماژەم پێکردووە، زۆربەی لێکۆڵەران ئەم تایبەتمەندییەی دیموکراسی وەك یەکێك لە خاڵە بەهێزەکان چاو لێدەکەن و هەندێکی دیکەش پێیان وایە کە ئەم تایبەتمەندییە یەکێك لە خاڵە لاوازەکانیەتی.

دووەمین گریمانە پێیوایە، گەشەسەندن هەم لە پێناسە و هەم لە قۆناغی بەڕێوەبردنی، ڕەوتێکی ڕادیکاڵە کە دەبێتە هۆی گۆڕانکاریی خێرا و هەمە لایەنە لە شێوازەکانی کەڵك وەرگرتن و دابەشکردنی سەرچاوەکان کە —ئەگەر سەرکەوتوو بێ— دەبێتە هۆی گۆڕینی پێکهاتە سەرەکییەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی ژیان و بەم جۆرە بوار بۆ سەرهەڵدانی بەرژەوەندی نوێ سیاسی دەرەخسێ، کە ئەوانیش پێکهاتەکان و بەرژەوەندیی پێشوو تووشی کێشە دەکەن. زۆر کەس ئەم تایبەتمەندییە بە خاڵی بەهێزی گەشەسەندن دادەنێن، لە حاڵێکدا هەندێکی دیکە وەك ڕەهەندی لاوازی گەشەسەندن چاو لێدەکەن.

گرینگترین پرسی ئەم باسە ئەمەیە کە بەها و بایەخەیە پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکانی دیموکراسی و گەشەسەندن، بە دەگمەن سازگارییان پێکەوە هەیە. دیارە، ئەمە بەو مانایە نییە کە دیموکراسی ناتوانێ حاڵەتی شۆڕشگێڕی بە خۆوە بگری، بەڵام ئەزموونەکان نیشانیان داوە کە هەر کات دیموکراسییەکان حاڵەتی شۆڕشگێڕی و ڕادیکاڵ بە خۆیانەوە بگرن، کۆڵەکە بنەڕەتییەکەی وەك سیاسەتی کۆبوونەوە و ئاشتەوایی لاواز دەبێ و ((دیموکراسی)) دەکەوێتە بەر هەڕەشە و تەنانەت لەنێوچوون (وەك ڕووداوی شیلی و جامائیکا لە ناوەڕاستی دەیەی ١٩٧٠). زۆرجار، گرینگترین دژبەری کە لە ((دەوڵەتانی گەشەخوازی دیموکراتیك)) کە بە دوای دابینکردنی ئامانجەکانی گەشەخوازی و دیموکراتیك لە یەك کاتدان، پێکدێ، ئەمەیە کە ((یاساکان و سیاسەتە دیموکراتیکەکان، زۆرتر لە چوارچێوەی بژاردەی ئاشتیخوازانە و پارێزگارانەدا سنووردار دەکرێ)). ئەمە لە حاڵێکدایە کە گەشەسەندن پێویستی بە گۆڕانکاری خێرایە لە پێکهاتە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگادا.



بەم جۆرە جیاوازیی پێکهاتەیی نێوان نێوەڕۆکی پارێزگارانەی ((مانەوەی دیموکراسی))[1] و لۆژیکی گۆڕانی هەڵدانی ئابووری، هەمان ئەو جیاوازییەیە کە دیموکراسییە نوێ و کۆنەکان، بۆ گۆڕانیان بە دیموکراسی گەشەخواز، دەبێ بەسەریدا زاڵ بن.

ئەم کردەوەیە، بە تایبەت لە بارودۆخێکدا کە دیموکراسییەکان خوازیاری پێشگیری لە سەرهەڵدانی زنجیرەی پێکەوە گرێدراوی دابەزینی ئابووری و سیاسی بن، بە تەواوی پێویست دێتە بەرچاو. (White, 1998)

چونکە لەسەر ئەو بڕوایەن، لاوازی کرداری گەشەخوازی دەتوانێ ببێتە هۆی لاوازیی دیموکراسییەکی پتەو (وەك ڤێنزوئێلا)، لە لایەکی دیکەوە و، دیموکراسی ناسەقامگیریش دەتوانێ ببێتە هۆی لاوازی ڕەوتی هەڵدانی ئابووری و کۆسپێك لە بەرامبەر کرداری گەشەخوازی.

لە درێژەی ئەم فەسڵەدا، بە خستنەڕووی پۆلێن بەندییەکی سەرەتایی لە جۆرە جیاوازەکانی دەوڵەتانی دیموکراتیکی گەشەخواز و گەشەنەکردوو، ئەم جیاوازییە بە تەواوی تاوتوێ دەکەم.

خاڵی گرینگ لەم باسانەدا ئەمەیە کە، هەر یەك لە دیموکراسییەکان، ڕێگاچارەی سیاسی تایبەت بە خۆیان بۆ چارەسەرکردنی جیاوازی ئاماژەپێکراو پێشکەشکردووە.

لە درێژەی ئەم باسەدا، سیاسەتەکانی دەوڵەتانی دیموکراتیکی (یان دیموکراسییە سنووردارەکان) بوتسوانا، سەنگاپوور، مالیزیا، موریتس، ڤێنزوئێلا، ئەفریقای باشوور دوای ئاپارتاید و هیندوستان کە گەورەترین دیموکراسی جیهانە، تاوتوێ دەکەم.

هیوادارم بە تاوتوێکردنی دیموکراسیۆن و دەوڵەتانی گەشەخواز لەم ڕێگایەوە، بتوانم ڕەوتی سەرەکی زانستی سیاسەت هەرچی زیاتر لە ڕێڕەوی سیاسەتەکان و بیرۆکەکانی گەشەخوازی دیاری بکەم و پێم وایە کە هیچ دەستەواژەیەك باشتر لە ((دەوڵەتی دیموکراتیکی گەشەخواز)) ئەم چەمکانەی لە خۆیدا جێ نەکردووەتەوە.

پێش چوونە ناو ئەم باسە، بە پێویستی دەزانم کورتەیەك لەم باسە پێشکەش بکەم. ڕەوشێك کە دەبێتە هۆی پێشکەوتنی ڕەوتی سەقامگیری دیموکراسی، چەندین بەربەستی پێکهاتەیی بەسەر توانایی گەشەخوازی دەوڵەتانی دیموکراتیکی نوێ و یان دووبارە لە دایك بوو، دەسەپێنێ.

بەڵام هەروەك ((گۆردون وایت))[2] ئاماژەی پێدەکا، کێشەکە ئەمە نییە کە ((ئایا دیموکراسی بۆ گەشەسەندن باشە یان خراپ؟)) بەڵکو کێشەکە، ناسینی جۆرەکانی

(1) Democratic Survival.
(2) Gordon White.





ڕێككەوتننامە و پەیمانە فەرمی یان نافەرمییەكانە كە دەبێتە هۆی جیاوازیی جۆرەكانی سیاسەتە دیموكراتیكەكان و لە لایەكی دیكەوە كاریگەری زۆر جیاواز لەسەر تواناییەكانی گەشەخوازی دەوڵەت و ڕەوتی گەشەسەندن بەجێدێڵێ.

## جۆرەكانی دەوڵەتی دیموكراتیكی گەشەخواز: پۆلین بەندی سەرەتایی

لە فەسڵی پێشوودا، ئاماژە بە هەندێك لە تایبەتمەندییە سەرەكییەكانی دەوڵەتانی گەشەخواز كرا. حاڵەتی زیادەڕەویی ئەم تایبەتمەندییانە زۆرجار لە دەوڵەتانی نادیموكراتیكدا دەبینرێ. دیارە، شایانی باسە كە دەتوانین جۆری نێونجی ئەم تایبەتمەندییانە لە سیاسەتەكان و پێكهاتەی چەندین جۆر لە دەوڵەتانی دیموكراتیكی گەشەخوازیش ببینین. ئەم تایبەتمەندییانە بریتین لە:

١- بوونی نوخبەكانی پابەند بە ئامانجەكانی گەشەخوازی.

٢- سەربەخۆیی ڕێژەیی دەزگای دەوڵەت.

٣- بوروكراسی ئابووری كارلێهاتوو و پشتیوانی لێكراو.

٤- كۆمەڵگای مەدەنی لاواز و شوێنكەوتوو.

٥- توانایی پێویست بۆ بەڕێوەبردنی بەرژەوەندی ئابووری لە نێوخۆ و دەرەوە بە شێوەیەكی كاریگەر.

٦- ئەم دەوڵەتە هاوكات خاوەنی ڕەوایی بووە و لە ئامرازی سەركوتیش كەڵك وەرگرتووە.

سەرەڕای كەڵك وەرگرتن لە ئامرازی سەركەوت، ئەم دەوڵەتانە بە كرداری پۆزەتیڤی خۆیان لە دابینكردنی بەرژەوەندی گشتی و خۆشگوزەرانی خەڵك، ڕەزامەندی خەڵكیان بەدەست هێناوە.

بە سەرنجدان بەم تایبەتمەندییانە، بە تەواوی ڕوونە كە دەوڵەتانی دیموكراتیكی جیهانی سێهەم بە سەرنجدان بە تایبەتمەندی بنەڕەتی و سیاسی ئەوان، لە چوارچێوەی نموونەی ستانداردی ناسێندراو، جێناگرێ.

بەم جۆرە، بە سەرنجدان بە تایبەتمەندی دەوڵەتانی دیموكراتیكی جیهانی سێهەم (سەنگاپوور، مالیزیا، بوتسوانا، موریتس، ڤێنزوێلا، ئەفریقای باشوور، جامائیكا و كاستاریكا)، دەوڵەتانی دیموكراتیك لە ڕووی تایبەتمەندیی گەشەخوازییەوە، بە ٤ جۆری جیاواز دابەش دەكەم.

جۆرەكانی دەوڵەتی دیموكراتیك لە ڕووی توانایی گەشەخوازی، لە ڕوانگەی منەوە، بریتین لە:

١- دەوڵەتانی دیموكراتیكی گەشەخوازی حیزبی دەسەڵاتدار[1] وەك بوتسوانا، سەنگاپوور، و مالیزیا.

(1) Dominant Party.



٢- دەوڵەتانی دیموكراتیكی گەشەخوازی هاوپەیمانی وەك موریتس و مالیزیا.

٣- دەوڵەتانی دیموكراتیكی گەشە نەكردوو كە بە پێی ڕێككەوتنی نێوان چینە جیاوازەكان[1] پێكهاتوون وەك ڤێنزوێلا و ئەفریقای باشوور.

٤- دەوڵەتانی دیموكراتیكی گەشە نەكردوو لەگەڵ سیستەمی جێگۆڕكێی حیزبەكان لە دەسەڵات[2] وەك جامائیكا و كاستاریكا.

٥- دەوڵەتانی دیموكراتیكی گەشەخوازی ((حیزبی دەسەڵاتدار))[3].

ئەم جۆرە لە دەوڵەتانی گەشەخواز، بە سەرنجدان بەوەی كە دەسەڵاتی ناوەندی بەردەوام لە دەست حیزبێكی دەسەڵاتدار دایە، تاڕادەیەكی زۆر وێكچووی دەوڵەتانی گەشەخوازی نادیموكراتیكە.

نموونەی بەرچاوی ئەم جۆرە دەوڵەتانە ژاپۆنە كە لەودا لە ساڵی ١٩٥٥ هەتا ساڵی ١٩٩٣، حیزبی لیبراڵ دیموكرات بەردەوام خاوەن دەسەڵات بووە و بە دەسەڵات و نفووزی خۆی بووە هۆی بەردەوامی سیاسەتەكانی گەشەخوازی لە تەواوی ئەم ساڵانەدا. (Johnson, 1982).

دیارە، دەتوانین ئەم جۆرە تایبەتمەندییانەش لە سەنگاپوور و بوتسوانا (كە هەردوو لە دەوڵەتانی دیموكراتیكی گەشەخوازن) ببینین.

لە سەنگاپوور، حیزبی ((كرداری خەڵك))[4] لە كاتی سەربەخۆیی لە ساڵی ١٩٦٥ تا ئێستا كۆنترۆڵی بوارە سیاسی، كۆمەڵایەتی و ئابوورییەكانی سەنگاپووری لە دەستدا بوو. ((حیزبی دیموكراتیكی بوتسوانا))[5]ش لە ساڵی ١٩٦٦ (ساڵی سەربەخۆیی ئەم وڵاتە) بەردەوام لە دەسەڵاتدا بووە.

هێز و نفووزی ئەم حیزبە دەسەڵاتدارانە، ڕیشەی لە سەردەمی پێش و سەرەتای سەربەخۆیی هەیە.

بۆ وێنە، لە سەنگاپوور، تەواوی گرووپە چەپەكان بە توندی سەركوت كران و زۆربەی نوخبە سیاسییە خۆجێییەكان بوونە ئەندام لە حیزبی ((كرداری خەڵك)) و ئەم حیزبە بە دیاریكردنی كۆڵەكەی دەسەڵاتی خۆی لە یەكیەتی كرێكاری و كرێكارانی كۆمەڵگا، لە هەمان سەرەتادا بووە حیزبی دەسەڵاتدار و گشتگیر لە سەنگاپووردا (Bradly, 1965, Sours, 1997).

(1) Ckass-Compromise.
(2) Alternation Party.
(3) Dominant-Party Developmental Democratis State.
(4) People’s Action Party (pap).
(5) Botsowana Democratic Party.





لەگەڵ ئەمەشدا، بوتسوانا و سەنگاپوور، لە قۆناغی تێپەڕبوون بۆ دیموکراسی، خاوەنی حیزبی کۆن (ریشەدار) و یان ژمارەیەکی زۆر حیزبی تازە دامەزراو نەبوون.

بە کورتی، پێکهاتە کۆمەڵایەتی-ئابوورییەکان[1] لە سەنگاپوور و بۆتسوانا بە جۆرێك بووە کە کێبەڕکێی جیددی و درێژ ماوە لەسەر دابەشکردنی دەسەڵات، پێکهاتەی یاسای بنەڕەتی نوێ یان ستراتیژیی گشتی گەشەسەندن، لەو وڵاتانەدا نەبووە. سەرەڕای ئەمەش، هیچ جۆرە جیاوازی قەومی یان چینایەتی سەرەکی لە پێکهاتەی حەشیمەتی[2] کۆمەڵگاکانی ئاماژە پێکراودا، کە حیزبە نەیارەکان بتوانن بە پێداگرتن لەسەر ئەوان لە بەرامبەر حیزبی سەرەکی کێبەڕکێ بکەن، نییە. لەم وڵاتانەدا، کۆمەڵگای مەدەنی لە سەرەتادا زۆر لاواز بوون یان لاواز کراون. بۆ وێنە، تەواوی ئەو ڕێکخراوە سەربەخۆیانە کە لە ساڵەکانی سەرەتای پاش سەربەخۆیی لە بوتسوانا پێکهاتن، بەخێرایی لە لایەن حیزبی دیموکراتیك راکێشران یان ئەوەی کە لە رووی ماڵییەوە بەستراوە بە دەوڵەت بوون. (Molusti and Holm, 1990).

هەروەها، پێکهاتەی ئابووری سەنگاپوور و بوتسوانا لە قۆناغی ((پتەوکردنی دیموکراسی)) نیشاندەری ئەم راستییەیە کە جگە لە بەرژەوەندی حیزبە دەسەڵاتدارەکان، هیچ جۆرە بەرژەوەندییەکی نیهادینە کراوی ئابووری لەم وڵاتانەدا پێك نەهاتووە.

کەوابوو، بانگەشەی ئەوە دەکرا کە بوارەکانی ئابووری و سیاسی بۆ هاتنی تەواوی گرووپەکان ئاوەڵایە، بەڵام دەرەتانەکان و ئیمتیازەکان لەم بوارەدا بە هیچ شێوەیەك یەکسان و عادیلانە نەبوو و لە راستیدا حیزبە دەسەڵاتدارەکان، لە ژێر ناوی دیموکراتیك، بەبێ نەیار کۆنترۆڵی دەوڵەتیان بە دەستەوە بوو.

سەرەڕای ئەمەش، بە پێچەوانەی هەندێك لە وڵاتان (وەك وڵاتانی ئەمەریکای لاتین) کە بوونی رژێمی سەرەڕۆ لەواندا باوە، لەم وڵاتانەدا (بوتسوانا و سەنگاپوور) دامەزراوە سەربازییەکان نە تەنیا وەك دیاردەیەکی نوێ سەیر دەکرێن، بەڵکو هیچ پێوەندییەکی مێژوویی و پێکهاتەیی قووڵی لەگەڵ گرووپە قەومی و چینایەتییەکانی ئەم کۆمەڵگایەنەشدا نەبووە و لەبەر ئەم هۆیە نەبوونە هەڕەشەیەکی ئەوتۆ. (Trimberger, 1978).

بەم جۆرە، هۆکارەکانی وك ئابووری تارادەیەك گەشە نەکردوو، پێکهاتەی لاوازی چینایەتی، بەرژەوەندی کەمی نیهادینە کراو، هاوشێوەی ڕێژەیی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی لە

(1) Socio-Economic Structure.
(2) Demographic Stucture.



کۆمەڵگا و نەبوونی دامەزراوەی سەربازی و قەومی بە پێشینە، مەرجی پێویست بۆ پێکهێنانی حیزبی دەسەڵاتدار لەم وڵاتانە دەرەخسێنێ، ئەم رەوشە، دەبێتە هۆی جێگیربوونی دەسەڵاتی سیاسی لە ناوەندی وڵات و چوونە سەری ئاستی سەربەخۆیی رێژەیی ئەو وڵاتانە. (Evans, 1989, p.575, 87).

ئەم رەوشە، توانایی بە رێبەرانی ئەو وڵاتانە دەدا هەتا بە پەرەپێدانی توانایی گەشەخوازیی خۆیان رابگەن. ئەوان ئەم کارەیان بە پێکهێنانی بوروکراسییەکانی گەشەخوازی ئابووری و پشتیوانی لەوان لە بەرامبەر هات و هاواری سیاسی گرووپەکانی دیکە و چاودێری ورد لەسەر رەوتی گەشەسەندنی ئابووری و دامەزراوە سیاسییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بەڕێوەبردووە. لە سەنگاپوور، ئەم ئەرکە لە ئەستۆی ((ئەنجوومەنی گەشەسەندنی ئابووری))[1] و لە بوتسواناش لە ئەستۆی ((وەزارەتی پلاندانان و کاروباری بوودجە))[2] بووە. (Huff, 1995, Charlton, 1997).

بەم جۆرە، حیزبە دەسەڵاتدارەکان لەم وڵاتانەدا بە کەڵك وەرگرتن لە دامەزراوەکانی ئاماژەپێکراو و بەبێ ترسی جیددی لەوەی کە رەنگە لە هەڵبژاردنی دواییدا دەسەڵات لە دەست بدەن یان سەقامگیری سیاسەتەکانیان لەلایەن حیزبە نەیارەکان بکەوێتە ژێر پرسیارەوە، سیاسەتەکانی گەشەخوازی خۆیان بە شێوەی گونجاو، بەردەوام و لۆژیکیانە بەرەو پێش بردووە.

ئەم دەوڵەتانە، یارمەتی پێکهێنانی بەرژەوەندی بەهێز لە کەرتی تایبەتی دەدەن، بەڵام بەردەوام ئەوان لە بەدواداچوونی ئامانجی گەشەخوازی رێنوێنی دەکەن.

هەرچەند کە سیاسەتە دیموکراتیکەکان، بە دواداچوونی پرۆگرامەکان و سیاسەتەکانی گەشەخوازیی ئەم حیزبانەی، تارادەیەك سنووردار کردووە، بەڵام ئەوان سیاسەتی گەشەخوازانەی خۆیان بە پێداگرتن لەسەر یاساکان و رێوشوێنە دیموکراتیکەکان، بەردەوام بەڕێوە بردووە و رەواییان پێداوە. بە واتایەکی دیکە دەبێ بڵێین کە لەم وڵاتانەدا، بەردەوامی دیموکراسی بەستراوەتەوە بە دەسەڵاتخوازیی حیزبە دەسەڵاتدارەکان و دیموکراسی نابێ دەسەڵاتی ئەوان بخاتە ژێر پرسیارەوە. بەم جۆرە دەردەکەوێ کە جیاوازی نێوان نێوەڕۆکی گشتی و سنووردارکردنی سیاسەتە دیموکراتیکەکان و لۆژیکی شۆڕشگێڕی و ئاڵوگۆڕکراوی گەشەسەندن، لەم وڵاتانە بە قازانجی سیاسەتەکانی گەشەسەندن چارەسەرکراوە.

(1) Economic Developmental Board.
(2) Ministry of Finance and Developmental Programs.





هەرچەند ئەم وڵاتانە خاوەنی تایبەتمەندییەکانی هەڵدانی ئابووری زۆر باشن، بەڵام بەدواداچوونی سیاسەتەکانی گەشەخوازی لەم وڵاتانەدا، کاریگەری زۆر نەگونجاوی لەسەر بایەخەکانی دیموکراسی لیبراڵ و پشتیوانی لە مافی مەدەنی هاووڵاتییان داناوە.

بۆ وێنە، نموونەی دابەشکردنی داهات لە سەنگاپوور تارادەیەك ناهاوسەنگ و ناعادیلانە بووە و لە بوتسوانایش سەرەڕای هەڵدانی ئابووری بەرچاو، نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکان و وێرانکردنی ژینگە زیادی کردووە. (Good, 1993, Yeager, 1993).

٢- دەوڵەتانی دیموکراتیکی گەشەخوازی هاوپەیمانی.[1]

ڕەوشی دەوڵەتانی دیموکراتیکی گەشەخواز، لەکۆمەڵگایەکدا کە حیزبی سیاسی دەسەڵاتدار لەواندا بوونی نەبێ، چۆنە؟ ڕێگاچارەیەك کە بۆ نەهێشتنی جیاوازییەکان لە دیموکراسی گەشەخواز لەم کۆمەڵگایانە پێشکەش کراوە، زۆر جۆراوجۆرە، چونکە لەم کۆمەڵگایانەدا حیزبێکی دەسەڵاتدار کە سیاسەتەکانی خۆی بەسەر تەواوی کۆمەڵگادا بسەپێنێ، بوونی نییە.

لەبەر ئەم هۆیە، لەم کۆمەڵگایانەدا ((سەربەخۆیی گەشەخوازی))ی دەوڵەت تارادەیەك لاواز بووە. لە بارودۆخێکی ئەوتۆدا، ((مانەوەی دیموکراسی)) لە گرەوی پێکهاتنی هاوپەیمانی سیاسی[2] لە نێوان گرووپە جیاوازەکانی کۆمەڵگایە. هەروەها تایبەتمەندی گەشەخوازی دەوڵەت لەم کۆمەڵگایانەدا، بەستراوەتەوە بە بوونی ڕێککەوتنی بەربڵاو لە نێوان تەواوی حیزبە سەرەکییەکانی وڵات لە پێوەندی لەگەڵ ئامانجەکان، پێکهاتە و خێرایی ستراتیژی گەشەسەندن. کەوابوو، لە سەردەمە جیاوازەکاندا، بە سەرنجدان بە پێکهاتەی هاوپەیمانی دەسەڵاتدار لە وڵات، ستراتیژی گەشەسەندنیش جیاواز دەبێ.

لە دیموکراسییەکانی گەشەخوازی هاوپەیمانی دوو مەرجی سەرەکی سیاسی کە بریتییە لە ڕێککەوتنی گرووپەکان لە پێوەندی لەگەڵ بنەماکانی بەڕێوەبەری و ڕێککەوتن لە پێوەندی لەگەڵ چۆنیەتی دابەشکردنی دەسەڵات و بەربەستەکانی سیاسەتە، لە بەراورد لەگەڵ جۆری یەکەم، بۆ پتەوکردنی دیموکراسی و بەردەوامی تایبەتمەندییەکانی گەشەخوازیی دەوڵەت، بایەخێکی تایبەتی هەیە.

سەرەڕای ئەمەش، لە بارودۆخێکی ئەوتۆدا، ڕوانگەی سیاسی نوخبەکان ڕۆڵی زۆر گرینگ دەگێڕێ. دیارە ریشەکان، پێکهاتە و ڕۆڵی هاوپەیمانی، بابەتێکی نوێ لە زانستی سیاسی نییە،

(1) Coalitional or Consociational Developmental Democratic State.
(2) Poliltical Coalition.



چونکە تیۆری جۆراوجۆر سەبارەت بە شێوازەکانی دیموکراسی گشتی لە ئارادا هەن. (Lijphart, 1974, Ersson, 1996).

بەڵام مەبەستی سەرەکی باسەکانی ئەم بەشە سەبارەت بە هاوپەیمانەکان، ناسینی پێوەندی نێوان ئەو ڕوانگانەیە کە لە زانستی سیاسی و بابەتەکانی گەشەخوازیدا هەیە.

لەبارترین ڕەوش بۆ پێکهێنانی دیموکراسی گەشەخوازی هاوپەیمانی دەتوانین لە کۆمەڵگایەکدا کە خاوەنی تایبەتمەندییەکانی وەك جیاوازی قەومی، فەرهەنگی و ناوچەیی و جیاوازی چینایەتییە، ببینین. لەم کۆمەڵگایانەدا، بواری لەبار بۆ پێکهاتنی چینەکان لە کۆمەڵگای فرەییدا زۆر ناتەواو و ناسەقامگیرە.

مۆدێلی جێگۆڕکێی حیزبەکان لە دەسەڵاتیش، لەبەر دوو هۆ، بۆ ئەم کۆمەڵگایانە گونجاو نییە.

یەکەم، ئەم مۆدێلە پێویستی بە بوونی گرووپەکانی زۆرینەی دیاریکراو و جیاوازە و لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا (کۆمەڵگای فرەیی) حیزبەکان توانایی ڕێکخستنی ئەم گرووپانەی نییە.

دووەم، لە کاتێکدا حیزبەکان توانای ڕێکخستنی گرووپەکانی زۆرینەشیان بێ (وەك ڕێکخراوی نەتەوەیی مالاییەکانی یەکگرتوو لە مالیزیا)[1]، ئەو گومانانەی کە لە نێو گرووپە کەمینەکان بەرامبەر بە بەربەستەکان سەپێنراو بەسەر ئەواندا لەلایەن زۆرینەوە پەرەی پێدەدرێ، دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی توندوتیژی و حزبی دەسەڵاتدار لە بەدواداچوونی کاریگەری ئامانجەکانی گەشەخوازی (کە پێویستی بە هاوکاری نێوان گرووپە جیاوازەکانە) نائومێد دەبێ.

ئەم پرسە، بەتایبەتی لە وڵاتانێکدا کە گرووپێك کۆنتڕۆڵی بەرژەوەندی سیاسی دەسەڵات و گرووپێکی دیکە کۆنتڕۆڵی بەرژەوەندی ئابووری دەکەن و گرووپی یەکەم پێویستی بە هاوکاری گرووپی دووەم بۆ بەدواداچوونی سیاسەتەکانی گەشەخوازییە، بە ڕوونی دەبینرێ. (وەك مالیزیا و ئەفریقای باشوور).

دیموکراسییەکانی گەشەخوازی هاوپەیمانی بە ئاسانی یان لە کورتخایەندا پێك نایەت. سەرەڕای ئەمەش لە هەر شوێنێکدا ئەم دیموکراسییانە پێك بێ، ڕەنگە بەهۆی قۆناغێك لە قەیرانی سیاسی ئابووریدا بووە، کە بووەتە هۆی ئەوەی کە، لانیکەم یەکێك لە حیزبە سەرەکییەکان لەو ڕاستییە تێبگەن کە بەرژەوەندی سیاسی و ئابووری لە پێوەندی لەگەڵ

(1) United Malays National Organization.

سیاسەتەکانی گەشەخوازی و بەدواداچونی ئاکامی کۆبوونەوە و ئاشتەوایی سیاسییە. وڵاتی موریتس، باشترین نموونەیە بۆ ئەم مۆدێلە.

موریتس خاوەن کۆمەڵگایەکی فرەییە کە هەندێك وەك ((رایەڵکەیەکی یەکدەست لە تێکەڵاوبوون و هەرەسهێنان))[1] لە نێو حیزبە سیاسییەکان باسی دەکەن. (Bowman, 1997, p.68).

ڕەوشێکی ئەوتۆ لە کۆمەڵگای موریتس زۆر جێگای سەرسووڕمان نییە، چونکە کۆمەڵگای موریتس خاوەنی تێکەڵاوێکی یەکجار جیاواز وەك نەژادی هیندی، فەرەنسی، ئەفریقایی، چینی و بەریتانیاییە کە لەم نێوەدا نەژادی هیندی-موریتسی[2] نزیکە ٧٠ لە سەدی حەشیمەت پێکدێنن.

دیارە دەبێ ئاماژە بەوە بکەین کە ئەم گرووپە قەومی-فەرهەنگییە بە پێی ((ئایین))یش بەسەر چەند گرووپێکدا دابەش بوون: نزیکەی ٥١ لە سەدی حەشیمەتی هیند ٣٠ لە سەد مەسیحی و ١٧ لە سەدەیش موسوڵمانن. (Derby Shier, 1996, p.382). دابەشبوونی زمانی و چینایەتیش ئەم ڕەوشەی ئاڵۆزتر کردووە.

یەکێك لە گرینگترین تایبەتمەندییەکانی گۆڕانکاری سیاسی لە موریتش لەکاتی سەربەخۆییەکەی لە ساڵی ١٩٦٨، بوونی نموونەگەلی جۆراوجۆری تێکەڵاوبوون و هەرەسهێنانی نێوان حیزبە جیاوازەکان و تەنانەت لە نێو حیزبەکاندا بووە. لە ماوەی ١٥ ساڵی یەکەمی دوای سەربەخۆیی، ئەم پرسە بەردەوام لەگەڵ قەیرانی قووڵی سیاسی و ئابووری بەرەورووو بووە کە ئاکامی پێکهاتەی بەجێ ماوەی قۆناغی کۆلۆنیالیزم وەك ئابووری کشتوکاڵی و پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانی پێوەندیدار بەوەوە، بووە. (Bowman, 1991, Pandit, 1995).

موریتس لە ماوەی دەیەی ١٩٦٠، نموونەی وڵاتێکی هەژاری خاوەن ئابووری کشتوکاڵی بەستراوە بە شەکر بە زەوی کشتوکاڵی سنووردار، حەشیمەتێکی زۆر و بێکار لەگەڵ کۆمەڵگایەکی فرەیی بووە. (Beck Ford, 1972, Lempert, 1987, Wilsand Prinz, 1996).

قەیرانە ئابوورییەکانی ناوەڕاستی دەیەی ٧٠ (وەك کەمبوونەوەی بەهای شەکر، باڵانسی نێگەتیڤی پێدانی وڵات، چوونە سەری قەرزی دەرەکی و بێکاری و بەربڵاو)، بوونە هۆی ئەوەی کە حیزبە سیاسییە گرینگەکان (چ راست و چ چەپ) بەم ئاکامە بگەن کە دەستراگەیشتن بە

(1) Seamless Web of Consolidation and Fragmentation.
(2) Indo-Mauritians.



ئامانجەکانی خۆشگوزەرانی وەك چوونە سەری مووچە، دابینکردنی پیشە و کەمکردنەوەی بێکاری بەبێ هەڵدانی خێرای ئابووری، بە هیچ جۆرێك نایەتەدی.

بەم جۆرە، بە لەبەرچاو گرتنی راسپاردەکانی سندووقی نێونەتەوەیی دراو و بانکی جیهانی و بەرێوەبردنی پرۆگرامی هاوسەنگ کردنی پێکهاتەیی، لە سەرەتای دەیەی ١٩٨٠ ئابووری موریتس چووە قۆناغی گەشەکردنەوە.

سیاسەتی نوێی ئابووری کە بریتی بوون لە مۆدێرنیزەکردنی کەرتی شەکر، جۆراوجۆری کشتوکاڵی، توریزم و بەتایبەت پەرەپێدانی هەنارده، لە سەرەتای دەیەی ١٩٨٠ دارێژراو بەرێوەچوو. (Minogue, 1987).

بەڵام گرینگترین تایبەتمەندیی گۆڕانکاری سیاسی موریتس لە دەیەی ٧٠، سەرهەڵدانی کۆدەنگی سیاسی حیزبە جیاوازەکان لە پێوەندی لەگەڵ ستراتیژی گەشەسەندندا بوو، کە قەیرانەکانی سیاسی و ئابووری دەیەی ٧٠ و سەرەتای دەیەی ٨٠ی زایینی، بە پێکهێنانی پابەندبوونی حیزبە جیاوازەکان بەرامبەر بە پرسەکانی وەك ئاسانکاری بۆ یەکتر و خۆگونجاندن[1] لە بابەتەکانی دینی، زمانی و قەومی و پابەندبوونی بە ڕەوتە دیموکراتیکەکان، بووە هۆی پەرەپێدانی ئەم هاودەنگییە و پتەوبوونی هەرچی زیاتری ئەو.

هەرچەند لە پێکهێنان و هەرەسهێنانی هاوپەیمانییە جۆراوجۆرەکان، هەروا وەك یەکێك لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی گۆڕانکاری سیاسی موریتس ماوەتەوە، بەڵام گرینگترین کار کەبووە هۆی سەقامگیریی ئەم دیموکراسییە هاوپەیمانییە لە سەرەتای دەیەی ٨٠ بە دواوە، کۆدەنگی سیاسی و بنەڕەتی حیزبە جیاوازەکان لە پێوەندی لەگەڵ ستراتیژی نەتەوەیی گەشەسەندن (کە بووە هۆی دەستراگەیشتنی ئەم وڵاتە بە نرخی هەڵدانی ساڵانەی ٦ لە سەدی لە ساڵی ١٩٨٥ هەتا ١٩٩٤) و ڕێزلێنان لە ئەندامە جیاوازەکانی کۆمەڵگای فرەیی موریتس لە لایەن گرووپە جیاوازەکان، بووە.

لە پێوەندی لەگەڵ مالیزیاش، لەگەڵ ئەوەی ئەم وڵاتە تارادەیەك تایبەتمەندی مۆدێلی حیزبی دەسەڵاتدار بەهۆی زاڵبوونی ڕێکخراوی نەتەوەیی مالاییە یەکگرتووەکان[2] لە بواری سیاسەتی ئەم وڵاتە پەیڕەو دەکرێ، بەڵام دەتوانین وەك نموونەیەکی دیکە لە کۆمەڵگای فرەیی، کە لە پێکهێنانی دیموکراسی گەشەخوازی هاوپەیمانی سەرکەوتوو بێ، ناو ببەین.

(1) Toleration.
(2) UMNO.





حەشیمەتی مالزیا لە ٥٨ لە سەد مالایی، ٣٢ لە سەد چینی و ٩ لە سەد بە رەگەز هیندی پێکهاتووە. ٥٤ لە سەد لە حەشیمەتی موسوڵمان، ١٩ لە سەد بودایی، ١٢ لە سەد کۆنفۆسیۆس و ٧ لە سەدیش مەسیحین. (Derby Shire, 1996, p.167-8).

هەرچەند کە پۆستەکانی ((سەرۆکی دەوڵەت)) و ((سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران)) لە مالیزیا لە دەستی مالاییەکانە و ڕێکخراوی نەتەوەیی مالاییە یەککگرتووەکانیش حیزبی دەسەڵاتداری مالیزیایە، بەڵام دەسەڵاتی سیاسی ئەم حیزبە بە هۆی هاوپەیمانی ئاڵۆز پێکهاتەی فیدراڵ کۆنترۆڵ دەکرێ و ئەم تایبەتمەندییە ئەوی لە چوارچێوەی ئەو مۆدێلە هاوپەیمانییە کە جێگای سەرنجی ئێمەیە داناوە.

لە ساڵی ١٩٦٩ جیاوازیی نێوان مالایی و چینییەکان بەوپەڕی خۆی گەیشت و بووە هۆی هەڵپەساردنی دیموکراسی لە وڵاتدا. بەڵام ئەم گرژی و ئاڵۆزییانە سەرئەنجام پێکهێنانی هاودەنگی سیاسی نوێ لە چوارچێوەی ((هاوپەیمانییەکی دەسەڵاتدار)) لێکەوتەوە کە ئەرکی بە دواداچوونی ستراتیژی گەشەخوازیی کە ئەندامان لەسەری ڕێککەوتبوون لە ڕێگای یاسای بنەڕەتی و ڕێککەوتنی سیاسی، کە دەسەڵاتی سیاسی و بەڕێوەبەری گەشەخوازی لە ناوەند کۆدەکردەوە، گرتە ئەستۆ. ئەم کۆدەنگییە نوێیە بەش بە حاڵی خۆی، نوخبەکانی سیاسی و ئابووری لە بەدواداچوونی ئامانجی گەشەخوازی و یان چاکسازی ستراتیژی و ڕۆڵی دەوڵەت لەودا (ئەگەر پێویستی بکردایە) بەرپرسیار دەکرد. (Bowie, 1991).

لەو کاتە بە دواوە، مالیزیا هەڵدانی ئابووری بەرچاوی بە خۆوە بینیوە، بە جۆرێك کە لە ناوەڕاستی دەیەی ٨٠ بە دواوە نێونجی نرخی هەڵدانی ساڵانەی بەرهەمی ناپالْفتەی نەتەوەیی ئەم وڵاتە ٥,٦ لە سەد بووە.

بەم جۆرە، لە حاڵێکدا دیموکراسییەکانی هاوپەیمانی پێوانەکانی دیموکراسییان بە تەواوی لەبەرچاو دەگرت، جیاوازی پێکهاتەیی لە دیموکراسی گەشەخواز، لە ڕێگای ڕێککەوتنی گرووپە جیاوازەکان سەبارەت بە سیاسەتەکانی گەشەخوازی، نامێنێ.

لە لایەکی دیکەوە، هەرچەند کە ئاستی سەربەخۆیی ڕێژەیی دەوڵەت لەم مۆدێلەدا لە بەراورد لەگەڵ مۆدێلی حیزبی دەسەڵاتدار دێتە خوارەوە، بەڵام سەقامگیری سیاسی لە ئاکامی پرۆسە پتەوکردنی دیموکراتیك کە بەرهەم ڕێککەوتنی گرووپە جیاوازەکانە لەم مۆدێلەدا زۆرتر لە مۆدێلی حیزبی دەسەڵاتدارە.

ئێستا بە ئاماژە کردن بە دیموکراسییەکانی گەشە نەکردوو، هۆکارەکانی لاوازیی توانایی پەرەسەندنی ئەوان تاوتوێ دەکەین.



٣- دیموکراسییەکانی گەشە نەکردوو لەسەر بنەمای ڕێککەوتنی چینایەتی.[1]

لە سەرەتادا دەبێ ئاماژە بەم خاڵە بکەم کە بەکارهێنانی تایبەتمەندی ((گەشەنەکردوویی)) بەم مۆدێلە و مۆدێلەکانی دوایی لەبەر دوو هۆ بەڕێوەچووە. یەکەم، مەبەستی من گەورەکردنەوەی جیاوازی نێوان دەستکەوتەکانی هەڵدانی بەرچاوی ئابووری مۆدێلەکانی حیزبی دەسەڵاتدار و هاوپەیمانی و نرخی هەڵدانی ئابووری لەسەرەخۆ و (لە هەندێك حاڵەتدا نێگەتیڤ)ی دوومۆدێلی دیکە بووە. هۆکاری دووەمی بەکارهێنانی ئەم تایبەتمەندییە، نیشاندانی ئاسەواری گەشەخوازی و سیاسی نموونە جیاوازەکانی سیاسەتی دیموکراتیکە.

وادێتە بەرچاو کە ((دەوڵەتی دیموکراتیك لەسەر بنەمای ڕێککەوتنی چینایەتی))، باشترین و یان تەنیا ڕێگای چارەسەرە لە کۆمەڵگایەکدا کە خاوەنی تایبەتمەندییەکانی خوارەوەیە. ئەم تایبەتمەندییانە بریتین لە:

١- کۆمەڵگایەك کە جیاوازی چینایەتی، گرینگترین جیاوازی کۆمەڵایەتی ئەو کۆمەڵگایانەیە.

٢- هێزە سیاسییە گرینگەکان بەم ئاکامە گەیشتوون هەتا کاتێك ڕەوشی لەبار بۆ شۆڕشێکی سەرکەوتوو (وەدەستهێنانی دەسەڵاتی دەوڵەت) نەڕەخسێ، بەردەوامی گرژی و ئاڵۆزی و خەبات هەزینەی زۆری ئابووری بەدوای خۆیدا دێنێ و بە پێچەوانەی ڕەوتی بەرهەمهێنانە.

٣- تەنانەت ئەگەر یەکێك لە حیزبەکان زۆرینەی پێویستی بۆ بەرەو پێشبردنی سیاسەتەکانی جێگای سەرنجی خۆی بەدەست بێنێ، گۆڕانکاریی خێرا و بە پەلە لە ئاکامی سیاسەتەکانی ئەم حیزبە (هەرچەند لە ڕوانگەی گەشەخوازییەوە پێویست دێتە بەرچاو)، بەرژەوەندی گرووپەکانی دیکە بە جۆرێك دەخاتە مەترسییەوە کە ئەگەری کەڵك وەرگرتن ئەم گرووپانە لە شێوازە نادیموکراتیکەکان بۆ پشتیوانی لە بەرژەوەندی جێگای سەرنجی خۆیان، کە دەبێتە هۆی ڕووخانی دیموکراسی، هەیە. (وەك شیلی).

هەروەها بوونی هاوپەیمانی فەرمی و نا فەرمی لە نێوان حیزبە جیاوازەکان یەکێك لە ئامرازەکانی نیهادینەکردن و چاودێری بەسەر پاراستنی ((ڕێککەوتی بنەڕەتی))ە کە لە نێوان گرووپە جیاوازەکان پێکهاتووە کە دەبێتە هۆی پتەوبوون و بەهێزبوونی دەوڵەتە دیموکراتیکەکان لەسەر بنەمای ڕێککەوتنی چینایەتی.

(1) Class-Compromise-Developmental Democracies.

هەرچەند کە هەندێك لە تایبەتمەندییەکانی مۆدێلی هاوپەیمانی و مۆدێلی ڕێککەوتن هاوبەشە، بەڵام ئەم دوو مۆدێلە دوو جیاوازی سەرەکییان پێکەوە هەیە.

یەکەم، ڕەوتی دیموکراتیزاسیۆن لەو دیموکراسییانەی کە بە هۆی ڕێککەوتنی چینایەتی پێکهاتوون لەسەر ئەم گریمانە سەرەکییە دامەزراوە، کە ((بەڕێوەبردنی سیاسەتە دیموکراتیکەکان نابێ ببێتە هۆی لاوازکردنی بنەما سەرەکییەکانی ژیانی ئابووری سەرمایەداری، تەنانەت ئەگەر دەوڵەت ڕۆڵی گرینگ لەودا بگرێتە ئەستۆ)).

دووەمین جیاوازی ئەمەیە کە لە دیموکراسییەکانی ڕێککەوتنی چینایەتی، لە نێوان گرووپە جیاوازەکان ڕێککەوتننامەی ئاشکرا لە پێوەندی لەگەڵ دیاریکردنی بەربەستی سیاسی (چوارچێوەی گۆڕانکاریی سیاسی لە ئاکامی ئاڵوگۆڕی حیزبە دەسەڵاتدارەکان) هەیە.

باشترین نموونە بۆ دەوڵەتێکی دیموکراتیکی گەشە نەکردوو کە لەسەر بنەمای ڕێککەوتنی چینایەتی پێکهاتووە، دەوڵەتی ڤێنزوئیلایە.

ڕەنگە بتوانین مێژووی سیاسی ڤێنزوئیلا لە سەدەی ١٩ هەتا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم بە مێژووی پڕاوپڕ لە بزووتنەوە، شۆڕش و ڕژێمە سەربازییە دیکتاتۆرەکان ناوبنێین کە گرینگترینیان دیکتاتۆری ژنراڵ گومز[1] لە ساڵی ١٩٠٩ هەتا ١٩٣٥ و ژەنراڵ مارکۆس پرز خیمێنزە[2] لە ساڵی ١٩٤٨ هەتا ١٩٥٨. (Kornblith, 1991).

ئابووری کشتوکاڵی وەستاو و لاوازی ڤێنزوئێلا لە سەردەمی سەربەخۆیی لە ساڵی ١٨٣٠، پاش دەستپێکردنی هەناردنی قاوە لە ناوەڕاستی سەدەی ١٩، تاڕادەیەك ڕوو لە گەشەی کرد. بەڵام گرینگترین هۆکاری گۆڕانکاری کۆمەڵگای ڤێنزوئێلا گەشەی پیشەسازی نەوت بوو لە دەیەی ٢٠ کە بووە هۆی کۆچی بەربڵاوی نێوخۆیی، وێرانکردنی زەوییە کشتوکاڵییەکان و چوونە سەری دەسەڵاتی مالی دەوڵەت. (Levine, 1989, p.250).

ئەم پێشکەوتننانە بوونە هۆی سەرهەڵدانی گۆڕانکاری قووڵی سیاسی و مەدەنی لە کۆمەڵگای ڤێنزوئێلا بە جۆرێك کە زۆربەی نوخبەکانی بواری ئابووری و کۆمەڵایەتی نیگەران بوون و ڕژێمی دەسەڵاتدار دەستی بە سەرکوتی ئەوان کرد. بەتایبەتی ئەم گۆڕانکارییە، بواری پەرەپێدانی یەکیەتی بەهێزی تیجاری و ڕێکخراوی دیکەی کۆمەڵگای مەدەنی ڕەخساند.

---

(1) General Gomez.
(2) General Marcos Perez Jimenez.





بە دوای هەندێك لەم ئازادییانە کە لە سەردەمی حکوومەتی ((مەدینا))[1] پێکهات، حیزبی ((کرداری دیموکراتیك)) دامەزرا.

ئەم حیزبە توانی بە یارمەتی هەندێك لە ئەفسەرە لاوەکان، ڕژێمی دەسەڵاتدار لەسەر کار لاببا و دیموکراسی پێکبێنێ، بەڵام ئەم قۆناغە تەنیا ٣ ساڵی خایاند کە بە قۆناغی ((ترینیۆ))[2] ناسراوە.

لە قۆناغی ((ترینیۆ)) حیزبی کرداری دیموکراتیك لە ڕووی سیاسییەوە لانیکەم بێ هاوتا بوو هەر بۆیە وەك حیزبیکێ دەسەڵاتدار و زاڵ هەڵسوکەوتی دەکرد. سیاسەتەکانی چاکسازی ئەم حیزبە کە لە پێناوی بەرژەوەندی وەرزێران و کرێکاران بوو بە پێچەوانەی ڕێوشوێنەکانی کلێسابوو. بەرژەوەندی زۆری گرووپەکان (لەوانە خاوەن زەوییەکان، نەوت، تیجارەت و کلێسا) کەوتە مەترسییەوە. (Karl, 1986, p.72-6).

هەڵسوکەوتی حیزبی کرداری دیموکراتیك، بووە هۆی دامەزرانی چەند گرووپی پارێزگار دژی ئەم حیزبە و سەرئەنجام لە نوامبەری ١٩٤٨ قۆناغی ((ترینیو)) بە هۆی کودەتای سەربازی کۆتایی پێهات. بەم جۆرە، بۆ ماوەی یەك دەیە ڕژێمی دیکتاتۆری ژەنەڕاڵ خیمێنز لە ڤێنزوئێلا دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت. دیارە لە ماوەی ئەم یەك دەیەدا، سەرەڕای سەرکوتی توندی دەزگا ئەمنییەکان، بزووتنەوەکانی دژی ڕژێمی دیکتاتۆری وەك ((کلێسای کاتۆلیك))، بە خێرایی پەرەیان ئەستاند. پەرەسەندنی ئەم دژایەتییە ناڕەزایەتی خەڵك و خۆپێشاندانی سەر شەقامەکانی لێکەوتەوە و سەرئەنجام لە کانوونی دووەمی ١٩٥٨ ڕژێمی دیکتاتۆری و سەربازی خیمێنز هەرەسی هێنا و سیستەمی دییموکراتیك جێگای گرتەوە کە تا ئێستاش بەردەوامە.

گرینگترین خاڵ کە لێرەدا پێویستە ئاماژەی پێبکەم، ئەمەیە کە حیزبە جیاوازەکانی ڤێنزوئێلا وەك حیزبی کرداری دیموکراتیك، بە سەرنجدان بە ئەزموونی قۆناغی ((ترینیۆ)) بەم ئاکامە گەیشتبوون کە بەردەوامی دیموکراسی پێویستی بە ڕەوتی ڕێککەوتن و ئاشتەوایی و دووربینی هەیە و چاکسازی بنەڕەتی لە پێکهاتە کۆنەکان دەبێ بەرە بەرە (نەك لە ناکاو و بە پەلە) بەڕێوەبچێ.

هەروەها، چینی سیاسی ڤێنزوئێلاش بەم ئاکامە گەیشتبوون کە بەردەوامی دیموکراسی ڤێنزوئێلا تەنیا لە حاڵەتی پێکهێنانی ڕێککەوتن، هاوپەیمانی لە نێوان نوخبەکان، پرۆگرامی

---

(1) Medine.
(2) Trienios.

سنوورداری چاكسازی، بەشداری سیاسی كۆنترۆڵی كراو و لابردنی گرووپە سیاسییەكانی چەپی شۆڕشگێڕ لە گۆڕەپانی سیاسی ڤێنزوێلا ئیمكانی هەیە. (Levine, 1989, p.257).

هەتا ئەمڕۆ، كۆمەڵێك لە ڕێككەوتننامەی گرینگ بە مەبەستی ((پێكهێنانی ڕەوشێكی سیاسی بۆ ململانێی نوخبەكان لەگەڵ یەكتر و هتد... و دیاریكردنی سنوورەكانی ئابووری دەوڵەتی و كەرتی تایبەتی، ڕەخساندنی گەرەنتی پێویست بۆ سەرمایەی تایبەتی و دەستنیشانكردنی تایبەتمەندییەكانی چاكسازی ئابووری-كۆمەڵایەتی داهاتوو)) پێكهاتوون. (Karl, 1986, p.66).

ئەم ڕێككەوتننانە كە لە ساڵی ١٩٥٨ بەسترا، بریتین لە: ڕێككەوتنی پانتۆ فیجۆ[1]، ڕێككەوتننامەی (مالیك-كرێكار)، ڕاگەیەندراوی بنەماكان و ((لانیكەمی پرۆگرامەكانی دەوڵەت))[2] كە پرۆگرامە سیاسی و ئابوورییەكان كە پێویستە دەوڵەت جێبەجێ بكا، دیاری دەكا. (Mc Coy, 1998).

**ئەم ڕێككەوتننانە بۆچی پێكهاتن؟**

لە ڕووی سیاسییەوە ٣ حیزبی سەرەكی ڤێنزوێلا ڕێككەوتبوون كە پێش بە هاتنی كۆمۆنیستەكان بۆ گۆڕەپانی سیاسی بگرن و هەریەك لەوان، بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی كە كام یەك لە حیزبەكان لە هەڵبژاردنی سەرۆك كۆماریدا سەردەكەوێ، بەشێك لە پۆستەكانی كابینەیان هەبێ. (Przeworski, 1992, p.124).

لەگەڵ ئەمەشدا، تەواوی ئەو تاوانانەی كە هێزە سەربازییەكان لە ماوەی ڕژێمی رابردوودا تووشی ببوون، ببەخشرێن و بەڵێنیان پێدرا كە داهاتیان زیاد دەكا.

لە ڕەهەندی ئابووریشەوە، حیزبە سەرەكییەكانی وڵات سەبارەت بە ستراتیژییەكی نەتەوەی گەشەسەندن كە دەوڵەت لەودا ڕۆڵی سەرەكی هەیە، ڕێككەوتن. ئەم ستراتیژییە لەسەر بنەمای سەرمایە نێوخۆیی و دەرەكییەكان بوو و بریتی بوو لە بەخشینی یارمەتی[3] بە كەرتی تایبەتی، پاراستنی ئەسڵی قەرەبوو كردنەوە[4] لە بەرامبەر هەر جۆرە چاكسازی زەوی كشتوكاڵی و بە گشتی خاوەنی سیاسەتێكی بە پارێز بوون بەرامبەر بە چاكسازی كۆمەڵایەتی و ئابووری. (Levine, 1989, p.258).

(1) Punto Fijo.
(2) Minimum Program of Government.
(3) Subsidy.
(4) Principle of Compenasation.



شایانی باسە، كە ئەم ڕێككەوتننانە نیشاندەری ڕەهەندی پارێزگارانەی دیموكراسییە كە پێشتریش ئاماژەم پێكردووە. لە ڕاستیدا ئەم ڕێككەوتننانە بەم مانایەیە كە ((سەرمایەدارەكان قەبووڵی دەكەن كە دامەزراوە دیموكراتیكەكان وەك ئامرازێكی كاریگەر لە دەستی كرێكاران بۆ باشكردنی ڕەوشی ماددی ئەوانە و لە لایەكی دیكەوە كرێكارانیش ((خاوەنداریێتی تایبەتی سوود))[1] لەلایەن خاوەن سەرمایەكان بۆ وەدەستهێنانی قازانجی زیاتر لە بەرهەمهێنان قەبووڵ دەكەن)). بە واتایەكی دیكە كرێكاران ((سەرمایەداری)) قەبووڵ دەكەن و سەرمایەدارەكانیش ((دیموكراسی)) قەبووڵ دەكەن هەتا بەم جۆرە پێش بە پێكهێنانی بژاردەی سنووردارتر بگرن. (Mc Coy, 1988, p.86).

٣ هۆكار لە كارابوونی ڕێگاچارەی پێشكەشكراو بۆ چارەسەری جیاوازی دیموكراسی گەشەخواز لەم وڵاتە، كاریگەر بووە. یەكەمین هۆكار، بوونی سەرچاوەی گەورەی نەوت لە ڤێنزوێلا بوو، كە بەسەرنجدان بە زیادبوونی بەهای نەوت لە دەیەی ١٩٧٠ دەوڵەت توانی بە دیاریكردنی بوودجەی پێویست و پێشكەشكردنی خزمەتگوزاری وەك فێركردن، تەندرووستی و شوێنی نیشتەجێ بوون بۆ بەشێكی بەرچاو لە خەڵك، بووە هۆی پتەوبوونی ڕێككەوتننامەكان و ڕەوایی ئەوان. (Smith, 1995, p.122).

دووەمین هۆكاریش ئەمەیە كە سەرەڕای فیدراڵی بوونی سیستەمی سیاسی، ڤێنزوێلا بەردەوام خاوەنی دەوڵەتێكی ناوەندی بەهێز بووە. بەم جۆرە نوخبە سیاسییەكانی دەسەڵاتدار توانییان بە شێوەیەكی كاریگەر بە سەر بەڕێوەچوونی سیاسەتەكانی جێگای سەرنجی خۆیان لە تەواوی وڵاتدا چاودێری بكەن.

سێهەمین هۆكاریش ئەمەیە كە، ((سەرەڕای ئەوەی كە هاوپەیمانییەكان و ڕێككەوتننامە چینایەتییەكان بووە هۆی سنووردارکردنی دەسەڵات، سەربەخۆیی و توانایی گەشەخوازی دەوڵەت، بەڵام ئەم خاڵە لاوازە لە ڕێگای هاوكاری نزیكی حیزبە سیاسییە بەهێزەكانی وڵات لەگەڵ یەكتر لە كۆمیسیۆنەكانی داڕشتنی سیاسەت، قەرەبوو دەكرایەوە. ئەم كۆمیسیۆنانە، بەگشتی بۆ داڕشتنی پرۆگرام و بەدواداچوونی ئامانجەكانی گەشەخوازیی دەوڵەت پێكهاتوون. هەروەها ئەم كۆمیسیۆنانە، بە مەبەستی بردنە سەری ئاستی سەربەخۆیی گەشەخوازیی دەوڵەت، لە دەرەوەی پرۆسەكانی بەشداری خەڵك و چاودێری یاسایی بوو. (Grisp, 1994).

(1) Private Appropration of Profit.





شایانی باسە کە گرتنە پێشی ئەم سیاسەتانە لە ڤێنزوێلا لە سەرەتادا زیاتر لەوەی کە ببێتە هۆی گەشەسەندنی ئابووری و یەکسانی دەرەتانەکانی ئابووری-کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگادا، بووە هۆی پتەوبوون و بەهێزبوونی دیموکراسی.

کەوابوو، کەمبوونەوەی ڕێژەیی داهاتی نەوتی ئەم وڵاتە و چوونە سەری لە ڕادەبەدەری قەرزی دەرەوە لە دەیەی ١٩٨٠، بووە هۆی کەمبوونەوەی توانایی دەوڵەت بۆ بەردەوامبوونی ئەو بەڵێنانەی کە لە ڕێککەوتننامەکاندا ئاماژەی پێکراوە و ڕەوایی سیستەمی سیاسیش لاواز بوو. بەڕێوەبردنی پرۆگرامەکانی ((دان بە خۆداگرتنی ئابووری))ی سندووقی نێونەتەوەیی دراو لە کۆتایی دەیەی ١٩٨٠، نارەزایەتی بەربڵاوی لێکەوتەوە. بەڕێوەبردنی ئەم پرۆگرامانە، بووە هۆی پەرەپێدانی نایەکسانییەکانی پێشوو و چوونە سەری هەژاری لە کۆمەڵگای ڤێنزوێلا، بە جۆرێك کە ژمارەی کەسانی هەژار لە وڵات لە ٣٢ لە سەد لە ساڵی ١٩٨١ گەیشتە ٥٣ لە سەد لە ساڵی ١٩٨٩. (Mc Coy and Smith 1995, p.124-5).

بەم جۆرە، نارەزایەتی بەربڵاوی خەڵك، زیادی کرد و دوو کودەتاش لە ساڵی ١٩٩٢ ڕوودا. هەرچەند ڕێککەوتننامەی ((پانتۆفیجۆ)) پێش بە پێکهاتنی دەوڵەتێکی سەربازی لە ڤێنزوێلای دەگرت، بەڵام هەتا کاتێك هاوسەنگییەکی سیاسی نوێ لە نێوان حیزبە سیاسییەکانی ڤێنزوێلا (بە سەرنجدان بەوەی کە بە پێچەوانەی دەیەی ١٩٧٠، داهاتی نەوتی ئەم وڵاتە بە شێوەیەکی بەرچاو هاتبووە خوارەوە) بە پێی ڕێککەوتنی سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتی نوێ پێك نەیەت، دووره دیمەنی گەشەخوازی و دیموکراسی ئەو وڵاتە، هەروا بە ناسەقامگیری دەمێنێتەوە.

بارودۆخی ئەفریقای باشووریش وەك ڤێنزوێلا وایە و لەبەر ئەم هۆیە دەکەوێتە خانەی چوارچێوەی مۆدێلی دیموکراسی گەشە نەکردوو. زۆربەی لێکۆڵەران پێیان وایە کە کۆسپەکانی سەر ڕێگای گەیشتن بە دیموکراسی گەشەخواز لە ئەفریقای باشوور جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ڤێنزوێلا نییە. (Lodge, 1995).

کۆتایی قۆناغی ئاپارتاید، شاهیدی سەرهەڵدانی ڕێککەوتننامەی ئاڵۆزی چینایەتی لەگەڵ پرسی قەومی و نەژادی لەم وڵاتەدا بووە.

دەوڵەتی دیموکراتیکی نوێ، سێ ئەرکی گرینگی لەسەرشانە. یەکەم، بە مەبەستی چاکسازی نایەکسانییەکان لە کۆمەڵگا، دەوڵەت ناچارە سیاسەتەکانی ((سەرلەنوێ دابەشکردنی سەروەت)) بگرێتە پێش. دووەم، وەك دەستپێکی بەڕێوەبردنی ئەم سیاسەتانە،



دەوڵەت دەبێ بە گرتنە پێشی سیاسەتی گونجاو ببێتە هۆی هەڵدانی خێرای ئابووری کەرتی تایبەتی و ڕاکێشانی سەرمایەی دەرەکی. دوایین ئەرکی گرینگی دەوڵەتیش، پاراستنی ((سەقامگیریی سیاسی دیموکراتیك))ە لە کاتی بەڕێوەبردنی سیاسەتەکانی سەرەوە.

ئەم کێشانە، بە باشی، هۆکاری کەمبوونی تواناییەکانی گەشەخوازی ((دەوڵەتانی دیموکراتیك لەسەر بنەمای ڕێککەوتنی چینایەتی)) نیشان دەدا. لە حاڵێکدا کە ئازادییە مەدەنی و سیاسییەکان، وەك بەشێك لە ڕەوتی دیموکراتیك، دەبێ لە لایەن دەوڵەتەوە، ڕێزی لێبگیرێ، سەربەخۆیی گەشەخوازیی دەوڵەت بە هۆی بەربەستەکانی پێکهاتوو لە ئاکامی ڕەوتە دیموکراتیکەکان کەم دەبێتەوە و بەم جۆرە توانایی گەشەخوازی دەوڵەتیش لاواز دەبێ.

لە کۆتاییدا دەبێ بڵێین بە سەرنجدان بە باسەکانی سەرەوە، هەردوو نموونەی ڤێنزوێلا و ئەفریقای باشوور، نیشاندەری ئەولەوییەتی سیاسەتە لە پێکهێنانی تایبەتمەندییەکانی دەوڵەت و توانایی و سەربەخۆیی گەشەخوازی.

٤- دەوڵەتانی دیموکراتیکی گەشەنەکردوو لەگەڵ سیستەمی جێگۆڕکێی حیزبەکان لە دەسەڵات[1]

ئەو وڵاتانەی کە خاوەنی حیزبێکی سیاسی دەسەڵاتدار نین، فرەیی مەزهەبی، قەومی و فەرهەنگی ڕۆڵێکی ئەوتۆی لە پرسە سیاسییەکاندا نییە و کێشەی ڕێککەوتنی چینایەتی بە هۆی بان چینایەتی[2] بوونی حیزبە سەرەکییەکانی وڵات زۆر جێگای باس نییە، خاوەنی ڕەوشێکی پێویستە بۆ پێکهێنانی لەم چەشنە لە دەوڵەتی دیموکراتیك. (Stone, 1980, Edie, 1991).

مۆدێلی جێگۆڕکێی حزبەکانی لە دەسەڵات تەنیا لەو وڵاتانە بەڕێوەدەچێ کە حیزبە سەرەکییە بان چینایەتییەکان لە پێوەندی لەگەڵ سیاسەتەکانی گەشەسەندن بە کۆدەنگییەك گەیشتبێن ئەو کات دەتوانن بەردەوامی دیموکراسی گەرەنتی بکەن. کاستاریکا نموونەیەکی باشە بۆ ئەم مۆدێلە.

لەم وڵاتەدا، لە ساڵی ١٩٤٩ بە دواوە، بەردەوام دوو حیزبی سەرەکی بان چینایەتی وڵات کە بریتین لە حیزبی ئازادی نەتەوەیی[3] و حیزبی یەکگرتنی سۆسیالیست مەسیحی[4]، لە دەسەڵات جێگۆڕکێ دەکرێن. هەردوو حیزب، هەڵگری بیرۆکە دژی کۆمۆنیستین (وەك

(1) Alternating –Party non– Developmental Democratic States.
(2) Cross-Class Parties.
(3) National Liberation Party.
(4) Christion Socialist Unity Party.





ڤێنزوئێلا) و ستراتیژی ئابووری لەگەڵ پەرەپێدانی خۆشگوزەرانی گشتی و کەمکردنەوەی نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکانیان گرتووەتە پێش. چونکە پێیان وایە ((گەشەسەندنی کۆنترۆڵ نەکراوی سەرمایەداری، دەبێتە هۆی نایەکسانییەکان و بشێوی کۆمەڵایەتی-ئابووری ناسەقامگیر و نەگونجاو)). (Booth, 1989, p.404).

ئەم تایبەتمەندییانە بوونە هۆی بەردەوامی و مانەوەی دیموکراسی لە کاستاریکا. هەرچەند نرخی هەڵدانی ئابووری ئەم وڵاتە نزم بووە و کەمبوونەوەیەکی زۆر کەم لە ڕێژەی نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگای کاستاریکا پێکهێناوە.

بەڵام کاتێك جیاوازی توندی ئایدۆلۆژیا لە نێوان حیزبە سەرەکییەکانی وڵات، کە بووە هۆی جیاوازی بەرچاو لە سیاسەتەکانی حیزبی (هەم لە سیاسەتەکانی گەشەخوازیی نێوخۆیی و هەم سیاسەتی دەرەوە)، لە ئاردا بێ، بەردەوامی دیموکراتیك دەکەوێتە مەترسییەوە کە بۆ خۆی کاریگەری نێگەتیڤ لەسەر ڕەوتی هەڵدانی ئابووری و پرۆسەی گەشەسەندن دادەنێ. دەتوانین وەك نموونەیەکی گونجاو ئاماژە بە جامائیکا بکەین.

مێژووی کۆلۆنیالیزمی ئەم وڵاتە و ئابووری کشتوکاڵییەکەی کە ببووە هۆی ئەوەی کە ئەم وڵاتە لە کاتی سەربەخۆیی لە ساڵی ١٩٦٢ لەگەڵ کەرتی زۆر لاوازی پیشەسازی، بێکاری بەربڵاو و نایەکسانی لە ڕادەبەدەر لە داهاتەکان ڕووبەڕوو بێ، بە جۆرێك کە تەنانەت لە سەرەتای دەیەی ١٩٩٠یش بە پێی ڕاپۆرتی بانکی جیهانی، ٤٧ لە سەد لە داهاتی وڵات لە دەستی ٢٠ لە سەدی سەرووی هیرەمی حەشیمەتی جامائیکا بوو و تەنیا کەمتر لە ٦ لە سەدی داهاتی وڵات تایبەت بوو بە ٢٠ لە سەدی خوارووی هیرەمی جامائیکا. (World Bank, 1996).

لەم وڵاتەدا، دوو حیزبی سەرەکی کە بریتین لە حیزبی کاری جامائیکا[1] و حیزبی نەتەوەیی گەل[2]، لە کاتی سەربەخۆییەکەی، بەردەوام دەسەڵاتیان بەدەستەوە بووە. (Monroe, 1972)

ئەم حیزبانە، حیزبی بان چینایەتی بوون و خاوەنی ستراتیژی ئابووری تێکەڵاون. لەگەڵ ئەمەشدا حیزبی نەتەوەی گەڵ، لە ڕووی مێژووییەوە، خاوەن ڕوانگەیەکی چەپ بووە. لە حاڵێکدا حیزبی کاری جامائیکا هەڵوێستی لیبراڵی بووە و زیاتر لە حیزبی بەرامبەری خۆی پشتیوانی لە سەرمایەی تایبەتی (بە تایبەتی دەرەکی) کردووە و خوازیاری هاوکاری بەربڵاو

(1) Jamaica Labour Party.
(2) People's National Party.



لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بووە. لە ژێر دەسەڵاتی حیزبی کاری جامائیکا، لە کاتی سەربەخۆیی هەتا سەرەتای دەیەی ١٩٧٠، ئەم جیاوازییانە زۆر زەق نەبوون. هەرچەند بە درێژایی ئەم ماوەیە نایەکسانی توندی کۆمەڵایەتی و بێکاری بەربڵاو (٢٣ لە سەد لە ١٩٧٢) لە کۆمەڵگادا بووە.

لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٧٢، حیزبی نەتەوەیی گەل بۆ یەکەمین جار پاش یەك دەیە دەسەڵاتی حیزبی کار، دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت و پرۆگرامێکی هەمە لایانەی بە مەبەستی کەمکردنەوەی بەرستراوەیی ئابووری، چوونە سەری ڕۆڵی دەوڵەت، دابەشکردنی عادیلانەی سەرچاوەکان، دەستڕاگەیشتن بە سەربەخۆیی سیاسی لە ڕۆژئاوا و پێکهێنانی پێوەندی باشتر لەگەڵ کوبا داڕشت. (Stepden and Stephens,1986,p.101, Huber and Stephens,1992,p.63-5).

بەڕێوەبردنی ئەم سیاسەتانە بوونە هۆی لاوازی کەرتی تایبەتی و چوونە دەرەوەی سەرمایەکان لە وڵات. ناسەقامگیری سیاسی و توندوتیژی زیادکردو بووە هۆی سەرهەڵدانی حاڵەتی نائاسایی لە ساڵی ١٩٨٦ و مەترسی کودەتای سەربازی لە ساڵی ١٩٨٠. (Stephen and Stephens, 1986, p.231).

چوونە سەری دوژمنایەتی ئەمەریکا و قەیرانی توندی باڵانسی پێدانی وڵات، حیزبی نەتەوەیی گەلی ناچار بە بەڕێوەبردنی ڕاسپاردەکانی سندووقی نێونەتەوەیی دراو کرد. شکستی حیزب لە بەڕێوەبردنی دروستی سیاسەتەکانی سندووق، بووە هۆی چوونە دەرەوەی لە دەسەڵات لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٨٠ و بە دەسەڵات گەیشتنی سەرلەنوێی حیزبی کاری جامائیکا.

بەم جۆرە حیزبی کار، سیاسەتەکانی حیزبی نەتەوەیی گەلی وەلانا و لە بەرامبەردا ڕاسپاردەکانی سندووقی نێونەتەوەیی دراو و پرۆگرامەکانی هاوسەنگ کردنی پێکهاتەیی بەڕێوەبرد. بەڕێوەبردنی ئەم پرۆگرامانە، سەرەڕای بەهێزبوونی هەڵدانی ئابووری لە کۆتایی دەیەی ١٩٨٠، لاینگری زۆر نەبوو و لە ئاکامدا حیزبی نەتەوەیی گەل لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٨٩ سەرکەوت.

بەڵام حیزبی نەتەوەیی گەل، لە گۆڕینی سیاسەتەکانی دەوڵەت خۆی بوارد و مۆدێلی حیزبی کاری لە دەیەی ١٩٨٠ کە بریتی بوو لە بە تایبەتی کردن، ئازادکردن، سیاسەتەکان دان بەخۆداگرتنی ئابووری[1] و بەهێزکردنی هەناردە پەیڕەوکرد. (Huber and Stephans, 1992, p.79).

بەم جۆرە، وادێتە بەرچاو کە جامائیکاش بووەتە دەوڵەتێکی دیموکراتیك بە سیستەمی جێگۆڕکێ حیزبەکان لە دەسەڵات و کۆدەنگی بەربڵاو لە پێوەندی لەگەڵ گەشەسەندندا. هەردوو

(1) Austerity Policies.





حاڵەتی جامائیکا و کاستاریکا، بە روونی نیشاندەری ئەم پرسەن کە پتەوکردنی سیاسەتە دیموکراتیکەکان لەو دیموکراسییانەی کە لەسەر بنەمای جێگۆڕکێی حیزبەکان لە دەسەڵات دامەزراوە، تەنیا کاتێك روو دەدا کە کۆدەنگی بەربلاو لە نێوان حیزبە سەرەکییەکانی وڵات لە پێوەندی لەگەڵ سیاسەتەکانی گەشەخوازی پێك بێ.

### هیند نموونەیەکی ڕێزپەڕ (دەگمەن)

پێش دەرئەنجام، دەبێ ئاماژە بەم خاڵە بکەم کە لەبەرچاو نەگرتنی هیند لە هیچ یەك لەم مۆدێلانەی سەرەوە، زۆرتر لەبەر ئاڵۆزی بەربلاوی بارودۆخی ئەو وڵاتە بووە. ناتوانین بە ئاسانی هیند لە چوارچێوەی یەکێك لەم مۆدێلانە جێ بکەینەوە، بەڵام وادێتە بەرچاو کە بە لەبەرچاو گرتنی مێژووی سیاسی هیند، دیموکراسی لەم وڵاتە لە بڕگە جیاجیاکاندا هاوسان بووە لەگەڵ یەکێك لە چوارچێوەکانی سەرەوە.

لە سەرەتادا دیموکراسی هیند، لەژێر دەسەڵاتی حیزبی کۆنگرە[1]، وەك مۆدێلی حیزبی بە زوویی تووشی هەرەسهێنان بوو و سەقامگیریی دیموکراسی هیند لە دوو دەیەی سەرەتایی بە نرخی ناکارامەیی گەشەخوازیی دەوڵەتی هیند، بەڕێوەچوو. (Nayar, 1979).

بەردەوامی دیموکراسی لە هیند، لە راستیدا بەرهەمی هۆکارەکانی وەك دەستەبەندی[2]، سیاسەتەکانی پشتیوانی[3] و هەوڵدان بۆ ئاوێتەکردن و رێککەوتن لە نێوان بەرژەوەندییە دژ بە یەك و جۆراوجۆری نێوخۆ و دەرەوەی حیزبە، کە بووە هۆی ((ناسەقامگیری لە داڕشتنی سیاسەت و بەڕێوەبردنی سیاسەتەکان و ناڕەزایەتییەکانی نێوخۆیی حیزب)). ( Kaviraj, 1996, Mitra, 1996, Corbridge and Harriss, 2000).

سێ دەیەی دوایی لە مێژووی سیاسی هیند، بەهۆی شکستی حیزبەکان لە وەدەست هێنانی زۆرینەی کۆنگرە، رەنگە سەرهەڵدانی سیاسەتی هاوپەیمانیی لەگەڵ چوونە سەری گرژی و ئاڵۆزیی قەومی، ناوچەیی و مەزهەبی بووبێ. سەرەڕای کێشەی قەومی، فەرهەنگی و مەزهەبی بەربلاو لە کۆمەڵگای هیند، پاراستن و بەردەوامی هاوپەیمانی پێکهاتوو زۆر دژوارە و هەر ئەم حاڵەتە گومانی زۆری لە پێوەندی لەگەڵ توانایی دەوڵەتی بۆ بەڕێوەبەری پێویستییەکانی گەشەخوازیی هیند دروست کردووە.

---

(1) Congress Party.
(2) Factionalism.
(3) Patronage Politic.







## دەرەنجام

لە فەسڵی پێشوودا ئاماژەم بەم خاڵە کردووە کە ناتوانین دەوڵەتانی گەشەخواز موهەندیسی بکەین و بیکەینە سەفارەشی. ئەم بابەتە لە پێوەندی لەگەڵ دەوڵەتانی دیموکراتیکی گەشەخوازیشدا راستە.

هەرچەند کە بیرکردنەوە سەبارەت بە دیموکراسی و گەشەسەندن وەك بایەخەکانی سازگار و هەماهەنگ زۆر سەنجڕاکێشن بەڵام هیوادارم بەو باسانەی لەم فەسڵەدا ئاماژەیان پێکرا، جیاوازی نێوان نێوەڕۆکی پارێزگارانەی سیاسەتە دیموکراتیکەکان و پێکهاتەی ئاڵوگۆڕخواز و رادیکاڵی گەشەسەندن نیشان بدەم.

یەکێکی دیکە لە ئامانجەکانی من لەم فەسڵەدا، نیشاندانی رۆڵی بنەڕەتی سیاسەت نە تەنیا لە پێکهێنانی جۆرە جیاوازەکانی دیموکراسی و توانایی گەشەخوازیی دەوڵەت، بەڵکو لە گرژی و ئاڵۆزییەکانی نێوان ئەم دووە بووە.

دیارە، پێم وانییە سیاسەت تەنیا هۆکاری کاریگەرە لەم بابەتەدا. چونکە روونە کە لە هەر حاڵەتێکدا کارکردی پێکهاتە نێوخۆییەکانی وڵات لە درێژایی مێژوو، ئابووری و پێکهاتەی کۆمەلایەتی کۆمەڵگا جێگای باسە. لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ ئاماژە بە کاریگەری چەند لایەنەی هۆکارە دەرەکییەکان وەك ئاسەواری پڕۆسەی بە جیهانی بوون لەسەر کۆمەڵگاکانیشدا بکەین. (Mc Grew, 1997).

جارێکی دیکە تەئکید دەکەمەوە کە بابەتی سەرەکی ئەمە نییە کە ((ئایا دیموکراسی دەبێتە هۆی بەهێزبوونی رەوتی گەشەسەندن یان رایدەگری؟)) ئاشکرایە کە هەندێك لە دیموکراسییەکان و هەندێك لە حکوومەتە نادیموکراتیکەکان، لە دەستڕاگەیشتن بە گەشەسەندنی ئابووری سەرکەوتوو بوون و هەندێکی دیکەش لەگەڵ شکست رووبەڕوو بوون.

لە راستیدا بابەتی سەرەکی جێگای باس لەم فەسڵەدا ئەمەیە کە ((کام یەك لە دیموکراسی لە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکاندا کە لە رووی پێکهاتەیی و تایبەتمەندیی کۆمەڵایەتی ئابووری جیاوازییان پێکەوە هەیە، دەرەتانی سەرهەڵدانی هەیە و هەریەك لە جۆرەکانی دیموکراسی هەتا چ ئاستێك، دەرەتانی پێکهێنانی دەوڵەتانی دیموکراتیکی گەشەخواز دەرەخسێنن؟)).



به واتایەکی دیکە، جۆری دیموکراسی گەشەخواز لە کۆمەڵگادا، راستەوخۆ بەستراوەتەوە بە کارکردی سیاسی جۆری دیموکراسی لە هەر کۆمەڵگایەکدا.

کەوابوو، دەبێ چەمکی گشتی و تێکەڵاویی دەوڵەتی گەشەخوازی دیموکراتیك شی بکەینەوە و جۆرە جیاوازەکانی تاوتوێ و پۆلین بەندی بکەین. چونکە، هەروەك دیموکراسییەکانی جیهانی سێهەم کە لەم فەسڵەدا ئاماژەمان پێکرد بە سەرنجدان بە هەندێك لە پێوەرەکانی گەشەخوازی دەتوانین پێیان بڵێین پەرەپێدەرانی ((باش)) یان ((خراپ))، لە رووی پێوەرە دیموکراتیکەکانیش دەتوانین بە ((باش)) و ((خراپ)) دابەشیان بکەین. بەم جۆرە دیموکراسییەکان بە پێی جێگۆڕکێی حیزبەکان لە دەسەڵات و دیموکراسییە هاوپەیمانییەکان لە بەراورد لەگەڵ دیموکراسی حیزبی دەسەڵاتدار دیموکراتیکترن، بەڵام لە رووی پێوانەکانی گەشەخوازی، توانای گەشەخوازییان کەمترە. سەرەڕای ئەم تایبەتمەندییانە، تەنیا کەسانی ساویلکە دەتوانن باوەڕیان بە بنەمای ((دیموکراسی وەك مەرجی پێویست بۆ گەشەسەندن)) بێ و یان ((گەشەسەندن و دیموکراسی وەك بەهاکانی ناسازگار لەگەڵ یەکتر)) چاو لێدەکەن.

راستی ئەمەیە کە شێوازە جیاوازەکانی دیموکراسی، مۆدێلی جۆراوجۆر لە گەشەخوازیی[١] پێکدێنن و بەرهەمی هاوکاریی لە نێوان گەشەسەندن و دیموکراسیش لە تایبەتمەندییەکان و توانایی دەوڵەت رەنگ دەداتەوە.

(1) Developmentalism.





# فەسڵی نۆیەم

## دەرئەنجام

بە سەرنجدان بە بابەتەکانی ئاماژەپێکراو لە فەسڵەکانی پێشوو لە رستەیەکدا دەتوانین بابەتی سەرەکی ئەم کتێبە ئەولەوییەتی سیاسەت لە گەشەسەندن ناو بنێین، چونکە سیاسەت شێوازی دەوڵەت دیاری دەکا و دەوڵەتیش هۆکاری سەرەکی گەشەسەندنە. پێم وایە ناتوانین بە سادەیی بایەخی سیاسەت، هاوشان لەگەڵ بگۆڕەکانی دیکە کە رۆڵیان لە گەشەسەندندا هەیە، بزانین. رۆڵی سیاسەت لەم رووەوە گرینگە کە بنەڕەتترین و دیاریکەرترین رەوتەکە شێوازی پێناسەکان، پرۆگرامەکان، رەوتەکانی بەڕێوەبەری و ئاکامی گەشەسەندن لە هەر ولاتێکدا دیاری دەکا و بەرەو پێشەوەی دەبا. لەبەر ئەم هۆیەیە کە لە سەردێڕ و فەسڵی سەرەتایی ئەم کتێبە لەسەر ئەولەوییەتی رۆڵی سیاسەت تەئکیدم کردووە. هەروەك لەو فەسڵەدا ئاماژەی پێکراوە، سیاسەت بە مانای چوارچێوەیەکی سەربەخۆی چالاکی لە کۆمەڵگایەکدا نییە، بەڵکو کارکردێکە لە پێکهاتە مێژوویی، کۆمەڵایەتی، ئابووری و فەرهەنگییەکانی ئەو کۆمەڵگایە. لەگەڵ ئەمەشدا سەرەڕای قەبووڵی ئەم پێناسەیە، نامەی من لەم کتێبەدا ئەوەیە کە، سیاسەت لە کردەوەدا لە رێگای دەوڵەتەوە شێوازی پێکهاتە سیاسی، کۆمەڵایەتی، مێژوویی و فەرهەنگییەکانی دیاری دەکا.

سیاسەتی هەر کۆمەڵگایەك، لە پێکهێنانی تایبەتمەندیی بنەڕەتی و توانایی دەوڵەت، رۆڵی دیاریکراوی هەیە و سیاسەتە جیاوازەکان، دەوڵەتانی جیاواز پێکدێنێ. بۆ وێنە، سیاسەتە دیموکراتیکە جیاوازەکان، دەوڵەتانی دیموکراتیکی جیاواز پێکدێنێ. بەڵام بەبێ لەبەرچاوگرتنی دیموکراتیك یان نادیموکراتیك بوونی دەوڵەت، سیاسەتە جیاوازەکان، دەوڵەتگەلێك بە ئامانج و توانایی گەشەخوازی جیاواز پێکدێنێ.

ئەم خاڵە زۆر گرینگە، چونکە تایبەتمەندییەکانی دەوڵەتە کە دەوڵەتانی گەشەخواز لەگەڵ جۆرەکانی گەشەنەکردوو لێك جیادەکاتەوە و فۆڕمی رژێم (دیموکراتیك یان نادیموکراتیك) رۆڵێکی ئەوتۆی نییە. لە نێوان دەوڵەتە دیموکراتیکەکان دەتوانین هەر جۆری دەوڵەتی



گەشەخواز و گەشە نەکردوو ببینین. بۆ وێنە سەرەڕای ئەوەی کە هیند، مالیزیا و سەنگاپوور وەك بەشێك لە دەوڵەتانی دیموکراتیك چاو لێدەکرێ بەڵام نرخی هەڵدانی لەسەرەخۆ و وەستاو لە دەوڵەتی هیند لەگەڵ نرخی هەڵدانی خێرا لە مالیزیا و سەنگاپوور بەراورد ناکرێ.

هەروەها دەوڵەتانی گەشەنەکردووی نادیموکراتیك و سەرکوتکەری وەك فیلیپینی سەردەمی مارکۆس و زائیری سەردەمی مۆبۆتۆ جیاوازییەکی زۆریان لەگەڵ دەوڵەتانی گەشەخوازی نادیموکراتیکی کۆریا، تایوان و تایلەند هەیە. بەڵام خاڵی سەرەکی لە تەواوی ئەم نموونانەدا ئەمەیە کە ئەم جۆرە دەوڵەتانە لە گەشەخواز یان گەشە نەکردووەوە بگرە تا دیموکراتیك یان نادیموکراتیك، بەرهەمی ئەزموونی مێژوویی و سیاسەتە جیاوازەکانی ئەم وڵاتانەیە. لەبەرچاو گرتنی ئەولەوییەتی سیاسەت لە گەشەسەندن، یەکێك لە کارە هەرە دژوارەکانی زانستی سیاسی مۆدێرنە لە هێنانە بەرباسی ئەم نموونە سیاسییانە و جۆری دەوڵەتەکان و دیاریکردنی پرسی گەشەخوازیی ئەوان.

لەم پێناوەدا، زانستی سیاسی دەبوایە لە خوێندنەوە و تاوتوێکردنی گەشەسەندن لە بەراورد لەگەڵ ساڵەکانی رابردوو، رۆڵی گرینگتر و کاریگەرتر بگێڕێ و پرسە پێوەندیدارەکان بە سیاسەتەکانی گەشەخوازی دەبێ لە ئەولەوییەتی تیۆری و ئەزموونی زانستی سیاسیدا پێگەیەکی باشتر وەدەست بێنن. چونکە ئەم کارە بۆ هەردوو بەشی خوێندنەوەی گەشەسەندن و بەشی زانستی سیاسی بە کەڵك دەبێ.

سەرەڕای ئەوەی کە تا ئێستا ئەدەبیاتی زانستی هەمە لایەن و روون سەبارەت بە سیاسەتەکانی گەشەخوازی بڵاوبووەتەوە، بەڵام لە کردەوەدا بابەتی ((ئەولەوییەتی سیاسەت لە گەشەسەندن)) کەمتر لە خوێندنەوەکان و لێکۆڵینەوەکانی بەڕێوەچوو بایەخی پێدراوە. رەنگە یەکێك لە هۆکارەکانی ئەم پرسە، دەسەڵاتی ئابووریناسان لەم لێکۆڵینەوانەدا بێ.

بە سەرنجدان بەوەی کە لە ساڵەکانی دواییدا باسێکی زۆر لە پێوەندی لەگەڵ رۆڵی هۆکاری سیاسی لە گەشەسەندن هاتووەتە بەرباس، هاوکات دوو لایەنی گشتگیر بەڵام نەگونجاویش بە پێداگرتن لەسەر رۆڵی ئەم هۆکارانە، سەبارەت بە گەشەسەندنی سەری هەڵداوە.

یەکەمین لایەن- کە بە شێوەیەکی بەرچاو دوور لە سیاسەتە- پێوەندی بە قوتابخانەی ((هەڵبژاردنی عەقڵانی))[1] ئابووری نیوکلاسیك هەیە. زۆربەی باسە تیۆرییەکانی ئەم لایەنە بوونیادنەر بەڵام بێ لایەنە، چونکە لە کردەوەدا رۆڵی بەربڵاو و گرینگی سیاسەت لە

(1) Rational-Choice.





گەشەسەندن لەبەرچاو ناگرێ و بایەخی زۆری پێنادا. هەرچەند کە بەکارهێنانی مۆدێلی ((هەڵبژاردنی عەقلانی)) لە شیکردنەوەی ئەوەی کە ((چۆن بەرژەوەندی دژ بە یەك — لە هەوڵدان بۆ دەستڕاگەیشتن بە ئامانجی دیاریکراوی خۆی— دەبێتە هۆی دەستڕاگەیشتن یان پێشگیری لە دەستڕاگەیشتن بە ئامانجەکانی گەشەخوازیی)) یارمەتییەکی کاریگەری کردووە، بەڵام چوارچێوەی لێکدانەوەی ئەم مۆدیلە لە چاو ئاڵۆزیی، رەهەندە جیاوازەکانی ئەم بەرژەوەندییە و دەرەتانی هاوکاریی ئەم بەرژەوەندییانە لەگەڵ یەکتر لە هەلومەرجی جیاواز وەك پرسی گۆڕەپانی تیان ئان مێن[1] و پرسی هاوشێوە، بێ ئاگان.

لە راستیدا تیۆری هەڵبژاردنی عەقلانی بە لەبەرچاو نەگرتنی جۆش و خرۆش و دەمارگرژی لە بەرژەوەندییە جیاوازەکان و بەراوردی ئەوان تەنیا بە پێوانەکانی عەقلانی لە هەڵسەنگاندنیاندا تووشی هەڵە بوون و لە کاتێکدا ئەم بەرژەوەندییانە بە پێچەوانەی پێوانە عەقلانییەکان هەڵسوکەوت دەکەن لەگەڵ سەرلێشێوایی بەرەوڕوو دەبێ.

دووەمین لایەن —کە بەم دواییانە بووەتە سیاسەتی فەرمی زۆربەی وڵاتان— لەسەر پێشکەوتن و تەکنیکی نوێ لە رێگای حکوومەتی باشتر[2]، بەڕێوەبەری کەرتی گشتی[3]، دامەزراندنی بونیادەکان، پەرەپێدانی تواناییەکان و لە هەندێك حاڵەتیشدا دیموکراتیزاسیۆن و باشکردنی رەوشی مافی مرۆڤ و ژینگە تەئکید دەکا. هەرچەند ئەم ئامانجانە، وەك ئامانجێکی لەبارو گونجاو سەیر دەکرێ، بەڵام هەندێك لە لێکۆڵەران بە گومانەوە سەیری دەکەن.

ئەم رەشبینییە ئاکامی کرداری رابردووی دەوڵەتانی رۆژئاوایی سەبارەت بە ئامانجەکانی ئاماژەپێکراوە. چونکە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم، ئەم ئامانجانە بەردەوام کەوتبوونە ژێر کاریگەری ئامانج و ئەولەوییەتی دیکەی سیاسەتی دەرەوەی ئەم وڵاتانە و زۆرتر وەك ئامرازێك بۆ وەدەستهێنانی ئامانجەکانی دیکە کەڵکی لێوەردەگیرا.

روانگەیەکی دیکەش بەرامبەر بە سیاسەت هەیە، کە زۆر کاڵ و کرچ دێتە بەرچاو. ئەو لێکۆڵەرانەی کە بڕوایان بە گوتاری زاڵی گەشەسەندن لە جیهاندا نییە، تەئکید لەسەر خوێندنەویەکی نوێ لە گەشەسەندن و سیاسەت (کە لەگەڵ گوتاری رۆژئاوا تەوەر جیاوازی ببێ) دەکەن.

(1) Tiananmen Squar.
(2) Better Governance.
(3) Public-Sector Management.



ئەوان پێیان وایە گوتاری نوێی گەشەسەندن یان سیاسەتەکانی گەشەخوازی جێگای سەرنجی ئەوان خۆجێی، ناوچەیی، لەسەر بنەمای بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی ریشەدار، دیموکراتیك و راستەوخۆ رەنگدانەوەی ئەولەوییەتەکان و پێویستییەکانی بەشداربوان دەبێ.

دیارە دەبێ ئاماژە بەم خاڵە بکەین کە زۆربەی لێکۆڵەران پێیان وایە کە ((سیاسەت لەسەر بنەمای کرداری بە کۆمەڵ بۆ دەستڕاگەیشتن بە گەشەسەندن))[1] دەتوانین وەك سیاسەتێکی جیاواز، نوێ یان سیاسەتی دیموکراتیك لە جۆرێکی دیکە کە بەشداریخوازانە[2]، ئینسانی[3]، یەکسانیخوازانە[4] و لاینگری ژینگە بێ، چاو لێبکەین. (Esteva, 1987).

بەڵام بەڕای من، ئەم روانگەیەش تەنیا گومانێکی سەرنجڕاکێشە، چونکە ئەگەر گریمانەی سەرەتایی من سەبارەت بە سیاسەت و ماناکەی دروست بێ (بڕواننە فەسڵی یەکەم)، لەو کاتەدا سیاسەتەکانی گەشەخوازی، خۆتەوەر[5]، خۆجێیی و لەسەر بنەمای فەرهەنگی تایبەتی —هیچ کات— لە بەرامبەر رەوتەکانی جیهانی سیاسەتدا پارێزراو نابێ.

تەواوی لێکۆڵینەوەکانی بەڕێوەچوو سەبارەت بە گرووپەکان و کۆمەڵگای خۆتەوەر لەسەر ئەم خاڵە پێدادەگرن کە سەرەڕای باوەڕپێکراوی و دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی ئەم گرووپانە، ئەوان بە ئاسانی تووشی ناکۆکی، بێ بڕوایی و هەرەسهێنان لەنێو خۆوە دەبن. تەنانەت ئەگەر بەم جۆرەش رەشبینانە سەیری چارەنووسی ئەم گرووپانە نەکەین، بە تێپەڕبوونی زەمان و زیادبوونی ئاڵۆزی و کێشەکان، ئەم گرووپانە ناچار دەبن خۆیان لەگەڵ بابەتە جیهانییەکانی سیاسەتدا بگونجێنن.

هەروەك لە فەسڵی یەکەمدا ئاماژەم پێکرد، سیاسەت لە هەموو شوێنێکدا چەمکێکی سەبارەت بە جیاوازییەکان، ناکۆکییەکان، بەرژەوەندیی، دەسەڵات و چاودێری. کەوابوو ناتوانین سیاسەت لە ناوەڕۆك و تایبەتمەندییەکانی بە تاڵ بکەین و جارێکی دیکە پێی بلێین سیاسەت. راستییەکەی ئەمەیە، لە هەر شوێنێك خەڵك ژیان دەکا، جیاوازی بیروبۆچوون، بەرژەوەندی و لایەنەکان لە پێوەندی لەگەڵ ئەوەی چۆن و بە هۆی چ کەسێك سەرچاوەکان کەڵکی لێوەربگیرێ، هەیە و ئەم جیاوازییانە لە کۆتاییدا خۆی بە شێوازی پێکهاتە جیاوازەکانی نایەکسانی دەرەتانەکان دەردەخا. بابەتی سیاسەت —لە تەواوی کۆمەڵگاکاندا— پێوەندی نێوان خەڵك، سەرچاوەکان و دەسەڵاتە و ئەمە پێوەندییەکە بە شێوەی تایبەت،

(1) Politics of Community Action for Development.
(2) Participatory.
(3) Humane.
(4) Egalitarian.
(5) Self-Organizating.





ڕەوتی گەشەسەندنیان ئاوێتە بە سیاسەت کردووە. ئەوەی زۆر گرینگە، تێگەیشتنی ئەم بابەتەیە کە چۆن بەرژوەندییەکان، بیرۆکەکان و لایەنە جیاوازەکان ڕێك دەکەون و لە کاتی ڕێکنەکەوتنی ئەوان چ ڕوودواوێك ڕوودەدا.

ئەم باسانە، جارێکی دیکە لەسەر پێگەی ناوەندی دەوڵەت[1] لە کۆمەڵگا و ڕۆڵی لە گەشەسەندن و بەتایبەت لەسەر ڕۆڵی دەوڵەتانی گەشەخواز تەئکید دەکا.

چونکە، سەرەڕای سەرنجڕاکێش بوونی لایەنە ناوچەییەکان و سەرەڕای لاوازی سەربەخۆیی و دەسەڵاتی دەوڵەت بە هۆی بەجیهانی بوونەوە[2]، دەوڵەت —بەبێ لەبەرچاو گرتنی دیموکراتیك یان نادیموکراتیك بوونی— هەروا هۆرکارێکی گرینگ و دیاریکەرە لە سیاسەتی گەشەسەندندا. (Weiss, 1998).

بەم جۆرە چیدیکە ناتوانین ڕۆڵی دەوڵەت لەبەرچاو نەگرین. دیارە هەروەك لە فەسڵەکانی پێشوودا ئاماژەم پێکرد، تایبەتمەندیی و هەڵسوکەوتی دەوڵەت هەمە چەشنە کە دەگەڕێتەوە بۆ سیاسەتە نێونەتەوەیی، ناوچەیی و نەتەوەییەکانی ئەوان. کەوابوو بە سەرنجدان بە ڕۆڵی سەرەکی دەوڵەت لە کۆمەڵگا، تێگەیشتنی دروستی لە تواناییەکانی گەشەخوازی ئەو تەنیا بە خوێندنەوەی دروست و ڕاستەقینەی کۆڵەکە سیاسییەکانی دەوڵەت ئیمکانی هەیە.

پێموایە کە ئەم پرسە خاڵی دەستپێکی پرسەکانی گەشەخوازی لە سەدەی نوێدا دەبێ، چونکە —ماوەیەکی زۆر— خوێندنەوەی گەشەسەندن بەبێ بایەخدان بە ڕۆڵی سیاسەت لە گەشەسەندن بەڕێوەچووە و ئێستا کاتی ئەوە هاتووە هەتا جارێکی دیکە ((سیاسەت)) ببێتە تەوەری سەرەکی خوێندنەوەکانی گەشەسەندن.

تێگەیشتنی گرینگی ڕۆڵی سیاسەت لە گەشەسەندن، یەکێك لە ئەولەوییەتەکانی گەشەخوازیی لە سەدەی نوێیە و پێموایە بەبێ دەستڕاگەیشتن بەم تێگەیشتنە، دوورە دیمەنی کەمکردنەوەی ٥٠ لە سەدی هەژاری لە جیهان تا ساڵی ٢٠١٥، تەنیا ئامانجێکی ئارمانخوازانە دەبێ.

دیارە، دەستڕاگەیشتن بەم تێگەیشتنە و گەڕاندنەوەی سیاسەت بۆ بواری گەشەسەندن، ڕەوتێکی خۆجێیی و نێوخۆیی لە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکانە، مەگەر ئەوەی کە دەوڵەتێکی کۆلۆنیالیستی —وەك هەڵسوکەوتی ژاپۆن لە کۆریا و تایوان— بە پێکهێنانی گۆڕانکاریی بنەڕەتی لە پێکهاتەکانی کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسی لە کۆمەڵگایەکدا ببێتە هۆی ئەم گۆڕانکارییانە.

(1) Centrality of State.
(2) Globalization.






## کتابنامه:


Abrahamsen, R. (1996) 'Economic liberalization, civil society and democratization', in M. H. Hansen and A. E. Rund (eds) *Weak? Strong? Embedded? New Perspective on State-Society Relations in the Non-Western World* (Oslo, Centre for Development and the Environment), pp. 15-26.

Adelman, I. and Morris, C. (1967) *Society, Politics and Economic Development* (Baltimore, MD, Johns Hopkins University Press).

Adler, G. and Webster, E. (1995) 'Challenging transition theory: the labour movement, radical reform and transition to democracy in South Africa', *Politics and Society* 23(1), pp. 75-106.

Ahmad, Z. A. (1989) 'Malaysia: quasi democracy in a divided society', in L. Diamond et al. (eds) *Democracy in Developing Countries, vol. 3, Asia* (Boulder, CO, Lynne Rienner), pp. 347-82.

Akamatsu, P. (1972) *Meiji 1868* (London, George Allen & Unwin).

Ake, C. (1991) 'Rethinking African democracy', *Journal of Democracy* 2(1), pp. 32-44.

Alavi, H. (1972) 'The state in post-colonial societies: Pakistan and Bangladesh', *New Left Review* 74, pp. 59-81.

Albrow, M. (1970) *Bureaucracy* (London, Macmillan).

Alford, R. R. and Friedland, R. (1985) *Powers of Theory: Capitalism, the State and Democracy* (Cambridge, Cambridge University Press).

Allen, G. C. (1981) A *Short Economic History of Modern Japan* (Basingstoke, Macmillan).

Almond, G. A. (1960) 'Introduction: a functional approach to comparative] tics', in G. A. Almond and J. Coleman (eds) *The Politics of the Developing Areas* (Princeton, NJ, Princeton University Press), pp. 3-64.

Almond, G. A. and Powell, G. B. Jr (eds) (1996) *Comparative Politics Today,* 6th edn (New York, Harper Collins).







Amin, S. (1976) *Unequal Development* (New York, Monthly Review Press).

Amsden, A. (1985) 'The state and Taiwan's economic development', in P. B. Evans et al. (eds) *Bringing the State Back In* (Cambridge, Cambridge University Press), pp. 78-106.

Apter, D. (1965) *The Politics of Modernization* (Chicago, IL, University of Chicago Press).

Apter, D. (1980) 'The passing of development studies: over the shoulder with a backward glance', *Government and Opposition* 15 (3/4), pp. 263-75.

Arndt, H. W. (1978) *The Rise and Fall of Economic Growth* (Chicago, IL, University of Chicago Press).

Arndt, H. W. (1987) *Economic Development: The History of an Idea* (Chicago, IL, University of Chicago Press).

Avineri, S. (1969) *The Social and Political Thought of Karl Marx* (Cambridge, Cambridge University Press).

Axford, B., Browning, G. K., Huggins, R., Rosamond, B. and Turner, J. (1997) *Politics: An Introduction* (London, Routledge).

Bagchi, A. K. (1982) *The Political Economy of Underdevelopment* (Cambridge, Cambridge University Press).

Baran, P. A. (1957) *The Political Economy of Growth* (New York, Monthly Review Press).

Bardhan, P. (1984) *The Political Economy of Development in India* (Oxford, Basil Blackwell).

Barrett, R. E and Whyte, K. M. (1982) 'Dependency theory and Taiwan: analysis of a deviant case', *American Journal of Sociology* 87(5), pp. 1064-89.

Barya, J.-J. B. (1993) 'The new political conditionalities: an independent view from Africa', *IDS Bulletin* 24(1), pp. 16-23.

Bates, R. H. (1981) *Markets and States in Tropical Africa* (Berkeley, CA, University of California Press).

Bates, R. H. (1983) *Essays on the Political Economy of Rural Africa* (Cambridge, Cambridge University Press).

Bauer, P. T (1981) *Equality, The Third World and Economic Delusion* (London, Methuen).

Bayart, J.-F. (1993) *The State in Africa: The Politics of the Belly* (Harlow, Longman).

Beckford, G. L. (1972) *Persistent Poverty* (New York, Oxford University Press).

Beetham, D. (1974) *Max Weber and the Theory of Modern Politics* (London, George Allen and Unwin).

Bell, C. L. G (1974) 'The political framework', in H. Chenery et al. *Redistribution With Growth* (London, Oxford University Press), pp. 52-72.

Bello, W. and Rosenfeld, S. (1992) *Dragons in Distress: Asia's Miracle Economies in Crisis* (Harmondsworth, Penguin).

Bellows, T. (1970) *The People's Action Party: The Emergence of a Dominant Party System,* Southeast Asia Studies Monograph 14 (New Haven, CT, Yale University Press).

Ben-Ami, S. (1983) *Fascism from Above: The Dictatorship of Primo de Rivera in Spain, 1923-1930* (Oxford, Clarendon Press).

Berman, B. (1984) 'Structure and process in the bureaucratic states of colonial Africa', *Development and Change* 15, pp. 161-202.

Bernstein, H. (1971) 'Modernization and the sociological study of development', *Journal of Development Studies* 7(2), pp. 141-60.

Bessel, R. (1997) 'The crisis of modern democracy', in D. Potter et al. (eds) *Democratization* (Cambridge, Polity), pp. 71-94.

Bhagwati, J. (1966) *The Economics of Underdeveloped Countries* (London, Weidenfeld and Nicolson).

Birnie, P. (1993) 'The UN and the environment', in A. Roberts and B. Kingsbury (eds) *United Nations, Divided World* (Oxford, Clarendon Press), pp. 327-83.

Blundell, S. (1986) *Greek and Roman Thought* (London, Croom Helm).

Bock, K. (1979) 'Theories of progress, development, evolution', in T. B. Bottomore and R. Nisbett (eds) *A History of Sociological Analysis* (London, Heinemann), pp. 39-80.

Boone, C. (1994) 'States and ruling classes in Africa', in J. S. Migdal, A. Kohli and V. Shue (eds) *State Power and Social Forces* (Cambridge, Cambridge University Press), pp. 108-12.

Booth, J. A. (1989) 'Costa Rica: the roots of democratic stability', in L. Diamond et al. (eds) *Democracy in Developing Countries, vol. 4, Latin America* (Boulder, CO, Lynne Rienner), pp. 387-22.

Bottomore, T. B., Harris, L., Kiernan, V. G. and Miliband, R. (eds) (1983) *A Dictionary of Marxist Thought* (Oxford, Basil Blackwell).

Bowie, A. (1991) *Crossing the Industrial Divide* (New York, Columbia University Press).

Bowman, L. (1991) *Mauritius: Democracy and Development in the Indian Ocean* (London, Dartmouth).

Bradley, C. P. (1965) 'Leftist fissures in Singapore politics', *Western Political Quarterly* 18(2), pp. 292-308.

Bratton, M. and van de Walle, N. (1997) *Democratic Experiments in Africa* (Cambridge, Cambridge University Press).

Brewer, A. (1980) *Marxist Theories of Imperialism: A Critical Survey* (London, Routledge and Kegan Paul).





Bromley, S. (1997) 'Middle East exceptionalism: myth or reality?', in D. Potter et al. (eds) *Democratization* (Cambridge, Polity), pp. 321-44.

Bryant, R. L. and Bailey, S. (1997) *Third World Political Ecology* (London, Routledge).

Burmeister, L. L. (1986) 'Warfare, welfare and state autonomy: structural roots of the South Korean developmental state', *Pacific Focus* 1(2), pp. 121-46.

Bury, J. B. (1932) *The Idea of Progress* (New York, Dover).

Callaghy, T. M. (1984) *The State-Society Struggle: Zaire in Comparative Perspective* (New York, Columbia University Press).

Callaghy, T. M. (1987a) 'Absolutism, Bonapartism, and the formation of ruling classes: Zaire in comparative perspective', in I. L. Markovitz (ed.) *Studies in Power and Class in Africa* (Oxford, Oxford University Press), pp. 95-117.

Callaghy, T. M (1987b) 'The state as lame Leviathan: the patrimonial administrative state in Africa', in Z. Ergas (ed.) *The African State in Transition* (New York, St Martin's Press), pp. 87-116.

Callaghy, T. M. (1988) 'The state and the development of capitalism in Africa: theoretical, historical and comparative reflections', in D. Rothchild and N. Chazan (eds) *The Precarious Balance: State and Society in Africa* (London, Westview), pp. 67-99.

Callaghy, T. M (1989) 'Towards state capacity and embedded liberalism in the third world: lessons for adjustment', in J. Nelson (ed.) *Fragile Coalitions: The Politics of Economic Adjustment* (New Brunswick, NJ, Transaction Books), pp. 115-38.

Callaghy, T. M. (1990) 'Lost between state and market: the politics of economic adjustment in Ghana, Zambia and Nigeria', in J. Nelson (ed.) *Economic Crisis and Policy Choice* (Princeton, NJ, Princeton University Press), pp. 257-320.

Cammack, P. (1991) 'Democracy and development in Latin America', *Journal of International Development* 3(5), pp. 537-50.

Cammack, P. (1997) 'Democracy and dictatorship in Latin America, 1930-1980', in D. Potter et al. (eds) *Democratization* (Cambridge, Polity), pp. 152-73.

Cammack, P., Pool, D. and Tordoff, W. (1993) *Third World Politics* (Basingstoke, Macmillan).

Cardoso, F. H. and Faletto, E. (1979) *Dependency and Development in Latin America* (Berkeley, CA, University of California Press).

Carroll, T. (1994) 'Owners, immigrants and ethnic conflict in Fiji and Mauritius', *Ethnic and Racial Studies* 17(2), 301-24.

Carson, R. (1962) *Silent Spring* (Harmondsworth, Penguin).

Castells, M. (1992) 'Four Asian tigers with a dragon's head', in R. P. Appelbaum and J. Henderson (eds) *States and Development in the Asian Pacific Rim* (Newbury Park, CA, Sage), pp. 33-70.

Chabal, P. and Daloz, J.-F. (1999) *Africa Works: Disorder as Political Instrument* (Oxford, James Curry).

Chalker, L. (1991a) *Good Government and the Aid Programme* (London, Overseas Development Administration).

Chalker, L. (1991b) 'Practical ways to promote good government', *Conservative Party News* 25 March (London, News Department, Conservative Central Office).

Chamberlain, M. E. (1999) *The Scramble for Africa* (London, Longman).

Chan, Heng Chee (1978) *The Dynamics of One-Party Dominance: The PAP at the Grass Roots* (Singapore, Singapore University Press).

Chang, H.-J., Park, H.-J. and Yoo, C. G. (1998) 'Interpreting the Korean crisis: financial liberalisation, industrial policy and corporate governance', *Cambridge Journal of Economics* 22, pp. 735-6.

Charlton, R. (1991) 'Bureaucrats and politicians in Botswana's policy-making process: a re-interpretation', *Journal of Commonwealth and Comparative Politics* 29(3), pp. 265-82.

Chazan, N., Mortimer, R., Ravenhill, J. and Rothchild, D. (1992) *Politics and Society in Contemporary Africa* (Boulder, CO, Lynne Rienner).

Chenery, H., Ahluwalia, M. S. and Bell, C. G. (1974) *Redistribution with Growth* (London, Oxford University Press).

Chester, N. (1975) 'Political studies in Britain: recollections and comments', *Political Studies,* 23(2/3), pp. 151-64.

Clapham, C. (1985) *Third World Politics: An Introduction* (London, Croom Helm).

Coes, D. V. (1995) *Macroeconomic Crises, Policies, and Growth in Brazil 1964-1990* (Washington, DC, The World Bank).

Cohen, H. J. (1991) 'Democratization in Africa', *US Department of State Dispatch* 28 October, pp. 795-6.

Colclough, C. (1993) 'Structuralism vs neo-liberalism', in C. Colclough and J. Manor (eds) *States or Markets? Neo-liberalism and the Development Policy Debate* (Oxford, Clarendon Press), pp. 1-25.

Cole, K. (1998) *Cuba: From Revolution to Development* (London, Pinter).

Commission of the European Communities (1991) *Human Rights, Democracy and Development Cooperation Policy,* Commission Communication to the Council and Parliament, SEC (91) 61 final, 25 March (Brussels, CEC).

Commoner, B. (1971) *The Closing Circle* (New York, Knopf)-

Cooper, F. (1981) 'Africa and the world economy', *The African Studies Review* 24(2/3), pp. 1-86.

Coppedge, M. (1992) 'Venezuela's vulnerable democracy', *Journal of Democracy* 3(4), pp. 32-44.





Corbridge, S. and Harriss, J. (2000) *Reinventing India: Liberalization, Hindu Nationalism and Popular Democracy* (Cambridge, Polity).

Cornia, G. A., Jolly, R. and Stewart, F. (eds) (1987) *Adjustment With Human Face,* vol. I (Oxford, Clarendon Press).

Cotton, J. (1989) 'From authoritarianism to democracy in South Korea', *Political Studies* 37, pp. 244-59.

Council for Economic Planning and Development (1992) *Taiwan Statistical Data Book* (Taipei, Republic of China).

Cowen, M. P. and Shenton, R. W. (1996) *Doctrines of Development* (London, Routledge).

Craske, N. (1999) *Women and Politics in Latin America* (Cambridge, Polity).

Crawford, G. (1997) 'Foreign aid and political conditionality: issues of effectiveness and consistency', *Democratization* 4(3), pp. 69-108.

Crisp, B. (1994) 'Limitations to democracy in developing capitalist societies: the case of Venezuela', *World Development* 22(10), pp. 1491-1509.

Crouch, H. (1984) *Domestic Political Structures and Regional Cooperation* (Singapore, Institute of Southeast Asian Studies).

Crush, J. (1995) 'Imagining development', in J. Crush (ed.) *Power of Development* (London, Routledge), pp. 1-23.

Cutright, P. (1963) 'National political development: measurement and analysis', *American Political Science Review* 28, pp. 253-64.

Dadzie, K. (1993) 'The UN and the problem of economic development', in A. Roberts and B. Kingsbury (eds) *United Nations, Divided World* (Oxford, Clarendon Press), pp. 297-326.

Dag Hammarskjold Foundation (1975) *What Now? The Dag Hammarskjöld Report on Development and International Cooperation Prepared on the Occasion of the Seventh Special Session of the UN General Assembly* (Uppsala, Sweden, Dag Hammarskjöld Foundation).

Dahl, R. A. (1971) *Polyarchy* (New Haven, CT, Yale University Press).

Dahl, R. A. (1985) *A Preface to Economic Democracy* (Cambridge, Polity).

Dashwood, H. S. (1996) 'The relevance of class to the evolution of Zimbabwe's development strategy, 1980-1991', *Journal of Southern African Studies* 22(1), pp. 27-48.

Dearlove, J. and Saunders, P. (2000) *British Politics,* 3rd edn (Cambridge, Polity).

Demery, L. and Addison, A. (1987) *The Alleviation of Poverty under Structural Adjustment* (Washington, DC, The World Bank).

Derbyshire, D. and I. (1996) *Political Systems of the World* (Edinburgh, Chambers).





Deutscher, I. (1966) *Stalin: A Political Biography* (Harmondsworth, Penguin).

de Waal, J. (1982) *Chimpanzee Politics* (London, Cape).

Deyo, F. C. (ed.) (1987) *The Political Economy of the New Asian Industrialism* (Ithaca, NY, Cornell University Press).

DfID (Department for International Development) (1997) *Eliminating World Poverty: A Challenge for the 21st Century,* White Paper on International Development, Cm 3789 (London, The Stationery Office).

DfID (Department for International Development) (1999) *Statistics on International Development* (London, Government Statistical Service).

Diamond, L. (1987) 'Class formation in the swollen African state', *Journal of Modern African Studies* 25(4), pp. 567-96.

Diamond, L. (1992) 'Economic development and democracy reconsidered', *American Behavioral Scientist* 35(4/5), pp. 450-99.

Diamond, L. (1999) *Developing Democracy: Toward Consolidation* (Baltimore, MD, Johns Hopkins University Press).

Diamond, L., Linz, J. J. and Lipset, S. M. (1989) 'Preface', in L. Diamond, J. J. Linz. and S. M. Lipset (eds) *Democracy in Developing Countries, vol. 4, Latin America* (Boulder, CO, Lynne Rienner), pp. ix-xxvi.

Dodds, E. R. (1973) *The Ancient Concept of Progress* (Oxford, Clarendon Press).

Dominguez, J. I. (1987) 'Political change: Central America, South America and the Caribbean', in M. Weiner and S. P. Huntington (eds) *Understanding Political Change* (Boston, MA, Little Brown), pp. 65-99.

Doornbos, M. (1990) 'The African state in academic debate: retrospect and prospect', *Journal of Modern African Studies* 28(2), pp. 179-98.

Dos Santos, T. (1973) 'The crisis of development theory and the problem of dependence in Latin America', in H. Bernstein (ed.) *Underdevelopment and Development* (Harmondsworth, Penguin), pp. 57-80.

Doyle, W. M. (1983) 'Kant, liberal legacies and foreign affairs: part I', *Philosophy and Public Affairs* 12, pp. 213-35.

Duckett, J. (1998) *The Enterprise State in China* (London, Routledge).

Dunleavy, P. and Hood, C. (1994) 'From public administration to new public management', *Public Money and Management,* July/September, pp. 9-16.

Dunleavy, P. and O'Leary, B. (1987) *Theories of the State* (Basingstoke, Macmillan).

Durkheim, E. (1893/1964) *The Division of Labour in Society* (New York, The Free Press).

EBRD (European Bank for Reconstruction and Development) (1991) *Agreement Establishing The European Bank For Reconstruction and Development* (London, EBRD).







Edie, C. J. (1991) *Democracy by Default: Dependency and Clientelism in Jamaica* (London, Lynne Rienner).

Eisenstadt, S. N. (1966) *Modernization, Protest and Change* (Englewood Cliffs, NJ, Prentice Hall).

Ekeh, P. (1975) 'Colonialism and the two publics', *Comparative Studies in Society and History* 17(1), pp. 91-112.

Ellner, S. (1997) 'Recent Venezuelan political studies', *Latin American Research Review* 32(2), pp. 201-18.

Elster, J. (1985) *Making Sense of Marx* (Cambridge, Cambridge University Press).

Engels, F. (1976) *Anti-Duhring* (Peking, Foreign Languages Press).

Ergas, Z. (ed.) (1987) *The African State in Transition* (Basingstoke, Macmillan).

Escobar, A. (1984) 'Discourse and power in development: Michel Foucault and the relevance of his work to the third world', *Alternatives* 10(3), pp. 377-100.

Escobar, A. (1992) 'Reflections on "development": grassroots approaches and alternative politics in the Third World', *Futures* 24(5), pp. 411-36.

Escobar, A. (1995a) *Encountering Development: The Making and Unmaking of the Third World* (Princeton, NJ, Princeton University Press).

Escobar, A. (1995b) 'Imagining a post-development era', in J. Crush (ed.) *Power of Development* (London, Routledge), pp. 211-27.

Esteva, G. (1987) 'Regenerating people's space', *Alternatives* 12(1), pp. 125-52.

Esteva, G. (1992) 'Development', in W. Sachs (ed.) *The Development Dictionary* (London, Zed), pp. 6-25.

Evans, P. B. (1985) 'Transnational linkages and the economic role of the state: an analysis of developing and industrialized nations in the post-World War II period', in P. B. Evans et al. (eds) *Bringing the State Back In* (Cambridge, Cambridge University Press), pp. 192-226.

Evans, P. B. (1986) 'State, capital and the transformation of dependence: the Brazilian computer case', *World Development* 14(7), pp. 791-808.

Evans, P. B. (1987) 'Class, state and dependency in East Asia: lessons for Latin Americanists', in F. C. Deyo (ed.) *The Political Economy of the New Asian Industrialism* (Ithaca, NY, Cornell University Press), pp. 203-26.

Evans, P. B. (1989) 'Predatory, developmental and other apparatuses: a comparative political economy perspective on the third world state', *Sociological Forum* 4 (4), pp. 561-87.

Evans P. B. (1992) "The state as problem and solution: predation, embedded autonomy, and structural change', in S. Haggard and R. R. Kaufman (eds) *The Politics of Economic Adjustment* (Princeton, NJ, Princeton University Press), pp. 139-81.






